پڕۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی
٦٩

# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕوداوەکانی پێش هاتنی

نوسینی
هاوڕێ محمد ئەمین

# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

# و

# ڕووداوەکانی پێش هاتنی

نوسینی

هاوڕێ محمد أمین فرج

سالّی

١٤٢٥ ك ــــــــــــــــــــــــــــ ٢٠٠٥ ز .

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده و نستعينه نستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات أعمالنا، منيهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله. ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾[1]. ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾[2]، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾[3].

بەدڵنیایی‌و بەبێ هیچ گومانێك دەڵێین ڕاسترین قسەو گوفتار فەرمودەی خوایە، وە باشترین ڕەوت‌و ڕێباز هەڵگرتنی شوێن پێی (محمد)ە صەلات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت وەخراپترین کاریش کاری داهێنراوو هەڵبەستراوە لە ئایندا، وە هەموو تازە داهێنراوێکیش لە ئایندا بیدعەیە، وەهەموو بیدعەیەکیش سەرلێشێواوی‌و گومڕایی یە وە هەموو گومڕایی یەکیش بۆ ئاگرە.

خوای کاربەجێ لەقورئانی پیرۆزدا بەڵێن‌و پەیمانی خوایانەی داوە بە بەندەکانی خۆی، کەهاتنی ڕۆژی قیامەت ڕاستی‌و واقعێکی حاشاهەڵنەگرەو والە پێشمانەو هەردەبێ ئەو ڕۆژە بێتە دی، وە لەوەش زیاتر دڵنیامان دەکاتەوە کە ئەم ئومەتی ئیسلامە کۆتای ئومەتانەو بەدوایدا ئومەتیتر دروست نابێت‌و ئاینی نوێش نایەت، بۆیە هاتن‌و ڕوودانی ئەو ڕۆژە گەورەو چاوەڕوان کراوە هەر دەبێت لەسەر دەمی ئەم ئومەتەدا بێت‌و لێ ی تێپەڕناکات، هەربۆیەش لەقورئانی پیرۆزدا ڕوودانی ئەوڕۆژە هێندە نزیك دەکاتەوە کە بەشێوەی ڕابردوو باسی لێوە دەکات، هەروەك هەستابێت‌و ڕووی دابێت، دەفەرموێت: ﴿ أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ ﴾[4]، واتە: (فەرمانی خوا دەرچوو بەهەستانی ئەو ڕۆژە ئیتر ئێوەش پەلەی لێ مەکەن).

وە لە سورەتی (القمر)دا دەفەرموێت: ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴾[5] واتە: (قیامەت نزیك بووەوە مانگیش بوو بە دوو کەرتەوە) کەواتە خوای بالآدەست‌و کاربەجێ موعجیزەی کەرت

---

[1] آل عمران (١٠٢).

[2] النساء (١).

[3] الأحزاب (٧٠-٧١).

[4] النحل (١).

[5] القمر (١).

بوونی مانگی لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کردووە بەهاوکات نزیك بوونەوەی هاتن و ڕوودانی ئەورۆژە.

جائەگەر خەلکانێك هەر لەدێرزەمانەوە ئەورۆژەیان بەدوور گرتبێت و بەدووریان زانیبێت، ئەوا خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا ۞ وَنَرَاهُ قَرِيبًا﴾[1]، واتە (ئەوان ئەورۆژە زۆر بە دوور دەبینن، ئێمەش زۆر بە نزیك دەیبینین).

وە هەر لەبەر نزیکی ئەورۆژە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(بُعِثْتُ أنا والساعة كهتين) وضم السبابة الوسطى[2] واتە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: هەردوو پەنجەی ناوەڕاست و شایەتومانی پێکەوە جووت دەکرد و دەیفەرموو(من و قیامەت ئاوا پێکەوە نێردراوین).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا کە(قەیسی کوڕی حازم) لە (ابوجوبەیر)ەوە ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە دەلێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی (بُعِثتَ في نسمِ الساعَةِ)[3] واتە (من لەگەڵ شنەبای بەرەبەیانی قیامەتدا نێردراوم).

جا کە (محمد) صەلات و سەلامی خوای لەسەربێت کۆتایی پێغەمبەران بێت و بەدوایدا پێغەمبەری تر نەیەت وە ئومەتەکەی نزیکترین ئومەتەکان بن لەهەستان و ڕوودانی ئەو ڕۆژەوە، بۆیە خوای گەورە ئەم ئومەتەی تایبەتمەند کردووە بەوەی کەنیشانەکانی نزیکبوونەوەو هەستانی ئەورۆژە گەورەیە لەم ئومەتەدا دەربکەوێت، وە لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) سەرجەمی ئەو نیشانانە بەڕوونی و ئاشکرایی بۆ مسلمانان بەیان کراون و باسیان لێوەکراوە.

باسکردنی نیشانەکان و ئاشکراکردنی ڕوداوە گرنگەکانی پێش هاتنی ئەو ڕۆژەش لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەو شێوە چڕوپڕە خۆی بۆ خۆی چەند هۆکارێکی گرنگی هەیەو چەند حیکمەتێکی گەورەش لەخۆ دەگرێت کە گرنگترینیان ئەمانەن:

یەکەم/ هەوڵدانی پێش وەخت بە قەومانی ئەو ڕوداوانەو سەرهەڵدانی ئەو نیشانانە لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ)، پاشانیش هاتنەدییان یەك بەدوای یەکدا هەتا ڕۆژی قیامەت، خۆی بۆ خۆی دەبێتە موعجیزەیەکی بەردەوامی پێغەمبەر(ﷺ) وە دەبێتە بەڵگەیەکی بەرجەستە کە هەتا کۆتایی دنیاو لەگەڵ هاتنەدی هەریەك لەو نیشانانە گەواهیەکی نوێ دەبێت کە ڕاستی پێغەمبەرایەتی (محمد)(ﷺ) دەسلمێنن.

---

[1] المعارج (٦-٧).

[2] صحيح مسلم (٨٩/١٨-٩٠ مع شرح النووي) عن أنس بن مالك ﷺ.

[3] صحيح جامع الصغير (٨/٣) رقم (٢٨٢٩) وسلسة الأحاديث الصحيحة (٤٦٨/٢) رقم (٨٠٨).

دووەم/ ڕوداوو هاتنەدی هەریەك لەو نیشانانە لە هەر شوێنو سەردەمێکدا بیچت دەبێتە زەنگێکی وریاکەرەوە بۆ خەلکی ئەو کاتە کە بێداریان بکاتەوەو وەبیریان بهێنێتەوە کە هاتنی ئەوڕۆژە ڕاستەو گومانی تێدانی یەو وە مرۆڤایەتی هەنگاوێکی ترلە ڕودانی ئەو ڕۆژەوە نزیك بوەتەوە، تا سەرلەنوێ چاوێك بەکاروکردەوەی خۆیاندا بخشێننەوەو بگەڕێنەوە بۆلای خواو خۆیان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادەبکەن پێش ئەوەی کارلەکار بترازێتێ ڕێی گەڕانەوە بگیرێت، هەوەرك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾[1] واتە: (تا دواتر هیچ کەسێك نەڵێت، ئای خەمو دەست خرۆیی خۆم بۆ ئەو هەموو زیادەڕۆی یە لەئاستی خودا کردمو لەو کەسانەبووم کە گاڵتەو پێ کەنینم پێ دەهات، یان بڵێت ئەگەر خوای گەورە منی هیدایەت بدایە ئێستا منیش لەڕیزی لەخواترسەکاندا دەبووم، یان کاتێك کە ئازاری سەختی دۆزەخ دەبینێت ئەگەر یەکجاری تر مۆڵەتم بدەنێ و بمگەڕێننەوە، ئەمجارەیان لەگەڵ چاکەخوازاندا دەبم).

سێیەم/ لەبەر ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام صەلاتو سەلامی لەسەربێت بەدوایدا هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت کە ڕێنومایی خەلکی بکاتو چارەسەری کێشەکانیان بکات، وەلەبەر ئەوە کەئاینی ئیسلام ئاینێکی گشت گیری جیهان گیرە هەتا ڕۆژی قیامەت، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری پێشەوا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت هەرچۆن هاوەڵانو موسڵمانانی سەردەمی خۆی بەرچاو ڕۆشن کردوەو چارەسەری کێشەو گرفتەکانیانی بۆدەست نیشان کردون، بەهەمان شێوە کاتێك کە باس لەو نیشانەو کارەساتو ڕوداوانە دەکات لەدوای خۆی بەسەر ئومەتەکەیو مرۆڤایەتیدا دێت، تەنها بەوەوە ناوەستێت کە باس لە ڕودانیان بکات، بەڵکو ڕێگەی دەربازبوونو چارەسەریشی بۆ یەك بەیەکەی ئەو گرفتو نەهامەتیانە دەست نیشان کردوەو بەرچاوڕۆشنی کردون بۆچۆنیەتی ڕزگاربون لەو نیشانانەی کە لەدوای خۆی بەرۆك بە ئومەتەکەی دەگرن.

بۆ نموونە کاتێك باس لەکوشتاری نێوخۆی موسڵمانان دەکات یان باس لە فیتنەی دەجال و یاجوجو ماجوجو فیتنەکانی تر دەکات، لەگەڵ هەموویاندا چارەسەری ئیسلامیانەشی بۆ کێشەکان دارشتوەو ڕێنومایی ئومەتەکەشی بۆ ڕێگەی دەرازبوون لەو فیتنانە کردووە.

---

[1] الزمر (٥٦-٥٨).

بەمەش خوای گەورە جارێکی تر بۆ مرۆڤایەتی دەسەلمێنێت کە ئیسلام ئاینێکی تەواوەو بۆهەمووشوێن و چاخو سەردەمێکەو چارەسەری هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتی پێیەو (محمد)یش(ﷺ) چۆن لەسەردەمی خۆیدا پێغەمبەرو پێشەواو مامۆستا بووە، هەتا هاتنی قیامەتیش هەروا دەبێت. ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾[1]، واتە: (ئەمرۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواوکردنو نیعمەتو رۆزی خۆم بەتەواوی رشت بەسەرتانداو وە رەزامەندیم لەسەر ئەوەی کە ئیسلام ئاینی هەتا هەتایتان بێت).

هەروەها ئەوەی کە بە پێویستی دەزانم لەم پێشەکیەدا تیشکی بخەمە سەر رونکردنەوەی چەند گرفتو ئیشکالیەتێکە کەلە بۆچونو تێگەیشتنی هەندێك خەلکدا هەیە بۆ نیشانەکانی قیامەت. گرنگترین ئەو گرفتانەش:

یەکەم/ هەندێك کەس بۆچونی وایە کە خۆ خەریك کردنو گرنگی دان بە زانینی نیشانەکانی قیامەت هیچ سودێکی بۆ واقعی رۆژانەمان نی یەو تەنها خۆ خەریك کردنو کات بەفیرۆدانە ئێمەش لەوەلامدا دەلێین ئەگەر وابوایە هەلبەت پێغەمبەر(ﷺ) دەیانو سەدان لە فەرمودە پیرۆزەکانی خۆی تەرخان نەدەکرد بۆ رونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەو زانایانو گێرەرەوانی فەرمودەکانیش ئەوپانتایی یە زۆرەیان لەکتێبەکانی فەرمودەدا تەرخان نەدەکرد بۆ ئەو فەرمودانەی کە باس لەونیشانانە دەکات، کە بە دەگمەن کتێبێکی فەرمودە هەبێت بەشێکی تایبەتی جیا نەکردبێتەوە لەژێرناوی (الفتن والملاحم) یان (اشراط الساعة)دا کە تایبەت باس لە نیشانەکانی قیامەت بکات، ئەمە جگە لەو سێ خالەی کەلە پێشەوە باسمان کرد کە حیکمەتی باسکردنی ئەو نیشانانە لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) زیاتر دەردەخەن.

دووەم/ هەندێکی تر لە موسلمانان پێیان وایە کە باسکردنی ئەو نیشانانەو گرنگی دان پێیان، بەتایبەت نیشانە گەورەکان دەبێتە هۆی ساردکردنەوەی موسلمانان لە کاری ئیسلامیو پشتێن لاکردنەوەیانو دەست بەرداربونیان لە هەموو هیواو ئاواتێك بە ئومێدی ئەو رۆژەی کە (محمدی مەهدی) دێتو خەلافەتی ئیسلام دەگەرێتەوە، وە تا ئەوکات پێویست ناکات کەس هیچ بکات، چونکە کەس هیچی پێناکرێت ئێمەش لە وەلامی ئەم بۆچونەدا ئەلێین: ئەو کەسەی کە باسی نیشانەکانی قیامەت بۆ خەلکی دەکات، دەبێت شێوازی باسکردنەکەی بەجۆرێك بێت کەمەسەلەکە بکاتە مایەی جۆشاندنو خرۆشاندنی هەستو غیرەتی موسلمانان بۆ برەودانی کاری ئیسلامی، نەك

[1] المائدة (٣).

به پێچەوانەوە، وە دەبێت موسڵمانان لەو ڕاستی یە دڵنیـا بکـات بکـات کـە هـەرکاتێك (محمـدی مەهدی) هات لە سەرەوە دەست پێ ناکات، بەو مانایەی موسڵمانان بوونیان لەسەرزەویدا نەمابێتو ئەو دروستیان بکاتەوە، بەڵکو فەرموودە پیرۆزەکان ئەو ڕاسـتی یـە دەسـەلمێنن کـە لـە پـێش هـاتنی مەهدیدا ڕابوونێکی ئیسلامی سەرانسەری جیهان دەگرێتەوە، موسڵمانان لەهەموو لایەکەوە جوڵـەو بزوتنەوەی بەهێزیان تێدەکەوێت، وەکارو ئـەرکی مەهـدیش لـەکاتی هاتنیـدا تـەنها کۆکردنـەوەی جەمـەری هێزی ئیسلامیەکانە لەژێر فەرمانی خۆیدا، کەواتە پێویستی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە کە ئەسپی خۆی لەو ڕابوونەدا تـاو بـدات بـۆ زەمینـە سـازکردن بۆهـاتنی ئـەورۆژە پـیرۆزە، نـەك ساردبونەوەو پشتێن لێ کردنەوە بە خەیاڵی ئەوەی بخەوێت کە خەبەری بـوەوە خەلافـەتی ئیـسلامی خۆی بۆ خۆی گەڕابێتەوە. وە لە باسی محمدی مەهدیدا تیشکی زیاترمان خستۆتە سەر ئەم بۆچـونە هەڵەیەو لەوێشدا ڕەدمان داوەتەوە.

سێیەم/ هەندێك لەو کەسانە کە باس لە نیشانەکانی قیامەت دەکەن، کاتو وەختی دیاریکراو دەست نیشان دەکەن بۆ هاتنی ڕوداوەکانی، دەڵێن ئەوەندە ساڵی ماوە بۆ هـاتنی ئەونیـشانەیە، یـان ساڵی ئەوەندە ئەو نیشانەیەی تر ڕوودەدات، تەنانەت هەندێکیان ئەوەنـدە زیادەڕەویـان کـردووە لـە مەسەلەکەدا کە کاتی هاتنی قیامەتیش بە ساڵ دیاری دەکەن، بـۆ یـە بەپێویـستی دەزانم لێـرەدا ئـەو ڕاستی یە ڕون بکەمەوە کە بەهیچ جۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) ڕودانـی ئـەو نیـشانانە ساڵ ومانگـو کاتـو وەختەکانیان دیاری نەکراوە کە تیایدا سەر هەڵدەدەن یـان ڕودەدەن، وە هـەر کەسێك لەم بوارەدا بە دەست نیشان کردنی ساڵو مانگ باسی لە هاتنی نیشانەکان کرد، ئەوە تەنها بۆچونو لێکدانەوەی خۆیەتی، یان لەهەنـدێك فـەرموودەی لاوازو چـیرۆکی ئیـسرائیلیاتو کتێـبی جادوگـەرو بـەخت گرەکانـەوە وەری گرتـووە، وە هەنـدێك جـاریش لەلایـەن جولەکـەو خاچپەرستەکانەوە هەندێك پڕوپاگەندە بڵاو دەکرێتەوە دەربارەی کاتی دابەزینی مەسـیحو دروسـت کردنەوەی هەیکەلی سولەیمانو جەنگی (هرمجدون)و چـەند مەسـەلەیەکی تـر کـە ئەمانـە هـەمووی مەرامی سیاسیو بەرژەوەندی تایبەتی لە پشتەوەیە، وە دوورە لـە هـەموو ڕاسـتی یـەکانی قورئـانو فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

وە لە کۆتایشدا حەز دەکەم ئەوە بڵێم کە لـەم کتێبـەدا هـەوڵم داوە بـەپێی توانـا خـۆم لـە فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو بەزمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بپارێزم، وە تـەنها ئـەو فەرمودانـەم هێنـاوە لانی کەم یەکێك یان دوان لە زانایانی باوەڕ پێکراوی بواری فەرموودە شایەتی (صحیح)ی یان لانـی کەم (حسن)یان لەسەر داوە.

نشانەکانم بە گشتی کردووە بە سێ بەشی سەرەکیەوە:

بەشی یەکەم/ ئەو نیشانانەی کەپێشتر هاتونەتەدی و ڕویان داوە، وە هەوڵم داوە بەپێی تواناش کاتو شوێنی ڕوداوەکان دیاری بکەم.

بەشی دووەم/ ئەو نیشانانەی کە بە نیشانەکانی ناوەڕاست یان نیشانە ناوەندیەکان دەژمێردرێن، ئەو نیشانانە دەگرێتەوە کە هەتا ئەمڕۆ بە بەردەوامی لە بەرچاو بەرجەستەنو دەبینرێن، وە ئەگەر نەشڵێن هەموویان ئەوا بەشی هەرە زۆریان هاتونەتە دی و ئێمەش بەپێی توانا دەست نیشانمان کردونو ڕونمان کردونەتەوە.

بەشی سێیەم/ نیشانە گەورەکان، کە گرنگیەکی زۆرمان پێداوەو پانتاییەکی کتێبەکەمان بۆتەرخان کردووە، وە هەوڵێکی زۆرمان داوە کەڕێکخستنو تەرتیب کردنی ئەو نیشانە گەورانە تاڕادەیەکی زۆر لە ڕاستییەوە نزیك بێت، چونکە ئەو نیشانانە لە فەرمودەکاندا بەتەرتیب نەهاتون، پاشانیش لەسەر زۆرێك لەو نیشانە گەورانە ڕونکردنەوەو بۆچونو لێکدانەوەی تایبەتی خۆمان پێشکەش کردوە، جا ئەگەر لە هەرچیەکدا ڕاستمان کردبێتو پێکابێتمان ئەوا لەلایەن خواوەیەو ئەگەر هەڵەشمان کردبێتو نەمان پێکابێت، ئەوا هەڵەی خۆمانەو داوای لێبوردنی لە خوای گەورە لێ دەکەین، وە داوا لە موسڵمانانی بەڕێز دەکەم کە هەر کەسێکیان سەرنجێك یان تێبینیەکیان دەربارەی بابەتەکانی ئەم کتێبە هەیە یان دەرکیان بە هەڵەیەك کردووە ئێمە هەستمان پێنەکردووە، زۆر سوپاسیان دەکەین کە ئاگادارمان بکەنەوە، خوای گەورە ئێمەو ئێوەش ڕێنومایی بکات بۆڕێگەی ڕاستی خۆیو پارێزراومان بکات لە هەموو ئەو فیتنەو نەهامەتیانەی کە لەم کۆتا زەمانەدا بەرۆکی موسڵمانان دەگرن، والله حسبنا ونعم الوكيل.

وسبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين و صلى الله و سلم على عبده ورسوله محمد النبي الأمي وعلى آله وأصحابه وأزواجه وأمته الى يوم الدين.

هەڵەبجە

چوارشەممە ١٦/ شوال/١٤٢١

# بەشی یەکەم
# ئەو نیشانانەی کە پێشتر ڕویانداوەو تێپەڕبوون

## یەکەم/ وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ):

یەکەم نەهامەتی کە بەسەر ئومەتی ئیلامدا هات وەفاتی پێغەمبەرەکەی بوو(ﷺ) وە یەکەم دەرگای ناکۆکی بە وەفاتی ئەو کرایەوە لە نێوان مهاجرین‌و ئەنصاردا، کاتێك کە ئەنصارەکان وتیان (مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ)[1]، واتە: (با ئێمە ئەمیرێکمان هەبێت‌و ئێوەش ئەمیرێك).

وە هەر بە وەفاتی ئەویش بوو کە ژمارەیەك لە هۆزو خێڵە عەرەبەکان کە هێشتا ئیمان بەتەواوەتی لە دڵیاندا نەچەسپی بوو، بە فرسەتیان زانی‌و لە ئیسلام پاشگەز بونەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی خۆی کردووە بە یەکێك لە نیشانەکانی ئاخر زەمان و یەکەم فیتنە کەڕوبەڕوی موسڵمانان دەبێتەوە.

ئەوەتا لەو فەرمودەیەی کە (عوفی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (اعدُد ستاً يَدَي الساعة: مَوتي)[2] واتە(شەش ڕوداو بژمێرە لە پێش هاتنی قیامەتدا: مردنی من...).

لەم فەرمودەیەوە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردوە بە یەکەمی نیشانەکانی قیامەت و سەرەتای ئەو ڕوداوانەی کە لە پێش هاتنی قیامەتدا ڕوو دەدەن.

(أنسی کوڕی مالك)یش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: (لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ وَلَمَّا نَفَضْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْأَيْدِي وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا)[3]، واتە: (ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا هاتە شاری مەدینەوە، هەمووشتێك لەو شارەدا ڕوناك بوەوە، وە لەو ڕۆژەشدا کە تیایدا مرد، هەموو شتێك لەو شارەدا تاریك بوو، وە هێشتا دەستمان لەخۆڵی ناشتنی پێغەمبەر(ﷺ) نەتەکاندبوو وە سەرقاڵی ناشتنی بووین هەستمان کرد کە دڵمان گۆڕاوە).

---

[1] أخرجه النسائي وأبويعلى والحاكم وصححه عن ابن مسعود. المستدرك ج٣ ص٦٧

[2] صحيح البخاري (٢٧٧/٦ مع الفتح).

[3] رواه الترمذي وقال هذا حديث غريب صحيح. وقال الألباني (صحيح) صحيح سنن الترمذي للألباني (٤٨٦/٣) رقم (٣٦١٨).

(أم سلمە)ی دایکی موسڵمانان و خێزانی پێغەمبەریش(ﷺ) باسی ئەو نەهامەتییە گەورەیە دەکات و دەڵێت: (يا لها من مصيبة ما أصابنا بعدها من مصيبة الاهانت إذا ذكرنا مصيبتنا به(ﷺ))[1]، واته: (ئای کە نەهامەتییەکی گەورەبوو، هەر نەهامەتییەکمان لەدوای ئەوە بەسەر هاتبێت، کاتێك وەفاتی پێغەمبەرمان(ﷺ) دەکەوتەوە لە تاودا نە هامەتیەکەی خۆمان لەلا ئاسان دەبوو).

عائشەش ڕەزای خوی لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَيُّمَا أَحَد مِنْ النَّاسِ أَوْ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ أُصِيبَ بِمُصِيبَةٍ فَلْيَتَعَزَّ بِمُصِيبَتِه بِي عَنْ الْمُصِيبَةِ الَّتِي تُصِيبُهُ بِغَيْرِي فَإِنَّ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِي لَنْ يُصَابَ بِمُصِيبَةٍ بَعْدِي أَشَدَّ عَلَيْهِ مِنْ مُصِيبَتِي)[2]، واته: (ئەی خەڵکینە، هەر کەسێکی باوەڕدار کەدوچاری گرفت و نەهامەتی هات، با سەبوری دڵی خۆی بە وەفاتی من بداتەوە لە هەرنەهامەتیەکی ترکە دوچاری بووە، چونکە هیچ کەسێك لە ئومەتەکەم لەدوای من دوچاری گرفت و نەهامەتیەك نابێت کە لە نەهامەتی مردنی من گەورەتر بێت لەسەری).

هەزاران درودو ڕەحمەت لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری خۆشەویست و پێشەوا بێت، بەڕاستی هیچ کاتێك موسڵمانان هێندەی ئەمڕۆ بۆشایی وەفات و کۆچی دوایی پێغەمبەریان(ﷺ) پێوەدیارنەبووە، چونکە هیچ کاتێك هێندەی ئەمڕۆ بێ پێشەوایەتی و بێ شوانی بەرۆکی بەموسڵمانان نەگرتوە.

## دووەم/ شەهیدکردنی (عومەری کوڕی خەتاب) ڕەزای خوای لێبێت:

(حذیفەی یەمانی) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك خۆی و کۆمەڵێکی تر لە سەحابەکان لە خزمەتی عومەری کوڕی خەتابدا دانیشتبوون، ئەویش پرسیاری لێ کردن(کامتان فەرمودەی پێغەمبەری(ﷺ) لەبەرە دەربارەی فیتنە؟)، (حذیفە) دەڵێت: وتم من، عومەریش فەرمووی دە بۆمان بڵێ، منیش ووتم پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (فِتنَةُ الرَجُل فِي أهلِهِ وَمالِـهِ وولَـدِهِ وَجَـارِهِ تُكَفِّرُها الصلاتُ والصَدَقَةُ ولأمر بالمروف والنهي عن المُنكَر).واته (ئەو گوناهانەی کە توشی پیاو دەبێت بەهۆی خێزان و پارەو نەفسی خۆی و ئەولاد و دراوسێوە، ئەوا نوێژ و ڕۆژو و خێرکردن و فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە دەیانسڕێتەوە)، عومەریش فەرموی: (حذیفە) پرسیاری ئەو فیتنانەت لێ ناکەم، بەڵکو پرسیاری ئەو فیتنانە دەکەم کە وەك دەریا شەپۆل دەدەن. (حذیفە) دەڵێت: منیش پێم ووت: قوربان تۆ حەقی ئەو فیتنانەت چی یە؟ خۆ تۆ نایبینیت، چونکە

[1] اخرجه البيهقي.

[2] حديث صحيح رواه ابن ماجه والطبراني وابن سعد وفي صحيح الجامع الصغير (١٣٠٣/٢) رقم (٧٨٧٩).

لەنێوان تۆ و ئەو فیتنانەدا دەرگایەکی داخراو هەیە، عومەریش ووتی: باشە ئەو دەرگا داخراوە دەشکێت یان دەکرێتەوە؟ منیش ووتم نەخێر دەشکێت، ئەویش ووتی: دەی کە شکا قەت جارێکی تر داناخرێتەوە.. یەکێك لە هاوەڵەکان کە ناوی (شقیق) بوو پرسیاری لە (حذیفە)کرد: باشە عومەر خۆی دەزانێت مەبەست لە دەرگاکە کێیە؟ ئەویش ووتی: ئەرێوەڵا چۆن دەیزانی لەدوای ڕۆژ شەو دادێت ئاواش دەیزانی دەرگاکە کێیە، چونکە من فەرمودەیەکم بۆ نەگێڕابووەوە کە لێی تێنەگات، یەکێکی تر لە هاوەڵەکان کە ناوی (مسروق) بوو لە (حذیفە)ی پرسی: باشە مەبەست لە دەرگاکە کێ بوو؟ (حذیفە)ش ووتی: عومەر خۆی بوو.

لەم فەرمودە صەحیحەوە دەردەکەوێت کە خەلیفەی دووەمی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێبێت دەرگایەکی داخراو بوو لە ڕووی فیتنە گەورەکانی ئاخرزەمان، وە بەشکاندنی ئەو دەرگایە واتە بە شەهیدکردنی عومەری کوڕی خەتاب لەلایەن (أبو لؤلؤة)ی مەجوسیەوە دەرگا والآبوو بۆ هاتن و ڕوودانی فیتنە گەورەکان کە وەك دەریا شەپۆل دەدەن، بەتایبەت کوشتاری موسڵمانان لەنێوان خۆیاندا کە لەدوای شەهیدکردنی عومەری کوڕی خەتابەوە دەستی پێ کرد، هەر لەسەردەمی سەحابەوە هەتا ئەمڕۆ و هەتا قیامەت هەر بەردەوام دەبێت، چونکە ئەو دەرگایە کە بەربەست بوو لە ڕووی فیتنەدا شکاو جارێکی تر داناخرێتەوە.

ئەمەو بۆ زیادەزانیاری هەندێك لە زاناکان پێ یان وایە ئەو دەرگایە (عوسمانی کوڕی عەفانە) ڕەزای خوای لێبێت چونکە لەدوای شەهیدبوونی ئەو کوشتاری نێوان سەحابە دەستی پێکرد، بەلآم ڕاستیدا فیتنەکان لەدوای شەهیدبوونی عومەرەوە سەری هەڵداو چەکەرەی کرد، بەلآم بەکوشتنی عوسمانی کوڕی عەفان بەرپابوو، خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت.

## سێیەم/ شەهیدکردنی (عوسمانی کوڕی عەفان) ڕەزای خوای لێبێت:

(عبدالله ی کوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) باسی فیتنەیەکی کرد کە لەدوای خۆی ڕوودەدات و پاشان ئاماژەی بۆ عوسمان کرد و فەرموی (يُقتَلُ فيها هذا مَظلوماً)[1] واتە( لەو فیتنەیەدا ئەو پیاوە بە مەزڵومی دەکوژرێت).

بەهەمان شێوە (عائشە)ی دایکی موسڵمانان ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە عوسمانی فەرموو: (يَا عُثْمَانُ إِنَّهُ لَعَلَّ اللَّهَ يُقَمِّصُكَ قَمِيصًا فَإِنْ أَرَادُوكَ عَلَى خَلْعه فَلَا تَخْلَعْهُ لَهُمْ)[1] ، واتە:

---

[1] رواه احمد والترمذي وقال الترمذي: هذا حديث حسن غريب في هذا الوجه، وقال الألباني حسن الإسناد صحيح سنن الترمذي للألباني (٥١٨/٣) رقم (٣٠٧٠٨).

(ئەی عوسمان، بەڵکو خوای گەورە کراسێکت لەبەر بکات "مەبەست پێی خەلیفایەتی بوو"، جا ئەگەر ویستیان لەبەرت دابکەنن بۆیان دامەکەنە).

هەروەها (ابو سهلە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: گوێم لە عوسمانی کوڕی عەفان بوو ئەو ڕۆژەی لە ماڵەکەی خۆیدا شەهید کرا دەیوت: (إن رسول الله(ﷺ) قد عَهِدَ إلي عهداً فأنا صابر عليه)[2]، واتە: (پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانێکی لێ وەرگرتووم، منیش پابەندی ئەو پەیمانە دەبم ئارامی لەسەر دەگرم).ئەوەبوو ئارامی گرت هەتا شەهیدیان کرد، ڕەزای خوای لێبێت.

هەروەها (انسی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) و ابوبکر و عومەر و عوسمان لەسەر کێوی (احد) بوون، کێوەکە لەرزەیەکی کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (اسکن احد فما علیك إلا نبي و صدیق و شهیدان)[3] ، واتە: (واتە سامن بە ئوحد، ئەوەی لەسەرت ڕاوەستاوە تەنها پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهیدە).

ئەم فەرمودە ڕاستانەو چەندین فەرمودەی تر بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) زووتر عوسمانی ئاگادار کردۆتەوە کە دوچاری فیتنەو نەهامەتیەکی گەورە دەبێت و داوای لێ کردووە کەسەبری لەسەر بگرێت و پاشەکشێ لە خەلیفایەتیەکەی نەکات، چونکە بە شەهیدی دەمرێت، عوسمانیش ڕەزای خوای لێبێت باش دەیزانی چی لە پێشە، بۆیە لەکاتی ڕوودانی فیتنەکەدا دڵنیابوو کە خۆی لەسەر حەقە و ئەوانەی داوای دەست هەڵگرتنی دەکەن لە خەلافەت ئاژاوەگێڕن و مەبەستیان هەڵگیرساندنی فیتنەیە. هەر بۆیەش لە خەلیفایەتیەکەی خۆی دانەبەزی و لەهەمانکاتیشدا ڕێگەی نەدا هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەست بدەنە چەك بۆ پارێزگاری کردنی، بەڵکو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە نابێت لەسەر ئەو یەك دڵۆپ خوێن بڕژێت، هەزاران ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت، بەڕاستی بەڵێنەکەی کە پێشتر دابوی بە پێغەمبەر(ﷺ) بردیە سەر و تەسلیم بە قەدەری خوا بوو کەلە ئەزەلدا نوسیبوی خوێنی بەناحەق دەڕژێت.

## چوارەم/ جەنگی ( جمل ) لەنێوان لەشکری ئیمام عەلی و لەشکری عائشەدا:

پاش شەهیدکردنی عوسمان بەدەستی فیتنەگێڕان، موسڵمانانی شاری مەدینە ئیمامی عەلی یان کرد بە خەلیفەو بەیعەتیان پێدا، بەڵام ژمارەیەك لە سەحابەکان لەوانە (طلحة) و (زبیر) کە زۆر دڵپڕ بوون بە شەهیدکردنی ئیمامی عوسمان، داوایان کرد کە دەست و برد تۆڵە بستێنیتەوە لەبکوژانی عوسمان،

---

[1] رواه احمد و الترمذي و ابن ماجه، وقال الألباني (صحيح) صحيح سنن الترمذي للألباني (٥١٧/٣) رقم (٣٧٠٥).

[2] رواه الترمذي وقال هذا حديث حسن صحيح غريب وقال الألباني (صحيح) صحيح سنن الترمذي للألباني.

[3] رواه البخاري و مسلم والترمذي، وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني (٥٦٢/٢).

بەلام ئیمامی عەلی ووتی ئەم کارە بەپەلە ناکرێت هەتا تەواو بۆمان یەك لانەبێتەوە کێ بوون ئەوانەی کوشتویانەو دەبێت کەس و کاری عوسمانیش داوای خوێنەکەی بکەن، بەلام (طلحة و زبیر) بەوە قایل نەبوون و بەناوی (عومرە)کردنەوە لە شاری مەدینە دەرچوون، وە لە مەکەدا چاویان بە (عائشە) کەوت ڕەزای خوای لێبێت کە هێشتا لەسەفەری حەج نەگەڕابووەوە، وە قەناعەتیان پێکرد کە دەبێت داوای خوێنی عوسمان بکرێت و تۆڵە لە بکوژانی بسەنرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش دەستیان کرد بە وتاردان و حەماسەت کردن بەبەری خەڵکدا تاتوانیان بە هاوکاری (یعلی بن امیه) کە ئیمامی عوسمان کردبووی بە ئەمیری (صنعاء)لە یەمەن لەشکرێکی گەورە کۆبکەنەوە، وە حوشترێکیشی بە عائشە کرد کە ناوی (عسکر)بوو کە دواتر شەڕەکە بەناوی حوشترەکەوە ناونرا، ئەمەو لەشکرەکە بەرەو شاری بەسرە کەوتنە ڕێ، کە نزیکەی (٦٠٠) کەس لەوانەی بەشداریان کردبوو لە فیتنەی کوشتنی ئیمامی عوسماندا پەنایان بردبووە بەر ئەو شارە. وە لەلایەکی تریشەوە (معاویەی کوڕی ابو سفیان) کە ئەمیری وولاتی شام بوو ڕازی نەبوو بەیعەت بدات بە ئیمامی عەلی هەتا تۆڵە لە بکوژانی ئیمام عوسمان نەکاتەوە کە هێشتا ژمارەیەکی زۆریان لە شاری مەدینەدا مابوون.

ئیمامی عەلیش هەردوو هەڵوێستەکەی (معاویە) و (طلحة و زبیر)ی بە دەرچوون لەشەریعەت و بەرهەڵستکاری فەرمانی خەلیفە لە قەڵەمدا، بۆیە لەشکرێکی سازداو بڕیاری دا یەکەمجار (طلحة و زبیر) و عائشە بگێڕێتەوە ژێرفەرمانی خەلیفە، پاشان ڕووبکاتە معاویە.

سەحابەکانیش لەم ئاستەدا بوون بەسێ بەشەوە، کۆمەڵێکیان پشتگیری لە هەڵوێستی ئیمام عەلی دەکرد، وە کۆمەڵێکیان پشتگیریان لە هەڵوێستی (طلحة و زبیر) دەکرد وە کۆمەڵی سێیەمیشیان مەسەلەکە بە فیتنەیەکی گەورە تێ دەگەشتن کە بۆنی خوێن ڕژانێکی گەورەی لێدێت بۆیە پشتگیری هیچ لایەکیان نەکرد و پێیان وابوو کە نابێت کێشەکە بەشەڕ چارەسەر بکرێت، لەوانەش (عبدالله ی کوڕی عومەر و عبدالله ی کوڕی عباس و ئەبوموسای ئەشعەری و ژمارەیەکی زۆری تر لە سەحابەکان).

ئەمەو پاش ئەوەی سوپاکەی (عائشە) گەیشتە نزیك شاری بەسرە، (عوسمانی کوڕی حەنیف) کە ئەمیری شاری بەسرە بوو (عمرانی کوڕی حصین)ی نارد کە یەکێك بوو لە سەحابەکان بۆ لای سوپاکە تابزانێت مەبەست لەهاتنیان چیە بەرەو شاری بەسرە، وە پاش وت و وێژو هاتوچۆیەکی زۆر لەنێوان هەردوولادا نەگەیشتنە هیچ ئاکامێك، پاشان هەندێك پیاهەڵپژان لەنێوان سوپاکەی ئەمیری بەسرەو لەشکرەکەی عائشەدا ڕوویدا کە بووە هۆی گرتنی (عوسمانی کوڕی حەنیف)ی ئەمیری بەسرە لەلایەن لەشکری عائشەوە، وە دواتر ڕەوانەی لای ئیمامی عەلی کرا، نیز هیچ بەربەستێك

ئەما لەنێوان لەشکرەکەی عائشەو بکوژانی ئیمامی عوسماندا، بکوژانی ئیمامی عوسمانیش کەزانیان چواردەوریان گیراوە چاریان ناچارە هەموویان کۆبوونەوە کە ژمارەیان سێ سەد کەس زیاتر بوو بەسەرۆکایەتی (حکم کوڕی جبلە) پەلاماری لەشکرەکەی عائشەیان دا، لە ئاکامدا هەرهەموویان کوژران تەنها یەك کەسیان نەبێت کە توانی هەڵبێتو پەنای دایە بەر خێڵی (بەنی سەعد). پاشتریش بانگەواز کرا بەناو شاری بەسرەو هەموو خێڵەکانی چواردەوردا کێ بەشداری کردووە لەفیتنەی کوشتنی ئیمامی عوسماندا با تەسلیم بکرێت، دواتر هەموویان تەسلیم کران و کوژران، بەم شێوەیە هەموو ئەوانەی کە دەستیان هەبوو لە پلانی کوشتنی ئیمامی عوسمانداو پەنایان بۆ شاری بەسرە بردبوو تۆڵەیان لێ سەندرایەوە، تەنها ئەوانە مابوون کە لە شاری مەدینەدا مابوونەوە و لەگەڵ سوپاکەی ئیمامی عەلی دا خۆیان تێهەڵکێش کردبوو پاشان سوپاکەی ئیمامی عەلی گەیشتە شاری (ذي قار) لە نزیك بەسرەوە، لەوێوە (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) کەیەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وەك نێردراوی خۆی ڕەوانەی بەسرە کرد، بەڵکوبتوانێت قەناعەت بە عائشە و طلحة و زبیر و سوپاکەی بکات بگەڕێنەوە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی خەلیفە، ئەویش لە پاش وت و وێژێکی زۆر لەگەڵیاندا پێی وتن: ئێوە لەو شەشسەد نەفەرەی کە بەشدابوون لە پلانی کوشتنی ئیمامی عوسمانداو پەنایان بردبووە بەر شاری بەسرە هەموویانتان کوشتن تەنها یەك نەفەریان دەرباز بووە، ئەوانەشی کە هێشتا ماون لە شاری مەدینەو شوێنەکانی تر یاخود خۆیان تێهەڵکێش کردووە لەگەڵ سوپاکەی ئیمام عەلی، ئەگەر ئێوە ڕێبکەونەوە لەگەڵ خەلیفەو بگەڕێنەوە ژێر ڕکێفی ئەو، ئەوا بەهاوکاری هەردوولا بژار دەکرێن و بەسزای خۆیان دەگەیەنرێن، ئەگەریش بەوە ڕازی نەبن ئەوا ئوممەتی ئیسلام دوچاری فیتنەیەك دەکەن کە ئەوەڵەکەی دیارەو کۆتاکەشی خوانەبێت کەس نازانێت، لەدوای ئەم قسانە عائشەو طلحة و زبیر قەناعەتی تەواویان کرد و بە قەعقاعیان ووت ئێمە ئامادەی سوڵحین هەرکات ئیمامی عەلی هات هەمان قەناعەت و هەڵوێستی تۆی هەبوو، ئێمەش ئامادەین بگەڕێینەوە ژێر ڕکێفی و لە فەرمان دەرنەچین، کاتێك کە قەعقاع هەڵوێستی ئەوانی بە ئیمامی عەلی گەیاند، ئەویش زۆری پێخۆشبوو بەکارێکی ئاقڵانەی زانی و بە ئاکامێکی دڵخۆشکەرانەی لە قەڵەم دا، وە بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو شاری بەسرە بەڕێکەوت هەتا لەگەڵ عائشە و طلحة و زبیر پێکەوە کۆببنەوەو کۆتایی بەکێشەکە بهێنن، بەڵام کاتێك ئەو پلان گێڕانەی بەشداربوون لەکوشتنی ئیمامی عوسمانداو خۆیان تێهەڵکێش کردبوو لەگەڵ سوپاکەی ئیمامی عەلی بەم گۆڕانکارییە تازەیان زانی، دڵنیابوون کە هەر ئاشتیەك لەنێوان ئەم دوو لایەندا ڕووبدات لەسەری ئەماندا دەشکێ و عاقیبەت بەدەردی کۆمەڵەکەی بەسرە دەچن، بۆیە بەپەلە کەوتنە خۆیان

و لەنێوان خۆیاندا کۆبوونەوەو بڕیاریاندا کەتاکە چارەسەر ئەوەیە کە بە هەر نرخێك بێت نەهێڵن ئەو سوڵحە رووبدات، بۆ ئەم مەبەستەش لەسەر ئەوە ڕێکەوتن هەر کاتێك گەیشتنە بەسرە پێش ئەوەی سوڵحەکە ئەنجام بدرێت ئەوان تێك هەڵپژان دروست بکەن و ئاگری شەڕ لەنێوان هەردوولادا هەڵبگیرسێنن، ئەوەبوو پیلانەکەیەان بۆچووە سەر و پێش ئەوەی وت و وێژی ئاشتی و سوڵحەکە بە ئاکام بگات ئەمان ئاگری شەڕیان لەنێوان هەردوولادا هەڵگیرسان و هەر لایەنەو وای زانی لایەنەکەی تر فێڵی لیّ کردووەو غافڵگیری کردووەو پەلاماری داوە، وە شەڕەکە لە ناوچەی (زابوقە)ی نزیك بەسرە لە بەرەبەیانی ڕۆژی جومعەی ڕێکەوتی شانزەی جەمادی دووەمی ساڵی (٣٦)ی کۆچی دەستی پیّ کرد وەتا درەنگانێکی شەو بەردەوام بوو، وە شەڕکە هێندە گەرم بوو کە هەرچەندە سەرکردەکانی هەردوولا هاواریان دەکرد بۆ خاتری خوا شەڕەکە ڕاگرن، بەڵام کەس بە قسەی نەکردن وە لە گەرمەی شەڕەکەدا ئیمامی عەلی و زبێر بەسواری ئەسپەکانیانەوە بەیەك گەیشتن، ئیمامی عەلی بەزبێری ووت: زبێر ئەم لەشکرە گەورەتان ئاوا سازداوە بەڵام هیچ عوزرێکتان بۆ قیامەت ئامادەکردووە، زبێر سوێندت دەدەم بەخوا لەبیرتە کە پێغەمبەر(ﷺ) پیّی وتیت (لتقاتلنه وأنت له ظالم)[1] واتە (ڕۆژێك دێت شەڕ لەگەڵ عەلی دەکەیت و تۆش زوڵمی لیّ دەکەیت)، زبێریش کە ئەو فەرمودەیەی بیرکەوتەوە ووتی بەڵیّ، بەڵام سوێند بەخوا ئێستا بیرم دەکەوێتەوە، ئەگەر لەبیریشم بوایە هەرگیز شەڕم لەگەڵ نەدەکردیت و ڕووبەڕووت نەدەوەستام، هەر بۆیە زبێر گۆڕەپانی شەڕەکەی بەجیّهێشتو دوورکەوتەوە و لەبن دارێکدا لێی ڕاکشا، هێندە هیلاك و خەفەت باربوو خەوی لیّ کەو، بەڵام یەکێك لە پیلان گێڕەکان کە ناوی (عەمری کوڕی جەرموز) بوو چاوی لێبوو بەتەنها ڕۆیشت شوێنی کەوت لەبن دارەکەدا فرمەتی لیّ هێناو شەهیدی کرد، پاشتر بە خۆشیەوە گەڕایەوە بۆلای ئیمامی عەلی و پیّی ووت مژدەم بەریّ زبێرم کوشت، ئیمامی عەلیش بە بیستنی هەواڵەك دەستی کرد بەگریان و پیّی ووت نەفرەتی خوات لێبێت نازانیت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بشر قاتل ابن صفية بالنار)[1] ، واتە: (مژدەی ئاگر بدەن بەو کەسەی زبێری کوڕی صفیە دکوژێت).

وە طلحەش ڕەزای خوای لێبێت لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا بە خەستی بریندار بوو، پاشان بردیانە ماڵێکەوە لە بەسرە وە لەویّ وەفاتی کرد، عائشەش ڕەزای خوای لێبێت بەسواری حوشترەکەیەوە بەناو شەڕکەرەکاندا هاواری دەکرد کە شەڕەکە ڕابگرن، وە داوای لە (کعبی کوڕی سور) کرد کە

---

[1] البداية والنهاية لإبن كثير (٧/٢٤١-٢٤٢) والحديث رواه الحاكم في المستدرك(٣/٣٦٦) وصححه.

[1] البداية والنهاية لإبن كثير (٧/٢٤٩-٢٥٠) والحديث رواه الإمام احمد عن علي بن أبي طالبﷺ.

قازی شاری بەسرە بوو قورئان بەرزبکاتەوە لەنێوان هەردوولادا بەڵکو شەرم بیانگرێت و شەڕەکە ڕابگرن، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەویشیان کوشت، وە شەڕەکە لەدوای نیوەڕۆدا لەبەردەم حوشترەکەی عائشەدا گەیشتە ئەوپەڕی توندیی و لەئەنجامدا حوشترەکەی عائشە کوژرا و کەژاوەکەی عائشە کەوتە سەر زەوی ئەمەش بووە مایەی ئەوەی کە سوپاکەی عائشە ورەیان بڕوخێت و بشکێن و شەڕەکە کۆتایی پێ بێت.

ئاکامی شەڕەکە(١٠) هەزار کوژراو بوو لە هەردوولا، پێنج هەزار لە لەشکری ئیمامی عەلی و پێنج هەزار لە لەشکری عائشە، وە بریندارەکانیش هەر لەژماردن نەدەهاتن.

پاشان (محمد کوڕی ابوبکر) کەبرای عائشە بوو، بەڵام لە لەشکرەکەی ئیمامی عەلی دابوو لەگەڵ ئیمامی عەلی گەیشتنە سەر کەژاوە کەوتوەکەی عائشە، وە بەڕێزەوە هێنایانە دەرەوەو ئیمامی عەلی سەلامی لێ کرد و پێی ووت دایەگیان خوای گەورە لە ئێمە و ئێوەش خۆش بێت، عائشەش وەڵامی دایەوەو ووتی: بەڵێ کوڕم خوای گەورە لە ئێمە و ئێوەش خۆش بێت، پاشان گواستیانەوە بۆ ماڵی (عبدالله کوڕی خلف الخزاعي) لەبەسرەو دوای چەند ڕۆژێك بەوپەڕی ڕێزەوە بەهاوڕێیەتی (٤٠) ئافرەتی ناوداری شاری بەسرە بەرەو شاری مەکە بەڕێی کرد.

پاشان ئیمامی عەلی نوێژی مردووی لەسەر کوژراوانی هەردوو لەشکرەکە کرد و دوعای خێری بۆ هەموویان کرد.

پاش شەڕەکە ئیمامی چەند ڕۆژێك لە بەسرە مایەوەو کاروباری ڕێکخستەوەو هێمنیو ئارامی بۆ شارەکە گێڕایەوەو پاشان بەرەو شاری کوفە کەوتەڕێ و لەوێ نیشتەجێ بوو و کردی بەپایتەختی خەلافەتی ئیسلامی ئەو پایتەختەی کە زۆر کەم دەوامی کرد.

ئەمە کورتەی یەکەم فیتنە بوو کە سەحابەکان لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) دەستیان تێدا چووەخوێنی یەکتر و هەتا ئەمڕۆش دەرگای ئەو فیتنەیە دانەخراوە و تا قیامەتیش داناخرێ.

ئەمەو سەبارەت بەو فیتنەیە ئیمام حاکم لە (علي و طلحة) وە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەزبێری فەرمووە: (أتحبُ علياً، أما إنكَ سَتَخرّجَ عليه وتُقاتله وأنت له ظالم)[1]، واتە: (ئەی زبێر، تۆ عەلیت خۆش دەوێت، دەزانی ڕۆژێك دێت لێی هەڵدەگەڕێیتەوەو شەڕی لەگەڵ دەکەیت و زوڵمی لێ دەکەیت).

[1] رواه الحاكم في المستدرك (٣/٣٦٦)و صححه.

(ابن عباس)یش ڕەزای خوایان لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەخێزانەکانی خۆی فەرمووە: (أيتُكن صاحبة الجمل الأدبب، تيسر أو تخرج حتى تنبحها كلاب الحواب يُقتَلُ عن يمينها وعن شِمالها قتلى كثيرة، وتَنجو بعدما كادت).[2] واتە (کامتانن خاوەنی حوشترە دەم و چاوتوکاوی یەکە، بەڕێ دەکەوێت و دەڕوات هەتا سەگەکانی (حواب) کە (شوێنێکی نزیك بەسرەیە) لێی دەوەڕن، لەلای ڕاستی و لەلای چەپیەوە خەڵکێکی زۆر دەکوژرێن، وە بە زەحمەت لە کوشتن ڕزگاری دەبێت).

و(ام سلمه)ش ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە باسی ئەوەی کردووە یەکێك لەخێزانەکانی بۆ شەڕ دەچێتە دەرەوە. دەڵێت عائشەش دەستی کرد بە پێکەنین، پێغەمبەرﷺ(ﷺ) پێی فەرموو: (أنظي يا حُميراء أن لا تكوني أنتِ، ثم التَفَت الى علي فقال إن وليت شيئاً من أمرها فارفق بها)[3]، واتە: (ئاگاداربە سورە"مەبەستی پێی عائشەیە چونکە سورکاربوو ڕەحمەتی خوای لێبێت" تۆ نەبێت، پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای عەلیداو پێی ووت: ئەگەر کارێکی عائشە کەوتە دەست تۆ نەرم بە لەگەڵیداو توند مەبە).

لەم فەرمودە پیرۆزانەو چەندین فەرمودەی ترەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆربەوردی هەواڵی ڕوودانی ئەو فیتنانەی بە هاوەڵ و خێزانەکانی گەیاندووە، بەڵام ڕاستە لەئاستی قەدەری خوادا چاوکوێر دەبێت و دەستەڵات نامێنێت.

## پێنجەم/ جەنگی (صفين):

پاش ئەوەی کە ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت کۆتایی بە بەرهەڵست کاریەکەی بەسرە هێناو بارودۆخی لەناوچەکەدا هێمن کردەوە، ئاوڕی دایەوە بەلای شامدا کە لە ژێر دەسەڵاتی معاویەدا بوو، وە تا ئەو ساتەش معاویە بەیعەتی نەدابوو بە ئیمامی عەلی، وە ئامادە نەبوو لەسەر فەرمانی ئیمامی عەلی دەست لە ئەمیرایەتی وولاتی شام هەڵبگرێت، بۆ ئەو مەبەستەش ئیمامی عەلی (جریری کوڕی عبدالله ی بجلي) ڕەوانەکرد بۆ لای معاویە تا داوای لێ بکات بەیعەت بدات بەخەلیفەو ڕازی بێت بە فەرمانی، معاویەشە پاش وتەو ویژکردن لەگەڵ خەڵکی وولاتی شامدا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە بەیعەت نەدات بە ئیمامی عەلی تا بکوژانی ئیمامی عوسمان کە ماون لەسوپاکەی ئیمامی عەلی دا و

---

[2] أخرجه احمد و أبو يعلي والبزار، وصححه ابن حبان والحاكم، وسنده على شرط الصحيح، وقال ابن حجر رجاله ثقات، فتح الباري (٣/٥٥) و صححه الهيثمي، وصححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة (م١/ج٤-ج٥/٢٢٣-٢٣٣) رقم (٤٧٥).

[3] رواه الحاكم و صححه والبيهقي.

ژمارەیان کە نزیکەی دووهەزار کەس دەبێت تەسلیم بە معاویە دەکـات، چـونەکە معاویـە لـەڕێی خزمایەتییەوە خۆی بە خاوەنی خوێنی ئیمامی عوسمان دەزانی، ئیمامی عەلیش پێی وابوو کـەدەبێت معاویە پێشتر بەیعەتی پێبدات و بێتە ژێر ڕکێف و فەرمانی خەلیفەوە، پاشان داوای ئەو حەقە بکات، بۆیە معاویە لە نەزەری ئیمامی عەلی دا بەرهەڵست کاربوو وە پێویستی دەکرد بە خۆشـی بێـت یـان بەشەڕ بهێنرێتەوە ژێر ڕکێفی خەلافەت.

پاش ئەوەی کە هەوڵەکانی چارەسەرکردی کێشەکە بە ڕێگای ئاشتی هیچ بەرهـەمێکی نـەبوو، ئیمامی عەلی بە خۆی و سـەد و بیسـت هەزار چەکدارەوە بەرەو شام بەرێکـەوت و معاویـەی کـوڕی ئەبوسوفیانیش بە خۆی و نەوەد هەزار چەکدارەوە بەرەو ڕوویان بووەوەو لەناوچەی (صفین)ی سەر ڕووباری فورات هەردوو سوپاکە بەیەك گەیشتن، پاشان شەڕ لەمانگی (ذي الحجة)ی سالّی (٣٦)ی کۆچی لەنێوان هەردوو لەشکردا دەستی پێکرد و بەدرێژایی مانگەکە بەردەوام بوو، بەڵام لەمانگی (محرم)ی سالّی (٣٧)ی کۆچیدا هەردوولا شەڕیان ڕاگرت و جەولـەیەکی تری وتـو وێژ و هەڵێکی تری ئاشتی دەستی پێکرد، ئیمامی عەلی (عدی کوڕی حاتەمی طائي) ڕەوانە کرد بۆ لای معاویە، تـا سەرلەنوێ هەوڵ بدات قەناعەتی پێبکات بگەڕێتـەوە ژێـر ڕکێفـی خەلافـەتو بەیعـەت بـدات بـە ئیمامی عەلی و چی تر خوێنی موسڵمانان و سەحابەکان نەڕژێت، معاویەش لـە وەڵامـدا پـێی ووت ئێمە ڕەخنەمان نیە لە خەلافەتی ئیمامی عەلی و ناشمانەوێت خەلافەتی لێ زەوت بکەین و تاوانباریـشی ناکەین بەکوشتنی ئیمـامی عوسمـان، بـەڵام ئـەو بکـوژانی عوسمـانی پـەناداوە، هـەرکات تەسـلیمی کردینەوە، ئەوا بەخەلیفە قبوڵی دەکەینو بەیعەتی دەدەینێ، وە معاویەش لـەلای خۆیـەوە وەفـدێکی ڕەوانەکرد بۆلای ئیمامی عەلی بەسەرۆکایەتی (حبیبی کوڕی مسـلمەی فهری) بۆ هـەمان مەبەسـت، بەڵام ئیمامی عەلی سوربوو لـەسەر هەڵوێستی پێشتری خۆی و معاویـەش ئامادەنـەبوو لەمەرجەکـەی خۆی دابەزێتو هەوڵەکانی ئاشتی سەرلەنوێ بە بەربەست گەیشت.

ئەمجارە شەڕەکە لـە یـەکی مـانگی (صـفر)دا زۆر بەگـەرم تـر و توندتر دەسـتی پـێکردەوەو تا(١٠)ی ئەو مانگەی خایاند و نزیك بوو سوپای معاویە بشکێت، لێرەدا (عـەمری کـوڕی عـاص) کەزانی نزیکە سوپاکەیان بشکێت بە معاویەی ووت: کارێك هەیە ئەگەر بیکەین سـوپاکەی ئێمـەی زیاتر پێ بەهێز دەبێت و دوبەرەکیشی پێدەکەوێتە نێوان سوپاکەی ئیمامی عەلی یەوە، معاویەش ووتی چیە؟ عەمریش ووتی قورئان بەرەو پیری ئیمامی عەلی دەبەین، داوای لێدەکەین با هـەردوولا لەسـەر حوکمی قورئان دابەزن، دڵنیام ئیمامی عەلی حوکمی قورئان ڕەت ناکاتەوە، ئەگەر ڕازی بـوو ئـەوا سوپاکەمان لە شکان ڕزگاری دەبێت، ئەگەریش نا ئـەوا کۆمـەڵێکیان ڕازی دەبـن و کۆمـەڵێکیان

ڕازی نابن و دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیان و ئێمە سودمەند دەبین، ئەوە بوو قورئانەکەیان بەرەوپیری ئیمامی عەلی برد، ئەویش ووتی بەڵێ من ڕازیم بە حوکمی قورئان و فەرمانی دەرکرد شەڕەکە ڕابگیرێت لە کاتێکدا کەتەنها هەنگاوێکیان مابوو بۆ سەرکەوتن، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی کە کۆمەڵێك لەسوپاکەی ئیمامی عەلی لێی هەڵبگەڕێنەوەو لە فەرمانی دەربچن، چونکە پێیان وابوو هەڵخەڵەتێنراون.. دواتریش ئەو کۆمەڵەناونران (خواریج).. بەڵام بەم شێوەیەو بە بانگەواز وتەحکیمی قورئان شەڕەکە لە ڕۆژی جومعەی ڕێکەوتی (١٠)ی صەفری (٣٧)ی کۆچی کۆتایی پێهات، پاش ئەوەی کە حەفتا هەزار لە هەردوولا کوژران، (٤٥) هەزاریان لە سوپای معاویە و (٢٥) هەزاریش لە سوپای ئیمامی عەلی، کە ژمارەیەکی زۆر لە سەحابەکانیان لەنێواندابوو، لەوانە (عماری کوڕی یاسر) ڕەزای خوای لێبێت کە لە ڕیزی سوپاکەی ئیمامی عەلی دا بوو[1]

پاش شەڕەکە هەردوولا لیژنەیەکیان پێکهێنا کە حوکمی قورئان بەسەر هەردوولادا بچەسپێنێت و (ابو موسی ی ئەشعەری) نوێنەری ئیمامی عەلی بوو لە لیژنەکەدا و (عەمری کوڕی عاص)یش نوێنەری معاویە بوو، پاشان لیژنەکە سوێندی هەردوولای دا کە پابەندبن بەهەر بڕیارێکەوە کەلیژنەکە دەیدات و لیژنەکە بڕیاریدا جارێك سوپای ئیمامی عەلی بگەڕێتەوە کوفە و سوپای معاویەش بگەڕێتەوە شام و هەریەکەو ناوچەی خۆی بەدەستەوە بێت تا بڕیاری کۆتایی لیژنەکە دەردەچێت، بەم شێوەیە شەڕی (صفین) کۆتایی پێهات و هەردوو سوپا گەڕانەوە ناوچەی خۆیان.

سەبارەت بەم فیتنەیەش (ابو هریرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لا تقمُ الساعةُ حتى تَقتَتِلَ فِئتنا عَظِيمَتَنا وتكونُ بَينَهُما مَقتَلَةٌ عَظِيمَةٌ وَدَعواهُما واحِدةٌ)[2]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا دوو کۆمەڵی زۆر گەورە شەڕ لەگەڵ یەکتردا نەکەن، کوشتارێکی زۆر گەورە لەنێوانیاندا ڕوودەدات و هەردووکیان داوای یەك شت دەکەن).

بەڵێ دوو سوپاکە زۆر گەورەبوون، سوپای ئیمامی عەلی (١٢٠)هەزار چەکدار بوونو سوپای معاویە (٩٠) هزار چەکدار بوون، وە حەفتا هەزار کەس لەو شەڕەدا کوژراو هەردوو سوپاکەش لە قەناعەتی خۆیان مەبەستیان سەرخستنی حەق و بەدەستهێنانی دادپەروەری بوو.

[1] البداية والنهاية (٢٧٥/٧).

[2] صحيح البخاري (٨/١٣–مع الفتح) وصحيح مسلم (١٢/١٨–١٣–مع شرح النووي).

وە هەروەها ئەبوسەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە (عامری کوڕی یاسر)ی فەرموو: ﴿تَقتُلُكَ الفئةُ الباغية﴾[1]، واتە: (تۆ لەلایەن کۆمەڵێکی دەست درێژی کەرەوە دەکوژرێیت).

کە ئەمەش دەقێکی ڕوون و ئاشکرایە لە زمانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئیمامی عەلی لەسەر حەق بووەو معاویەو لەشکرەکەی هەرچەندە کافر نەبوون و لە ڕێی ئیسلام دەرنەچوون، بەڵام باغی و دەست درێژی کەربوون و غەدریان لە ئیمامی عەلی کرددوە، چونکە عەماری کوڕی یاسر بەدەستی ئەوان کوژرا، هەر بۆیەش ئیمامی عەلی لەدوای شەڕەکە داوای ڕەحمەتی بۆ کوژراوانی هەردوولا لەشکرەکەی خۆی و معاویە دەکرد و دەی ووت ئەوانە برامانن بەڵام غەدریان لێکردین.

## شەشەم/ سەرهەڵدانی فیتنەی (خەوارج)و جەنگی (نهروان):

پاش گەڕانەوەی ئیمامی عەلی بەخۆی و سوپاکەیەوە بۆ شاری کوفە (١٢) هەزار کەس لەوانەی بەتەحکیم و ڕاگرتنی شەڕەکە ڕازی نەبوون لە سوپاکەی ئیمامی عەلی هەڵگەڕانەوە و دەیان ووت حوکم دەبێت تەنها بۆ خوا بێت، بەڵام ئیمامی عەلی بە حەکمی چەند کەسێك ڕازیبووە نەك بە حەکمی خوا، بۆیە پێیان وابوو ئیمامی عەلی کافر بووەو لە دینی ئیسلام چۆتە دەرەوەو دەبێت شەڕی لەگەڵدا بکرێت، چونکە لەدین وەرگەڕاوەو (مرتد)بووە، ئەم کۆمەڵەش کە لە ئیمامی عەلی هەڵگەڕانەوە ناونران (خوارج) وە لەناو خۆیاندا (عبداللە کوڕی وەهبی راسبی)یان هەڵبژارد بەسەرکردەی خۆیان ئیمامی عەلیش بەمەبەستی ئەوەی فیتنەکەیان گەورە نەبێت و بیانگێڕێتەوە بۆ ڕاستەڕێی کۆمەڵی موسڵمانان هەستا بەناردنی (عبداللە ی کوڕی عباس) ڕەزای خوای لێبێت هەتا گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و بە بەڵگەوە بۆیان بسەلمێنێت کە هەڵەن، ئەویش ڕۆشتە لایانو سێ ڕۆژ لەناویاندا مایەوەو بەردەوام قسەی بۆ دەکردنو بەڵگەی بۆ دەهێنانەوە، تالەکۆتایدا توانی نیوەیان قەناعەت پێبکات و بیانگێڕێتەوە ڕزی سوپاکەی ئیمامی عەلی و کۆمەڵی موسڵمانان بەڵام نیوەکەی تریان هەر سور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان، ئیمامی عەلیش جوابی بۆ ناردن و پێی ووتن: (بيننا وبينكم أن لا تسفكوا دما حراما، ولا تقطعوا سبيلا، ولا تظلموا ذميا، ونحن لا نمنعكم مساجد الله، ولا نبدؤكم بقتال حتى تبدؤنا)[1]، واتە: (ئێوە بەڕێی خۆتان و ئێمە بەڕێی خۆمان، بە

---

[1] صحيح البخاري، وفي صحيح مسلم (٢٢١٤/٤) رقم (٢٨٨٨).

[1] البداية والنهاية (٢٨١/٧).

مەرجێك خوێنی كەس بەناحەق نەڕێژن و ڕێگەی كەس نەگرن و زوڵمیش لەكەس نەكەن، ئێمەش ڕێگەی ماڵی خواتان لێ ناگرین و شەڕتان لەگەڵ ناكەین تا ئێوە شەڕمان لەگەڵ نەكەن).

پاشان ئەوانەی كە مابوون لە (خوارج)ەكان لە (نهروان) كۆبوونەوەو سوپایەكی چەكداریان دروست كرد و دەستیان كرد بە زوڵم و ڕێگرتن لە موسڵمانان و خوێن ڕشتنی خەڵك بەناحەق، وە یەكەم تاوان كە ئەنجامیاندا ئەوەبوو كە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) كە ناوی (عبدالله ی كوڕی خەبابی كوڕی ئەرەت)بوو خۆی و خێزانەكەی كە سكی هەبوو بەلایاندا تێپەڕی، گرتیان خۆی و ژنەكەیان سەربڕی و سكی ژنەكەشیان هەڵدڕی[1]

ئەم كارە نارەوایانە ئیمامی عەلی ناچاركرد بەڕێبكەوێت بۆ تەمێ كردنیان وە جێبەجێ كردنی حەدی شەرعی لەسەریان، كاتێك بە سوپاكەیەوە گەیشتە (نهروان) خۆی و (ئەبو ئیوبی ئەنصاری) بۆ ماوەیەكی زۆر ووت و وێژی لەگەڵدا كردن، بەڵام نەگەڕانەوەو سودی نەبوو، پاش ئەوە ئەبوئەیوب ئاڵایەكی بەرزكردەوەو ووتی هەركەس بێتە لای ئەم ئاڵایە دڵنیابێت هچی لێناكەین بۆ كێ دەڕوات بابڕوات، ئێمە تەنها شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا دەكەین كە ئەو تاوانەیان كردوەو خوێنی ناحەقیان ڕشتووە، بەمەش خەڵكێكی زۆر لە (خوارج)ەكان جیابوونەوەو تەنها هەزار كەسیان مایەوە، پاشان شەڕ دەستی پێكردو هەر زوو (خوارج)ەكان شكان و بەشی زۆری سەركردەكانیان كوژران.

پێغەمبەری ئەكرەمیش(ﷺ) لەچەند فەرمودەدا ئاماژەی بە سەرهەڵدانی كۆمەڵەی (خوارج) كردووەو باسی سیفەتەكانی ئەو كۆمەڵەشی كردووە كە چۆن قورئان دەخوێنن بەڵام خوای گەورە لێیان قبوڵ ناكات، چونكە بەپێی ئارەزووی خۆیان ماناكەی لێكدەدەنەوەو چۆن لەفەرمانی خەلیفە دەردەچن و چۆن خوێنی موسڵمانان دەڕێژن و فەرمانی بەكوشتنیان كردووەو كوشتنیشیان بەخێرێكی گەورە لەقەڵەم دەدات.

(زیدی كوڕی وەهبی جوهەنی) كە یەكێك بوو لە ئەندامانی لەشكرەكەی ئیمامی عەلی لە شەڕی (خەوارج)دا دەگەڕێتەوە كە ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: (يَخْرُجُ قومٌ مِن أُمتي يقرءونَ القرآن ليس قراءتكم إلى قِراءَتِهم بشيء ولا صلاتُكُم إلى صلاتِهِم بشيء ولا صيامُكُم إلى صيامِهِم بشيء يقرءون القرآنَ يحسبونَ أنهُ لَهُم وَهوَ عَلَيهِم)[2]،واتە: (كۆمەڵێك دەردەچن لە ئومەتەكەم، قورئان دەخوێنن، قورئان خوێندنی ئێوە لەچاو قورئان خوێندنی ئەواندا هیچ نیە، و نوێژەكانیشتان لەچاو نوێژی ئەوان هیچ نیە، ڕۆژووشتان لە چاو

[1] البداية والنهاية (٧/٢٨٨).
[2] صحيح مسلم (٢/٧٤٨).

ڕۆژووی ئەواندا هیچ نیە، قورئان دەخوێنن پێیان وایە قورئان لەگەڵ ئەوانە، بەڵام لە ڕاستیدا لەسەر ئەوانە).

پاشان ئیمامی عەلی فەرمووی: (ئەو سوپایەی کە شەڕیان لەگەڵدا دەکات ئەگەر دەیانزانی چ خێرێکیان لای خوای گەورە بۆ دەنوسرێت ئەوا تەوەکولیان دەکردە سەر کارەکەیان"واتە بۆبەدەست هێنانی بەهەشت" نیشانەی ئەو کۆمەڵە خەوارێجەش ئەوەیە کەپیاوێکیان تێدایە قولێکی باسکی پێوەنییەو لە کۆتایی قۆڵەکەشیدا گۆیەکی وەك گۆی مەمکی پێوەیە، چەند موویەکی سپی لەسەرە).

(زیدی کوڕی وهب) دەڵێت کاتێك شەڕەکە کۆتایی پێهات و (خوارج)ەکان شکان، ئیمامی عەلی فەرمووی: (بگەڕێن بەدوای پیاوە نیوقۆڵەکەدا)، ئەوانیش گەڕان بەڵام نەیاندۆزیەوە، پاشان ئیمامی عەلی خۆی هەستا بەناو کوژراوەکانیاندا گەڕا، کۆمەڵێك جەنازەی بینی سەریەکدا کەوتبوون،فەرمووی لەسەریەکیان لابەرن، کەسەیریانکرد پیاوە نیو قۆڵەکە لەژێریاندا بەکوژراوی کەوتووە.

کە ئیمامی عەلی پیاوەکەی بە کوژراوی بینی تەکبیری کرد و فەرمووی خوای گەورە ڕاستی فەرمووەو پێغەمبەرەکەشی بە ئەمانەت هەواڵەکەی گەیاندووە، ئا لەم کاتەدا (عوبەیدەی سەلمانی) هەستاو ووتی بە ئیمامی عەلی: (ئەی سەرکردەی موسڵمانان تو ئەو خوایە کە هیچ خوایەك نیە غەیری ئەو نەبێت، تۆ ئەمەت لە پێغەمبەر(ﷺ) گوێ لێبووە؟) ئیمامی عەلیش فەرمووی: (ئەرێ بەوخوایەی کە هیچ خوایەك نیە لە غەیری ئەو نەبێت بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستوە)[1]

هەروەها (سوەیدی کوڕی غەفلە) دەگێڕێتەوە کە ئیمامی عەلی فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (سيخرج قوم في آخر الزمان أحداث الأسنان سفهاء الأحلام يقولون من خير قول البرية يقرؤن القرآن لا يجاوزُ حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية فأينما لقيتموهم فاقتلوهم فإن في قتلهم أجرا لمن قتلهم يوم القيامة)[1]، واتە: (کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم دەردەچن بە تەمەن منداڵن و خەون و ئاواتی بێ نرخیان هەیە و فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێنەوەو قورئان دەخوێنن بەڵام لە قورقوڕاگەیان تێپەڕ ناکات، چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێت ئاوالەدین دەردەچن، ئەگەر پێیان گەیشتن بیانکوژن، چونکە کوشتنیان لە ڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورە خێرێکی زۆر گەورەی تێدایە).

---

[1] صحيح مسلم (٧٤٨/٢) و (البداية و النهاية)(٢٩١/٧).

[1] صحيح البخاري (٢٨٣/١٢-مع الفتح) و صحيح مسلم (١٦٩/٧-مع شرح النووي).

بهەمان شێوە (ئەبوسەعیدی خودری) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دوای یەکێك لە غەزاکان دەست کەوتەکانی بەسەر موجاهیدەکاندا بەش دەکرد، کابرایەك ناوی (ذو الخويصرة التميمي) بوو هات و ووتی: (أعدل يا رسول الله) واتە (عادل بە ئەی پێغەمبەری خوا)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ﴿ويلك ومن يعدلُ إذا لم أعدِل﴾، واتە: (قوڕبەسەرت، جا کێ عادل دەبێت ئەگەر من عادل نەبم)، عومەری کوڕی خەتابیش ووتی: ڕێگەم بدە ئەی پێغەمبەری توخوا با لەملی بدەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿دعه فإن أصحابا يحقر أحدكم صلاته مع صلاتهم وصيامه مع صيامهم ويقرؤن القرآن لا يجاوز تراقيهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية، آيتهم رجل أسود إحدى عضديه مثل ثدي المرأة أو مثل البضعة تدردر ويخرجون على حِينِ فُرقة من الناس﴾[٢]، واتە: (وازی لێبێنە، ئەمە کۆمەڵێکی لەگەڵدایە هێندە نوێژکەر و ڕۆژووگرن، نوێژ و ڕۆژووی خۆتان پێ هیچ نیە لەچاو نوێژ و ڕۆژووی ئەواندا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا چۆن تیر لەنێچیر دەردەچێت ئاوا لە دین دەردەچن.. نیشانەکەشیان ئەوەیە کە پیاوێکی ڕەشیان لەگەڵدایە، دەستێکی وەك مەمکی ئافرەت وایە یان وەك پارچەگۆشتێك وایە دەلەرێتەوە، لەکاتێکدا دەردەچن کە ناکۆکی و پەرت بوون لەنێوان خولکدا هەیە).

ئەبوسەعیدی خودری دەڵێت: شایەتی ئەدەم کە ئەمەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووەو شایەتیش ئەدەم کە ئیمامی عەلی کاتێك هەستا بەکوشتنیان و خۆشی لەگەڵدابوو، ئەو پیاوەیان بە کوژراوی هێنا بەو شێوەیەی کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردبوو.

وە هەر ئەبوسەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ﴿تمرق مارقة عند فرقة من المسلمين يقتلها أولى الطائفتين بالحق﴾[١]، واتە: (کۆمەڵێك دەرچوو لەکاتی ناکۆکیەك لەنێوان موسڵماناندا دەردەچن، ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی کە زیاتر لە حەقەوە نزیکن ئەوان دەیانکوژن).

ناکۆکیەکەش مەبەست پێی ناکۆکی نێوان ئیمامی عەلی و معاویە بوو، وە ئەو کۆمەڵەش کەهەستا بەکوشتنیان کۆمەڵەکەی ئیمامی عەلی بوو، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵەکەی ئیمامی عەلی زیاتر لەسەر حەق بوو وەك لە کۆمەڵەکەی معاویە، هەرچەندە پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو کۆمەڵەکەی ئیمامی عەلی و معاویەی بە موسڵمان ناو هێناوە.

---

[٢] صحيح البخاري و مسلم، وفي صحيح مسلم(٢/٧٤٤-٧٤٥).

[١] صحيح مسلم (٧/١٦٨-مع شرح النووي).

پاش ئەم ڕووداوانەو لەناوبردنی خەوارجەکان سێ کەسی داخ لەدڵ لە پاشماوەی (خەوارج)ەکان کە بریتی بوون لە (عبدالرحمن کوڕی ملجم و بەرکی کوڕی عبداللە ی تەمیمی و عەمری کوڕی بەکری تەمیمی) لەگەڵ یەکتر کۆبوونەوە و بڕیاریاندا هەریەکەیان یەکێك لەسەرکردەکانی ئەوکاتەی موسڵمانان بکوژێت و داخی دڵی خۆیان بڕێژن، وە ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە عبدالرحمن کوڕی ملجم ئیمامی عەلی بکوژێت و بەرکی کوڕی عبداللە ی تەمیمیش معاویە بکوژێت و عەمری کوڕی بەکری تەمیمیش هەستێت بە کوشتنی عەمری کوڕی عاص، کەئەو کاتە ئەمیری میسر بوو. بۆ ئەم مەبەستەش بڕیاریان دا کاتی جێبەجێکردنی پیلانەکە بۆتیرۆرکردنی هەرسێ سەرکردە کاتی نوێژی بەیانی هەڤدەی ڕەمەزان بێت، پاشان بەڕێکەوتن بەرەو کوفەو شام و میسر بۆ ئەنجام دانی پیلانەکەیان. وە لە کات و ڕۆژی دیاری کراودا (بەرکی تەمیمی) لە ڕێگەی مزگەوتدا بەخەنجەرێکی ژەهراوی دای لە معاویەو بریندارى کرد، بەڵام معاویە چاك بووەوە و نەمرد و بەرکی تەمیمیش گیراو کوژرا.

عەمری کوڕی عاصیش لەمیسر بە قەدەری خوا ئەو ڕۆژە نەخۆش بوو نەیتوانی بچێتە مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی و پێش نوێژی بۆ خەڵك بكات، بۆیە (خارجەی کوڕی ئەبی حەبیبەی عامری) لە جێی خۆی ڕاسپارد بۆ پێشنوێژی، (عەمری تەمیمیش) نویزانی کە ئەو (عەمری کوڕی عاص) نیە، بە خەنجەرە ژەهراویەکەی لە میرابەکەدا لێی داو کوشتی و خەڵکەکەش گرتیان و کوشتیانەوە.

(عبدالرحمن کوڕی ملجم)یش لە ڕێگەی مزگەوتدا فرسەتی لە ئیمامی عەلی هێنا لە کاتێکدا کە خەڵکی خەبەر دەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی، لەناو دەرگای مزگەوتەکەدا بە شمشێرێکی ژەهراوی دای لەسەری ئیمامی عەلی و سێ ڕۆژ بە برینداری مایەوە، تا لە شەوی یەك شەممەی ڕێکەوتی نۆزدەی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچی بە پلەی شەهادەت گەیشت، ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێت[1]

## حەوتەم/ دابەزینی ئیمام حەسەن لە خەلیفایەتی بۆ معاویە:

پاش شەهیدکردنی ئیمامی عەلی بەیعە درا بە ئیمامی (حسن)ی کوڕی و کرا بە خەلیفە، ئیمامی حەسەنیش ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت هەر لە ژیانی باوکیدا هانی باوکی دەدا بەرێگەچارەی شەڕ کێشەکان حەل نەکات، وە ئەو جەنگە نێوخۆییانەی موسڵمانانی بە فیتنەیەکی گەورە دەزانی

[1] البداية والنهاية (٣٢٦/٧-٣٣١) والخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والأستشهاد(٢٨٤-٢٩٠).

کەهەیبەت و پاشەڕۆژی دەوڵەتی ئیسلامی خستبووە مەترسییەوە، هەرچەندە دەیزانی کە باوکی لەسەر حەقە، وە خەفەتێکی زۆری بەو جەنگە خوێناوییانە دەخوارد لەنێوان سەحابەکاندا.

وە لەلایەکی تریشەوە متمانەی نەبوو بە خەڵکی کوفەو عێراق و دەیزانی هەر ئەوان هۆکاری سەرەکی هەموو فیتنەکانن و چەندین جار باوکیان دەستخەڕۆ کردبوو وە لە کاتی تەنگانەدا پشتیان لێ هەڵکردبوو، بۆیە دەترسا خۆشی وەك باوکی لێ بکەن، وە متمانەی ئەوەی پێ نەدەکردن تا سەر پشتگیری لێ بکەن دژی معاویە، بۆیە پاش شەش مانگ لە وەرگرتنی خەلافەت، تەنازولی لێ کرد بۆمعاویە و خۆشی بەیعەتی دا بە معاویەو ئیتر موسڵمانان بە گشتی بەیعەتیاندا معاویەو ناکۆکی و دووبەرەکی کۆتایی پێهات و موسڵمانان هەموو یەك ڕیز و یەك دەنگ بوونەوەو ئەو ساڵەش ناونرا ساڵی (الجماعة).

وە بەکۆتایی هاتن بە خەلافەتی ئیمام (حسن) ڕەزای خوای لێبێت خەلافەتی ڕاشدی کۆتایی پێهات کەسی ساڵی ڕێکی خایاند، پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەوە فەرموویەتی: ﴿الخلافة بعدي ثلاثون سنة ثم ملك بعد ذلك﴾[1]، واتە: (خەلیفایەتی لەدوای من سی ساڵ دەخایەنێت پاش ئەوە دەبێت بە پادشایەتی).

بەڕاستی ئەم فەرمودەیە لە بەڵگەکانی ڕاستی پێغەمبەرایەتی (محمد)ە(ﷺ) کە لە سەرزەمینی واقعدا هاتەدی، چونکە ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێبێت لەمانگی (ربیع الأول)ی ساڵی (١١)ی کۆچیدا بوو بەخەلیفە، ئیمامی حەسەنیش لە مانگی (ربیع الأول)ی ساڵی (٤١)ی کۆچیدا دەستی لە خەلافەت هەڵگرت بۆ معاویە کە ئەم ماوەیش (٣٠) ساڵی ڕێك دەکات[2]

سەبارەت بە دابەزینی ئیمام حەسەنیش لە خەلافەتی بۆ معاویە: حەسەنی بەسری دەگێڕێتەوەو دەڵێت بیستوومە لە (ابابکر) نەفعی کوڕی حارث ڕەزای خوای لێبێت دەیووت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی لەسەر مینبەر و حەسەنی کوڕی عەلیش لە تەنیشتیەوە بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) جارێك سەیری خەڵکەکەی کرد و جارێکیش سەیری حەسەن و دەیفەرموو: ﴿إن إبني هذا سيد ولعل الله أن يصلح به بين فيئتين عظمتين من المسلمين﴾[3]، واتە: (ئەم کوڕەی من سەرکردەو ڕێزدارە، بەڵکو خوای گەورەش دوو کۆمەڵەی گەورەی موسڵمانان لەسەر دەستیدا یەك بخات).

---

[1] رواه الترمذي وأبوداود وأحمد وابن حبان والطيالسي الطبراني وقال الترمذي هذا حديث حسن صحيح وقال الألباني في صحيح سنن الترمذي (صحيح)(٤٨٦/٢) رقم (٢٢٢٦).

[2] الخلفاء الراشدون بين الإستخلاف والإستشهاد ص٢٩٤.

[3] صحيح البخاري رقم (٢٥٠٥).

بەڵێ فەرمودەکەی پێغەمبەری ئەکرەم(ﷺ) هاتەدی و خوای گەورە لەسەر دەستی ئیمام حەسەن دا کۆتایی بەو فیتنە خوێناویە هێناو ئاگری شەڕی پێ کوژاندەوە، هەزاران ڕەحمەتی خوا لەخۆی و باوکی و هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بێت.

## هەشتەم/ گەیشتنی ئیسلام بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژی ڕۆژئاوا:

پێغەمبەری پێشەوامان صەلات‌و سەلامی خوای لەسەربێت زۆرجار لە فەرمودە پیرۆزەکانیدا مژدەی ئەوەی داوە بە ئومەتەکەی کە ئەم ئیسلامە سنوری دورگەی عەرەب دەشکێنێت و دەگاتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهان و مژدەشی پێداون کە هەردوو دەوڵەتە زل هێزەکەی ئەو کاتەی جیهان کە دەوڵەتی فارس و ڕۆم بوون لەسەر دەستی ئەوان دەشکێت و چۆك دادەدەن بۆ موسڵمانان.

(نافعی کوڕی عتبە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ﴿تغزونَ جزيرة العرب فيفتحها الله ثم فارس فيفتحها الله ثم تغزون الروم فيفتحها الله ثم تغزون الدجال فيفتحه الله﴾[1]، واتە: (غەزای دورگەی عەرەبی دەکەن خوای گەورە ئازادی، پاشان وڵاتی فارس خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای دەجال دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات).

وە (ثوبان)یش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن الله زوي لي الأرض فرأيت مشارقها و مغاربها وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوي لي منها وأعطيت الكنزين الأحمر والأبيض﴾[2] ، واتە: (خوای گەورە زەوی بۆ کۆکردمەوەو هەتا هەموو ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاواکانیم بینی، وە موڵك و دەسەڵاتی ئومەتەکەی من هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە بۆ کۆکرایەوە، وە هەردوو کەنزوکەشم پێبەخشرا، سور و سپی).

ئەگەر جوان تێبینی فەرمودەکە بکەین دەبینین کە پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی ئەوە بە ئومەتەکەی دەدات کە خوای گەورە موڵکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان پێدەبەخشێت، بەڵام باسی باکور و باشوری نەکردووە، وە ئەوەبوو پاش ماوەیەکی کەم لە وەفاتی خۆی ڕاستی ئەم فەرمودە پیرۆزە هاتەدی و دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی لەوسەری ڕۆژهەڵاتەوە لە چین و ئۆقیانوسی ئارامەوە

[1] رواه مسلم (٤/٢٢٢٥)حديث رقم (٢٩٠٠).
[2] رواه مسلم (٤/٢٢١٥) حديث رقم (٢٨٨٩).

گەیشتە ئەوسەری ڕۆژئاوا تا مەغریب و ئۆقیانوسی ئەتلەسی، وە مەبەستیشی لە کەنزی سور و سپی سەروەت و سامانی فارس و ڕۆمە کە خوای گەورە بەم ئومەتەی بەخشی.

وە لە فەرمودەیەکی تریشدا کە (ابوهریرە) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەری(ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ﴿إذا هلك كسرى فلا كِسرى بعده وإذا هلك قَيصَر بعده والذي نفسي بيده لَتُنفَقنَ كُنُوزهُما في سبيل الله﴾[1]، واتە: (ئەگەر کیسرا لەناوچوو ئیتر کیسرای تری بەدوایدا نایەت، وە ئەگەر قەیسەریش لەناوچوو ئیتر قەیسەری تری بەدوادا نایەت، وە سوێندیش بەوە کە گیانی محمدی بەدەستە خەزێنەکانی هەردوکیان لەڕێی خودا سەرف دەکەن).

بەڵێ ئەم مژدەیەش وەکو هەموو مژدەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) بەڕوون و ئاشکرایی هاتەدی، ئەوەبوو لەدوای کوژرانی کیسرا ئیتر نەدەوڵەتی کیسرا و نەکیسرایەتی بۆ هەتاهەتایە نەما کە پێشتر زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بەردەوام بوو، وە لە دوای مردنی قەیسەریش بۆ هەتاهەتایە ڕۆم کە زیاترلە دووهەزار ساڵ دەوامی هەبوو نەما و کۆتایی پێهات و دووبارە نەبووەوە.

وە لە فەرمودەیەکی تردا کە (عدی کوڕی حاتم) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە دەڵێت: جارێکیان من لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بووم، پیاوێك لەوکاتەدا هاتە خزمەتی و سکاڵای نەبوونی و فەقیرحاڵی خۆی بۆ کرد، پاشان یەکێکی تر هات و سکاڵای زۆری چەتەو ڕێگری بۆکرد، دەڵێت پێغەمبەریش(ﷺ) بەمنی فەرموو: ﴿يا عدي هل رأيتَ الحيرَةَ؟ قلتُ: لم أرَها وقد أُنبِئتُ عنها، قال: فإن طالَت بك حياةٌ لترَيَن الظعينَةَ ترتَحِلُ من الحيرةِ حتى تطوف بالكعبة لاتخافُ أحَداً الا الله، قُلتُ: فيما بَيني وَبَينَ نَفسي فَأَينَ دُعارُ طَيءٍ الذينَ قَد سَعَروا البِلادَ، وَلَئن طالَت بِكَ حياة لَتفتَحَن كنوزُ كِسرى، قُلتُ: كسرى بن هُرمُز؟ قال: كسرى بن هُرمُز، ولئن طالت بك حياة لترين الرجلَ يُخرِجُ مِلءِ كفه من ذهب أو فضة يَطلُبُ من يَقبَلُهُ منه فلا يجدُ أحدا يقبله منه... قال عدي: فرأيت الظعينة ترتحل من الحيرة حتى تطوف بالكعبة لاتخاف الا الله وكنتُ فيمَن افتتح كنوز كسرى بن هُرمُز ولئن طالت بكم حياة لترَوُن ما قال النبي أبو القاسم(ﷺ) يخرج ملء كفه....﴾[1]، واتە: (ئەی عەدی، ئایا شاری (حیرە)ت بینیوە؟ وتم: نەمبینیوە، بەڵام بۆیان باس کردوم، فەرموی: دەی ئەگەر ژیانت درێژە بخایەنێت ئافرەتی ناو کەژاوەکە دەبینیت لە حیرەوە بەڕێ دەکەوێت هەتا تەواف بەدەوری کەعبەدا دەکات لە کەس ناترسێت غەیری خوا نەبێت، -منیش لە دڵی خۆمدا وتم: ئەی چەتەکانی خێڵی (طيء) لەکوێ دەبن کەدوونیایان ورروژاندووە-، وە ئەگەر ژیانت درێژە بخایەنێت دەبینیت کە

---

[1] صحيح البخاري حديث رقم (٣٦١٨) فتح الباري (٦/٦٢٥).

[1] صحيح البخاري حديث رقم (٣٥٩٥) فتح الباري (٦/٦١٠).

خەزێنەکانی کیسرا ئازاد دەکرێن، ووتم: کیسرای کوڕی هورمز؟ فەرمووی بەڵێ کیسرای کوڕی هورمز، وە ئەگەر ژیانت درێژە بخایەنێت وای لێدێت پیاو دەبینیت مشتی پڕ لە ئاڵتون یان زیوە داوا دەکات یەکێك لێی وەربگرێت، کەسی دەست ناکەوێت لێی وەرگرێت).

عدی پاش گێڕانەوەی فەرمودەکە دەڵێت: دەی بینیم ئافرەت لەناو کەژاوەدا لە حیرەوە بەڕێدەکەوت تا دەگەیشتە کەعبەو تەوافی بەدەوردا دەکرد لەخوا نەبێت ترسی کەسی تری نەبوو، وە خۆشم یەکێك بووم لەوانەی کە خەزێنەکانی کیسرای کوڕی هورمزیان ئازادکرد، وە ئەگەر ژیانیشتان درێژەبخایەنێت ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی دەیبینن پیاو پڕ بەمشتی ئاڵتون و زیوە هاوار دەکات کەس لێی وەرناگرێت).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا (خبابی کوڕی ارت) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿والله ليتمن هذا الأمر حتى يسير الراكب من صنعاء إلى حضرموت لا يخاف إلا الله أو الذئب على غَنَمِهِ ولكنكم تستعجلون﴾[٢]، واتە: (سوێند بەخوا، خوای گەورە ئەم کارە دەکات و بەجێی دەگەیەنێت هەتا وای لێدێت وڵاخ لە شاری (صنعاء) تا شاری (حضرموت) دەڕوات لەغەیری خوا ترسی کەسی تری نابێت و گورگیش بەسەر مەڕەکانیەوە دەبێت، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن).

هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی ئازادکردنی هیندستانیش بە موسڵمانان دەدات، ئەوەتا لە فەرمودەیەکدا کە (ثوبان) ڕەزای خوای لێبێت ڕیوایەتی دەکات دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿عِصابتان من أمتي أحرزهما الله من النار عِصابةٌ تغزو الهند وعِصابة تكون مع عيسى ابن مريم عليهما السلام﴾[١]، واتە: (دوو دەستەو کۆمەڵ لە ئومەتەکەم خوای گەورە لە ئاگر پارێزراوی کردون، کۆمەڵێکیان غەزای هیند دەکەن، کۆمەڵێك لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا دەبن).

بەڵێ بۆ یەکەمجار سوپای ئیسلام لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا گەیشتە وڵاتی هیند و ئیسلامیان بەو وڵاتە گەیاند و بەشی زۆری هیندستانیان ئازادکرد، وە جارێکی تریش لە سەردەمی محمدی مەهدی دا ئەو وڵاتە لەسەردەستی لەشکری ئیسلام ئازاد دەکرێتەوە بە پشتیوانی خوا.

بەڵێ مژدەی ڕاستی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿لَيَبلُغَن هذا الأمر ما بَلَغَ الليل والنهار ولا يتْرُكُ اللهُ بيت مدر ولا وبر إلا أدخَلَهُ هذا الدين بعز عزيز أو بِذُلِّ ذليلٍ عِزا يُعِز به الإسلام وذلا يُذِلُ

---

[٢] صحيح البخاري، حديث رقم (٣٦١٢) فتح الباري (٦/٦١٩).

[١] رواه النسائي واحمد باسناد قوي، سلسلة الأحاديث الصحيحة (٤/٥٧٠) حديث رقم (١٩٣٤).

الله به الكفر﴾[1]، واته: (هەر شوێنێك شەو و ڕۆژی بگاتێ، ئەم دینەشی دەگاتێ، وە خوای گەورە هیچ ماڵێکە دروستکراو لەبەرد یان لە موو نامێنێت ئیلا ئەم دینەی هەر تێدەخات، بەسەربەرزکردنی سەربەرزێك یان بە ملکەچ پێکردنی ملکەچێك، سەربەرزیەك کە خوای گەورە ئەم ئیسلامەی پێ سەربەرز دەکات، وەزەلیلیەك کە خوای گەورە کوفری پێ زەلیل و ملکەچ دەکات).

## نۆیەم/ گڕکانێك لە حیجاز ڕوودەدات:

(ابو هريره) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى تخرجَ نار من أرضِ الحجاز تُضيء أعناق الإبل بِبُصرى﴾[2].واته: (قیامەت هەڵناسێت هەتائاگرێك لە خاکی حیجاز دێتە دەر ملی حوشتر لە بوصرا بریقەی پێدەداتەوە).

ئەم نیشانە گەورەیەش کە پێغەمبەری ڕاستگۆ(ﷺ) هەواڵی پێداوین لە ساڵی (٦٥٤)ی کۆچیدا ڕوویدا، هەروەك (ئیمام شهاب الدین ابو شامەی مەقدیسی) لە کتێبی (الذیل وشرحه) دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: (لە شەوی چوارشەممە ڕێکەوتی (٣)ی جەمادی دووەمی ساڵی (٦٥٤)ی کۆچی لە شاری مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ) دەنگێکی گەورە هات، پاشان بومەلەرزەیەکی گەورەی بەدوادا هات کە دار و دیوار و دەرگای دەهەژاند و سەعات بە سەعاتیش بەردەوام بوو تا ڕۆژی جومعە، پاشان ئاگرێکی گەورە لە ناوچەی (حره)ی نزیك (قریظة) لە دورایی نیو ڕۆژە ڕێ لەشاری مەدینەوە لەچیاکان دەهاتە دەرەوەو بەرەو ئاسمان تا چاو بڕیدەکرد هەڵدەچوو، وە ئاگر و بەردی تواوەش وەکو ڕوبار جۆگەی گرتبوو، وە کڵپەو دوکەڵی ئاگرەکەش بەشێوەیەکی وا بەری ئاسمانی گرتبوو تەنانەت لە وڵاتی شامیش دەتگوت ڕۆژگیراوە).

وە دەڵێت: (کە قازی صدرالدین ی تەمیمی گەورەی قازیەکانی دیمەشق بۆی گێڕامەوە کە گوێم لێ بوو پیاوێك بۆ باوکمی دەگێڕایەوە کە لەو کاتەدا بۆ ماوەی چەند شەو ملی حوشترەکان لە شاری (بوصرا) کە شارێکی وڵاتی شامەو ئێستا پێی دەوترێت (حوران) دەبریقایەوە). کە ئەمەش ڕاستی هاتنەدی فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ).

## دەیەم/ شەڕکردن لەگەڵ توركدا:

(ابو هريره) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن من أشرط الساعة أن تقاتلوا قوماً ينتعلون نعال الشعر وإن من أشرط الساعة أن تقاتلوا قوما عِراض الوجوه كأن

---

[1] صحيح رواه أحمد وابن حبان، وسلسلة الأحاديث الصحيحة (٧/١) حديث رقم (٣).

[2] صحيح البخاري (٧٨/١٣-مع الفتح) و صحيح مسلم (٣٠/١٨-مع شرح النووي).

وجوههم المجان المطرقة﴾[1]، واته: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە شەڕ لەگەڵ میللەتێك دەکەن کە پێڵاوی لەموو دروستکراو لەپێ دەکەن، وە یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە شەڕ لەگەڵ میللەتێك دەکەن دەموچاویان پانە، دەموچاویان هەر دەڵێی قەڵغانی بەچەرم داپۆشراوە).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا کە هەر (ابو هریرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى تقاتلوا الترك صغار الأعين حُمر الوجوه ذلف الأنوف كأن وجوههم المجان المطرقة ولا تقوم الساعة حتى تقاتلوا قوما نعالهم الشعر﴾[2]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا شەڕ لەگەڵ تورکدا دەکەن، میللەتێکن چاویان بچوکو دەموچاویان سور، لوتیا کورتو پان، دەموچاویان هەر دەڵێی غەڵغانی بەچەرم داپۆشراوە، وە قیامەت هەڵناسێت هەتا شەڕ لەگەڵ میللەتێکدا دەکەن کە پێڵاوەکانیان لە موو دروستکراوە).

وە لە ڕیوایەتێکی تری بخاریدا: ﴿لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا خوزاً و كرمان من الأعاجم حُمر الوجوه...﴾[3]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت تا شەڕ لەگەڵ خوزوکرمان دەکەن، میللەتێکی عەجەمی دەموچاو سوورن...).

وە (عبدالله کوڕی بریدە)ش لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێت: (لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین، گوێمان لێ بوو دەیفەرموو: ﴿إن أُمتي يسوقها قوم عِراض الأوجه صغار الأعين كأن وجوههم الحجف ثلاث مِرار حتى يلحقوهم بجزيرة العرب أما السابقة الأولى فينجو من هرب منهم وأما الثانية فيهلك بعض وينجو بعض وأما الثالثة فيصطلون كلهم من بقي منهم قالوا يا نبي الله من هم قال هم الترك أما والذي نفسي بيده ليربطن خيولهم إلى سواري مساجد المسلمين﴾، واتە: (ئوممەتەکەم لەلایەن کۆمەڵێکی دەموچاو پانەوە ڕاپێچ دەکرێن چاوەکانیان بچوکە، دەموچاویان دەڵێی قەڵغانە (سێ جار)، تەنانەت لە دورگەی عەرەبیشدا شوێنیان دەکەون و ڕاویان دەنێن، لەجاری یەکەمدا هەرکەسێك هەڵبێت و ڕابکات ڕزگاری دەبێت، وە لەدووەمدا هەندێك تیادەچن و هەندێك ڕزگاریان دەبێت، بەڵام لەسێیەمدا هەموو ئەوانە کە دەمێننەوە دروێنەو قەلاچۆ دەکرێن، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟ فەرمووی ئەوانە تورکن، ئینجا فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە وڵاخ و ئەسپەکانیان بەدیواری مزگەوتی موسڵمانانەوە دەبەستنەوە).

---

[1] رواه البخاري (٦/١٠٣-مع الفتح) ورواه مسلم (٤/٢٢٣٣) حديث رقم (٢٩١٢).

[2] رواه البخاري ورواه مسلم (١٨/٣٨-مع شرح النووي) واللفظ للبخاري.

[3] صحيح البخاري (٦/٦٠٤-مع الفتح).

پاش گێڕانەوەی فەرمودەکە عبداللە دەڵێت: هەر بۆیە (بریدە)ی باوکم هەمیشە دوو ولاخی بە بار و کۆچەوە ئامادەبوو بۆ ڕاکردن لە ترسی ئەو نەهامەتیەی کە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستبوو کە دووچاری ئومەتەکەی دەبێت لەسەر دەستی ئەو تورکانەدا.

بەڵێ لەم فەرمودە پیرۆزانەدا پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) بە ئومەتەکەی ڕادەگەیەنێت کە قیامەت هەڵناسێت هەتا شەڕ لەگەڵ میللەتێکدا دەکەن کە ڕوخساریان چاو بچوك و لوت کورت و پان و دەموچاو سوور، دەموچاویان دەڵێی قەڵغانە کە بە پێستە و چەرم قات قات داپۆشراوە، پێڵاوەکانیشیان لە موی مەڕ و ماڵات دروستکراوە، هەروەکو کلاشی کوردی ئەمڕۆی خۆمان، ئەو میللەتەش میللەتی تورکە، وە تورکیش کاتی خۆی بەو میللەتە دەوترا کە خەڵکی وولاتی مەنغۆلیا و قەفقاسیا و سنورەکانی ئەمڕۆی ڕوسیا لەگەڵ چین و یاباندا، کە کاتی خۆی بەومەملەکەتانە دەوترا (خوزوکرمان)، وە ڕوخساری دەموچاوی خەڵکەکەی جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕوخساری خەڵکی تردا، تەنانە تورکەکانی ئەمڕۆش بەڕچەڵەك دەچنەوە سەر خەڵکی ئەو ناوچانەو نزیکەی (٨٠٠) ساڵ پێش ئێستا لە ناوچەکانی خۆیانەوە کۆچیان کردووە بەرەو ڕۆژئاوا لەشوێنی تورکیای ئەومڕۆدا نیشتەجێ بورن و هەتا ئەمڕۆش هەر بە تورك ناودەبرێن.

وە لە ڕاستیدا فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی هاتەدی، وە ئومەتی ئیسلام نزیکەی یەك سەدە شەڕی لەگەڵ ئەم تورکانەدا کرد، سەرەتا لە هێرشەکانی جەنگیزخانی یەکەم سەرکردەی تەتار و مەغۆلەکانەوە دەستی پێکرد بۆ سەر مەملەکەتی خورازم شا لە ئەفغانستان، دواتر پەلاماردانی ئێران و داگیرکردنی، پاشان بەسەرکردایەتی (هۆلاکۆ)ی کوڕەزای جەنگیزخان ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی ڕوویان کردە شاری بەغدادی پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی و ئەوێشیان داگیرکرد و خەلیفەی موسڵمانانیان کوشت و کۆتاییان بە خەلافەتی عەباسی هێناو نەهامەتیەکی هێندە گەورەیان بەسەر ئومەتی ئیسلامدا هێنا کە لە مێژووی خۆیدا شتی وای بەسەردا نەهاتبوو، هەرشارو مەملەکەتێکیش کە داگیریان دەکرد پاش قەتڵ و عام کردنی هەموو خەڵکەکەی تەخت و تاراجی شارەکەیان بەسەریەکدا دەڕوخاند و دەیان سوتاند، بەجۆرێك کە تەنها لە شاری (بەغداد)دا زیاتر لە یەك ملیۆن موسڵمانانیان کوشت، هەتا دواتر لە وولاتی شام لەسەر دەستی سەرکردەیەکی ئیسلامی بەناوی (سیف الدین قطز)ەوە موسڵمانەکان توانیان لە جەنگی (عین جالوت)دا بیانشکێنن و کۆتایی بە لاپەڕەی ڕەشیان بهێنن لە مێژوودا.

وە ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێبێت کە هاوچەرخی شەڕی موسڵمانەکان بووە لەگەڵ ئەو تورکانەدا لە شەرحی (صحیح مسلم)دا دەفەرموێت: (پێغەمبەر(ﷺ) چۆن وەسفی کردوون ئاوا

بەچاوی خۆمان بینیمانن، چاو بچوك و لوت پان و دەموچاو سور، پێڵاوەکانیشیان لە مووی مەڕ و ماڵاتەکانیان دروست کردبوو﴾[1]

وە صەلاتو سەلامی خواش لەسەر ئەو پێغەمبەرە بێت کە هیچ قسەیەکی لەخۆیەوە نەکردووە، بەڵکو هەمووی وەحی بوومو خوای گەورە بۆی ناردووە.

بەڵام هەر لێرەشدا حەزدەکەم ئاماژە بەوە بکەم کە ئیمام (ابن کثیر) لە تەفسیرە بەنرخەکەیدا لە تەفسیری ئایەتی: ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾[2]، واتە: (بانگەشە دەکرێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی میللەتێکی خاوەن زەبری توند، کەدەبێت شەڕیان لەگەڵدا بکەن یان موسڵمان بن)، دەڵێت کە (ابوهریرە) ڕەزای خوای لێبێت سەبارەت بەو میللەتە فەرموویەتی: (هم البارزون)[3] واتە: (ئەوانە بارزەکانن) پاشان دەڵێت کە لە تەفسیری فەرمودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ): ﴿تقاتلون قوماً نعالهم الشعر﴾ واتە: (شەڕ لەگەڵ میللەتێکدا دەکەن کە پێڵاوەکانیان لە مووی ئاژەڵ دروستکراوە)، (ابو هریرە) دەفەرموێت: (هم البارزون، يعني الأكراد) واتە: (ئەوانە بارزەکانن: مەبەست پێی کوردەکانە). جا ئەگەر لێکدانەوەو بۆچوونی (ابوهریرە) ڕەزای خوای لێبێت بۆ ئەو فەرمودەیە وەربگرین ئەوا دەبێت بڵێین بەشی یەکەمی فەرمودەکە کەباس لەمیللەتێکی چاو بچوکو لوت پانو دەموچاو قەڵغانیی دەکات، مەبەست پێی مەغۆلەکانە. وە بەشی دووەمیشی کە باس لە میللەتێك دەکات کە پێڵاوەکانیان لەمووی ئاژەڵەکانیان دروست کراوە مەبەست پێی میللەتی کوردە، بەتایبەتی میللەتی کورد کە هەتائەمڕۆش بەشێکی زۆری هەر کڵاش لەپێ دەکات کە لە مووی مەڕومالآت دروستکراوە، خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە.

## یانزیەم/ سەرهەڵدانی نزیکەی (٣٠) درۆزن کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن:

(ثوبان) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى تلحق قبائل من أمتي بالمشركين وحتى يعبدوا الأوثان وإنه سيكون في أمتي ثلاثون كذابون كلهم يزعم أنهُ نبي وأنا خاتم النبيين لا نبي بعدي﴾[4]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا چەند هۆزێك لە ئومەتەکەم

[1] شرح (صحيح مسلم) للأمام النووي (١٨/٣٧-٣٨) وفي جامع الأصول (١٠/٤٠٤).

[2] الفتح: (١٦).

[3] تفسير ابن كثير(٥،٦٢١) تحقيق عبدالرزاق مهدي، وفي صحيح البخاري رقم (٣٥٩١) وفي جمع الفوائد رقم (٩٨٦٩).

[4] سنن أبي داود(١١/٣٢٤-مع عون المعبود) والترمذي (٦/٤٦٦-مع تحفة الأحوذي) وقال هذا حديث صحيح، وقال الألباني (صحيح)، أنظر صحيح الجامع الصغير(٦/١٧٤) رقم(٧٢٩٥).

دەگەنەوە بەبێباوەڕەکان و دەچنەوە لایان، وە هەتا وای لێدێت بت دەپەرستنەوە، لە ئومەتەکەمدا سی درۆزنی تێدا پەیدا دەبێت، هەموویان لافی ئەوە لێدەدەن کە پێغەمبەرن، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم و لەدوای منیش پێغەمبەر نایەت).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا(ابوهریرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين كلهم يزعمُ أنه رسول الله﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا نزیکەی سی جادوگەری درۆن سەرهەڵدەدەن، هەموویان لافی ئەوە لێدەدەن کە پێغەمبەری خوان).

هەروەها (سمرەی کوڕی جندب) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکیدا بەهۆی خۆرگیرانەوە لەسەردەمی خۆیدا، تیایدا فەرمووی: (إنه والله لا تقوم الساعة حتى يخرج ثلاثون كذاباً آخرهم الأعور الكذاب﴾[2]، واتە: (ئەمەو سوێند بەخوا-قیامەت هەڵناسێت هەتا سی درۆزن دەردەچن کە کۆتاییەکەیان کوێرەی درۆزنە)، مەبەست پێی دەجالە.

وەلە ڕیوایەتێکی تردا (حذیفەی یمانی) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿سيكون في أمتي كذابون سبعة وعشرون منهم أربع نسوة وأنا خاتم النبيين لا نبي بعدي﴾[3]، واتە: (لە ئومەتەکەمدا (٢٧) درۆزن پەیدا دەبن کە چواریان ئافرەتن، لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن، منیش کۆتایین پێغەمبەرم پێغەمبەری ترم لەدوا نایەت).

ئەگەر ئێمەش چاوێك بە لاپەڕەکانی مێژوودا بخشێنینەوە، دەبینین کە هێشتا پێغەمبەر(ﷺ) لەژیاندا بوو، کە دوان لەو درۆزنانەی لافی پێغەمبەرایەتیان لێ دەدا سەریان هەڵدا، یەکەمیان (موسەیلەمەی درۆزن) بوو کە لە یەمامەوە لە (بنی حنیفە) سەری هەڵداو دەیگوت خوا کردوومی بە شەریکی محمد(ﷺ) لە پێغەمبەرایەتیدا، وە لاسایی قورئانی دەکردەوەو دەیگوت منیش ئایەتم لەلایەن خواوە بۆ دێت، پاشان نوێژی لەسەر خەڵك لابردوو عەرەق خواردنەوەو زیناکردنی بۆحەڵاڵ کردن و خەڵکێکی زۆریش پێی هەڵخەڵەتان و لەدەوری کۆبوونەوە، تا بەفەرمانی (ابوبکری صدیق) ڕەزای خوای لێبێت خالدی کوڕی وەلید بە سوپایەکی گەورەوە نارد و پەلاماری دان و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن و موسەیلەمەی درۆزنیش کوژراو فیتنەکەی کۆتایی پێهات.

---

[1] صحيح البخاري (٦/٦١٦)-مع الفتح) و صحيح مسلم (١٨/٤٥-٤٦-مع شرح النووي).

[2] مسند أحمد (٥/١٦-بهامشه منتخب كنز العمال) وهو صحيح.

[3] مسند أحمد (٥/٣٩٦) وصحيح الجامع الصغير (٤/٩٧) رقم (٤١٣٤) وقال الهيثمي (رواه احمد والطبراني في الكبير والأوسط، والبزار، ورجال البزار رجال الصحيح. مجمع الزوائد(٧/٣٣٢)).

دووەمیشیان (ئەسوەدی عەنسی) بوو کە لە خێڵی (مذجح) لە (صنعاء) سەری هەڵداو بەهەمان شێوە لافی پێغەمبەرایەتی لێ داو لەڕێگەی سیحر و جادو و زمان لوسییەوە خەڵکێکی زۆری هەڵخەڵەتاند و توانی دەست بگرێت بەسەر یەمەندا، تا دواتر (فەیرۆزی دەیلەمی) بەهاوکاری ژنەکەی کە ئەسوەدی عەنسی لێی داگیرکردبوو توانییان بیکوژن، لەوکاتەشدا سوپای ئیسلام گەیشتە سەریان و خەڵکێکی زۆر لە شوێنکەوتوانی کوژران و ئەوانی تریش بڵاوەیان لێ کرد و فیتنەکەی کۆتایی پێهات.

پێغەمبەریش(ﷺ) پێش وەفاتکردنی بە چەند ڕۆژێك هەواڵی کوشتنەکەی بە هاوەڵەکانی دا لەو ڕۆژ و سەعاتەی کە تیایدا کوژرابوون، وە پاش وەفات کردنی صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت بە (١٠) ڕۆژ ڕاستی هەواڵەکە گەیشتە شاری مەدینە، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردبوو.

وە لە زەمانی ئەبوبەکری صدیقیشدا لە خێڵی بەنی ئەسەد لەناوچەی خەیبەر (طلیحةی کوڕی خویلدی ئەسەدی) سەری هەڵدا کە دەیووت منیش پێغەمبەرم، تا خالیدی کوڕی وەلید بە سوپاکەیەوە پەلاماری داو شکاندی ئەویش هەڵهات و پەنای بردە بەر پاشاکانی (غسان) لەووڵاتی شام، بەڵام دواتر تۆبەی کردو گەڕایەوە و موسڵمانێکی زۆر باشی لێ دەرچوو.وە هەر لە سەردەمی ئەبوبەکریشدا ئافرەتێك بەناوی (سەجاحی کچی سوەید) لە خێڵی (تغلب) سەری هەڵدا کەلافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو عەشیرەتی (تمیم) هەموو شوێنی کەوتن و دواتر لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا ڕێکەوتن و شوی پێکرد و مارەییەکەشی ئەوەبوو کە نوێژی عەسری لەسەر خەڵك هەڵگرت. بەڵام لە سەردەمی معاویەدا گەڕایەوەو تۆبەی کرد و موسڵمانێکی باشی لێدەرچوو.

وە لە زەمانی (عبداللە کوڕی زوبەیر و عبدالملك ی کوڕی مەڕوان)یشدا لە عەشیرەتی (ثقیف) پیاوێك پەیدابوو بەناوی (موختاری کوڕی ئەبوعوبەیدی ثقفی) فیتنەیەکی گەورەی نایەوەو دەیگوت من پێغەمبەرم و نامەکانیشی بەناوی (موختار پێغەمبەری خوا)وە مۆر دەکرد.

وە (متنبی) شاعری ناوداری عەرەب لەسەرتای ژیانیدا لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا، بەڵام دوایی تۆبەی کردو لەو قسەیەی پەشیمان بووەوە.

وە لە سەردەمی (معتمد)ی خەلیفەی عەباسیشدا فیتنەی زنجەکان ڕوویدا کە دەستیان گرت بەسەر باشوری عێراقدا و خراپەکاریەکی گەلێك زۆریان کرد، وە سەرکردەکەیان ناوی (بهبود) بوو کە دەیگوت خوا منی کردوە بە پێغەمبەر، بەڵام من قبوڵم نەکردوە.

وە لە سەردەمی (مکتفي) خەلیفەی عەباسیشدا فیتنەی (قرامطة) ڕووی داو ماوەیەکی زۆری خایاند و خەڵکێکی زۆریان گومڕا کرد و خراپەکاری و فەسادێکی زۆریان نایەوە، ئەم کۆمەڵەش لەبیروباوەڕەکانیاندا زۆر لە شیعەکانی ئەمڕۆ دەچوون، وە یەکێك لەسەرکردەکانیان ناوی (یحیی کوڕی زکرویەی قرمطی) بوو لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو لەدوای خۆشی (حسین)ی برای بەهەمان شێوە، وە خاڵێك بەدەموچاویەوە بوو دەیگوت ئەمە نیشانەو مۆری پێغەمبەرایەتیەکەمە.

وە لە دوای ئەمانیش کوڕە مامەکەیان کەناوی (عیسی کوڕی مهرویە)بوو لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو دەیگوت (مدثر) لە قورئاندا کە خوا باسی دەکات منم، وە خزمەتکارێکی هەبوو ناوی نابوو (المطوق بالنور) واتە (داپۆشراو بە نور) و توانی دەست بەسەر بەشێکی زۆری وولاتی شامدا بگرێت و خراپە کاریەکی زۆر بنێتەوە تا دواتر کوژراو بەدۆزەخ شاد بوو.

وە لە سەردەمی (مقتدر)ی خەلیفەی عەباسیشدا سەرکردەیەکی تری ئەو (قرمطی)یانە بەناوی (ابو طاهری قرمطي) بە هەمان شێوە فەسادێکی گەورەی نایەوەو تەنانەت لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچیدا پەلاماری کەعبەی داو بەردە ڕەشەکەشی لەشێونی خۆی هەڵکۆڵی و قەتڵ و عامێکی زۆری خەڵکی مەکەو حاجیەکانی ئەو ساڵەشی کرد.

وە لە سەردەمی (راضي) خەلیفەی عەباسیشدا (محمد کوڕی عەلی سەلمەغانی) کە ناسرابوو بە (ابن ابي العراق) سەری هەڵدا کە لافی خوایەتی و مردوو زیندووکردنەوەی لێ دەدا تا دواتر خۆی و کۆمەڵێکی زۆر لە شوێنێکەوتوانی کوژران.

وە لە سەردەمی (مطیع)ی خەلیفەی عەباسیشدا کۆمەڵێك پەیدا بوون پێیان دەوترا (تناسخیە) کوڕێکی گەنجیان تیابوو دەیگوت رۆحی ئیمامی عەلی هاتۆتە لەشم و ژنەکەشی دەیگوت منیش ڕۆحی (فاطمة)م کراوە بەبەردا و یەکێکی تریشیان دەیگوت من جبرائیلم، دواتر گیران و زۆریان لێدرا تا بە فەرمانی (معز الدولە) ئازاد کران.

وە لەسەردەمی (مستظهر)ی خەلیفەی عەباسیشدا لەساڵی (٤٩٩)ی کۆچی دا پیاوێك لە دەوروبەری (نهاوند) پەیدا بوو لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو هەندێك خەڵك شوێنی کەوتن، بەڵام گیراو کوژرا.

وە پیاوێکی تریش لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا خۆی ناونابوو (لا) وە ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت (لا نبي بعدي) هەڵی دەگێڕایەوە دەیگوت ئەو (لا)یە بۆ نەفی نیە بەڵکو مەبەستی لە ناوی منە، واتە (لا) لە دوای من دەبێت بە پێغەمبەر.

وه هەر لە سەردەمی عەباسیەکاندا ئافرەتێك لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا، وە کاتێك کە پێیان دەگوت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی (لا نبی بعدی) واتە (لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نایەت)، دەیگوت: خۆ نەیوتوە (لا نبیة بعدي) واتە مەبەستی لە پێغەمبەری پیاو بووە نەك پێغەمبەری ژن.

وە لە کۆتایی سەدەی ڕابردوشدا چەند کۆمەڵێکی سەرلێ شێواو پەیدابوون کە سەرکردەکانیان لافی پێغەمبەرایەتیان لێ دەدا، وەك قادیانی یەکان کە سەرکردەکەیان (میرزا غلام أحمد) لە وڵاتی هیند دەیگوت من پێغەمبەرم لەلایەن خواوە وەحیم بۆ دێت و مزگەوتەکەشی ناونابوو (مسجد الاقصی) و گوندەکەشی ناونابوو (مکه المسیح) تا لەساڵی (١٣٢٦)ی کۆچیدا خوای گەورە بە دەردی سکچوون دای ڕزاند و لە ئاودەست خانەدا ڕۆحی دەرچوو.

وە هەروەها بەهائیەکانیش کە بە سەرکردەکەیان دەگوت (بهاء الله) و لافی خوایەتی لێ دەداو خەڵکێکی زۆری گومڕاو سەرلێشێواو کرد و ئینگلیزەکان پاڵپشتیان دەکرد بۆ شێواندنی ئایینی ئیسلام و نانەوەی فیتنە لەناو موسڵماناندا.

وە لە سەرەتای هەشتاکانیشدا پیاوێك لە سودان بەناوی (محمد محمود طه) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بۆخۆی دەکرد و بەهۆی نوسین و ووتارەکانیەوە خەڵکێکی زۆری گومڕا کرد،تا لەساڵی ١٩٨٥ دا حکومەتی سودان حوکمی (مرتد)ی بەسەردا سەپاند و لەسێدارەی دا[1]

بەم شێوەیە ژمارەی ئەو درۆزنانەی کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن هەتا ئەمڕۆ خۆی لە(٣٠) نزیك کردۆتەوە کە کۆتاییەکەشیان مسیحی دەجال دەبێت وەك لە فەرمودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە، ئەمە جگە لەژمارەیەکی ئێجگار زۆر کە لافی مەهدیەتیان لێ داوە کە لە ژمارە نایەن.

وە لەم سڵانەی دوایشدا لە کوردستانی خۆمان لەناوچەی پشدەر پیاوێك پەیدابوو، بەناوی شێخ مصطفی دەیگوت لەلای خواوە وەحیم بۆ دێت، وە کتێبێکیشی بڵاوکردەوە کە گوایە لەلایەن خواوە بۆی هاتووە بەناوی (کلام الله آخر ما أنزل بعد القرآن) کە لەسەر شێوەی قورئان سورەت سورەتی کردبوو وە بە (ﷻ) سورەتەکانی دەستی پێدەکرد، بەڵام دواتر خۆی و چەند هاوەڵێکی لەشاری هەولێر کوژران.

## دوانزەیەم/ هەرەج و کوشتاری موسڵمانان لەنێوان خۆیاندا:

(ئەبو موسای ئەشعەری) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن بين يدي الساعة الهرج، قالوا: وما الهرج؟ قال: القتل، إنه ليس بقتلكم المشركين ولكن قتل بعضكم

[1] قیامەتی گچکە، عمر سلیمان الاشقر، وەرگێڕانی ژیوانی گەلاڵی، ل١٩٢

بعضاً، حتى يقتل الرجل جاره، ويقتل أخاه، ويقتل عمه، ويقتل إبن غمه، قالوا: ومعنا عقولنا يومئذٍ قال إنهُ لينزع عقول أكثر أهل ذلك الزمان ويخلف له هباء من الناس يحسب أكثرهم أنه على شيء وليسوا على شيء﴾[1] ، واته: (لەپێش هاتنی قیامەتدا هەرەج دەبێت، ووتیان هەرەج چییە؟ ئەویش فەرمووی: کوشتن، مەبەستم پێی کوشتاری کافران و بێدینان نییە، بەڵکو خۆتان لەناو خۆتاندا یەکتر دەکوژن، تا وای لێ دێت پیاو دراوسێکەی خۆی دەکوژێت و برای برای خۆی دەکوژێت و مام و کوڕەمامی خۆی دەکوژێت ووتیان جا لەو کاتەدا عەقڵمان لای خۆمانە؟ ئەویش فەرمووی: عەقڵی خەڵکی ئەو زەمانە هەڵدەگیرێت و خەڵکانێکی سووك بێنرخ دەمێنەوە زۆربەیان خۆیان بە شت دەزانن و بەڵام هیچیش نین).

(ابوهريرە)ش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿والذي نفسي بيده لا تذهب الدنيا حتى يأتي على الناس يوم لا يدري القاتل فيم قتل ولا المقتول فيم قتل فقيل كيف يكون ذلك يكون ذلك قال الهرج القاتل والمقتول في النار﴾[2] ، واته: (سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، دونیا کۆتایی پێنایەت هەتا ڕۆژێك دێت بەسەر خەڵکدا پیاوکوژ نازانێت لەسەرچی دەکوژێت و کوژراویش نازانێت لەسەرچی کوژراوە، ووتیان: ئەوە چۆن دەبێت؟ فەرمووی:ئەو هەرەجە، بکوژ و کوژراو هەردووکیان لە ئاگردان).

وە لە فەرمودەیەکی تردا کە عامری کوڕی سەعد لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿سألت ربي ثلاثا فأعطاني ثِنتَين و منعني واحدة سألت ربي أن لا يهلك أمتي بالسنة فأعطاني و سألته أن لا يهلك أمتي بالغرق فأعطانيها وسألته أن لا يجعل بأسهم بينهم فمنعنيها﴾[3]، واته: (داوای سێ شتم لەخوا کرد، ئەویش دوانیانی پێبەخشیم بەڵام ئەوی تریانی نەدامێ، داوام لەخوا کرد کە سەرتاپای ئوممەتەکەم بەگرانی لەناونەبات، ئەویش پێی بەخشیم، وە داوام لێ کرد کە ئوممەتەکەم سەرتاپا بە لافاو لەناونەبات، ئەوەشی دامێ، وە داوام لێ کرد کە ئوممەتەکەم خۆیان لەناو خۆیاندا یەکتر لەناو نەبەن، بەڵام ئەمەیانی نەدامێ).

وە هەر لە بەشێکی تری فەرمودەیەکدا کە ئیمام (مسلم) لە (ثوبان)ەوە ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وإني سألت ربي لأمتي أن لا يهلكها بسنة عامة و أن لا يسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم وإن ربي قال يا محمد إني إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد وإني

---

[1] رواه احمد بأسناد صحيح وسلسلة الأحاديث الصحيحة(٤/٢٤٨) ورواه ابن ماجه والبغوي في شرح السنة.

[2] صحيح مسلم (٤/٢٢٣٢) رقم (٢٩٠٨).

أعطيتك لأمتك أن لا أهلكهم بسنة عامة وأن لا أسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم يستبيح بيضتهم ولو اجتمع عليهم من بأقطارها أو قال من بين أقطارها حتى يكون بعضهم يهلك بعضا ويسبي بعضهم بعضا﴾[1]، واته: (داوام لە خوای خۆم کرد بۆ ئومەتەکەم کە بە گرانییەکی سەرتاپا لەناویان نەبات، وە دوژمنێکی غەیری خۆیان بەسەردا زاڵ نەکات کە هەتکیان بکات و لەناویان بەرێت، خوای گەورەش ووتی ئەی محمد من کە کارێکم قەزا کرد قەزاکەم ڕەت ناکرێتەوە، وە من ئەوەم داوە بەئومەتەکەت کەبە گرانیەکی سەرتاپا لەناویان نەبەم وە دوژمنێکیان بەسەردا زاڵنەکەم لە غەیری خۆیان کە هەتکیان بکات و لەناویان بەرێت، ئەگەر هەموو مەملەکەتەکانی دونیاش لەسەریان کۆببنەوەو پەلاماریان بدەن هەتا ئەوە نەبێت کە خۆیان یەکتر لەناو خۆیاندا لەناوبەرن و خۆیان هەتکی ناموسی یەکتر بکەن).

بەڕاستی ئەم فەرمودە پیرۆزانە زۆر بەڕاشکاوی بۆمانی ڕوون دەکەنەوە کە ئومەتی ئیسلام هەرگیز دوژمنانی ناتوانن لەناوی بەرن و زەفەری پێبەرن، بەڵکو هەرچی نەهامەتی و لاوازی و بەهەلاکەت چوونی هەیە هەمووی لەڕێی ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕ و کوشتاری ناوخۆیانەوە دوچاری دەبن، بەڕاستی ئەم فەرمودانەی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی وەك بەری بەیان ڕوون و ئاشکرا هاتونەتە دی و هەتا ئەمڕۆش هەر بەردەوامن، هەر لەسەردەمی سەحابەکانەوە خوا لێیان ڕازی بێت هەتا ئەمڕۆ ئەوەندەی کە موسڵمانان لەناوخۆیاندا یەکتریان کوشتووەو خوێنی یەکتریان بەناحەق ڕشتووە، هەرگیز کافران و دوژمنانی ئیسلام نەیانتوانیوە چارەکی ئەوەندە خوێنی موسڵمانان بڕێژن. دەبینین بەکۆی هەموو غەزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو غەزاکانی سەردەمی خولەفای ڕاشدین بە ڕوخانی هەردوو دەوڵەتی فارس و ڕۆمیشەوە هێندەی شەڕی (صفین) موسڵمانیان تێداشەهید نەکراوە، وە ئەگەر چاوێك بە لاپەڕەکانی مێژوودا بخشێنین، دەبینین کە هۆکاری ڕووخانی هەموو دەوڵەتە ئیسلامیەکان شەڕو کوشتار و ئاشوبی ناوخۆبووە، وە هەمیشە دوژمنانی ئیسلام لەکاتێکدا فرسەتیان لە ئومەتی ئیسلام هێناوە کەزانیویانە لەناوخۆیاندا دووبەرەکی ناکۆکیان تێدایە، وە لە هەر کات و شوێنێکدا موسڵمانان توانیبێتیان ناکۆکی و دوبەرەکی ناوخۆوەلا بنێن ئەوا خوای گەورە بەسەر دوژمنانیاندا سەری خستون و زاڵی کردوون، وەدوژمنانی ئیسلام هەرچەندە هێزو دەسەڵاتیان هەبوبێت، بەڵام هەمیشە لە ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریدا لەگەڵ موسڵماناندا شکاون و بەزیون، تەنها لەو کاتانەدا نەبێت کە موسڵمانان لەناوخۆیاندا ناکۆك بوون، ئەوەتا وەك بینیمان گەورەترین

[1] صحيح مسلم (٤/٢٣١٥) رقم (٢٨٨٩).

تواناو دەسەلاتی سەربازی ئەم سەردەمە کە خۆی لەیەکێتی سۆڤێتی شیوعیدا دەنواند، لەبەردەم گەلێکی رەش و رووتی موسڵمانی وەك گەلی ئەفغانیدا بەچۆکدا هات و شکا، بەلام شەڕ و کوشتار و خوێن رشتنی ناوخۆی موسڵمانان لەئەفغاندا، بەرو رەنجی چەند ساڵەی ئەو جیهادە پیرۆزەی بەبا دا و بەو ئاکامە دڵتەزێنەی گەیاند کە بینیمان.. ئەمەو پێغەمبەری ئیسلامیش(ﷺ) کە دەیزانی ئەمە قەدەری ئەم ئومەتەیە و لە ئەزەلدا لەسەری نوسراوەو رەت کردنەوەی نیە، بۆیە بەناچاری بە هەموو شێوەیەك هانی موسڵمانانی داوە لەکاتی روودانی ئەو فیتنەو هەرەچو کوشتاری ناوخۆیەدا دوورەپەرێز بن و دەستیان نەچێتە خوێنی یەکتر.

ئەوەتا لەم فەرمودەیەدا کە ئیمامی موسلیم لە (أبوبکر)ەوە ریوایەتی دەکات پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿انها ستَكونُ فِتَن ألا ثُم تكون فِتنة القاعِدُ فيها خير من الماشي فيها خير من الساعي اليها ألا فَاذا نَزَلَت أو وَقَعَت فمن كانَ لَهُ ابل فَلْيَلحَق بِغَنَمِهِ ومن كانت له أرض فليلحق بأرضه قال فقال رَجُل يا رسول الله أرَأَيتَ من لم يكن له ابل ولا غنم ولا أرض قال يعمد الى سيفه فَيَدُق على حَده بِحَجَر ثم لِيَنجُ ان استطاع النجاء اللهم هل بَلغتُ اللهم هل بَلغتُ اللهم هل بلغتُ قال فقال رجل يا رسول الله أرَأَيتَ ان أُكرِهتُ حَتى يُنطَلَقَ بي الى أحد الصفين أو احدى الفئتين فضربَني رجَلُ بسيفه أو يجيءُ سهم فيَقتُلُني قالَ يَبوءُ بإثمه و إثِمكَ ويكون من أصحاب النار﴾[1]، واتە: (لەدوای من فیتنەی زۆر روودەدات، پاشان فیتنەیەك دێت ئەوەی دانیشتبێت تیایدا باشترە لەوەی تیایدا دەڕوات، ئەوەشی کە دەڕوات باشترە لەوەی کە هەوڵی بۆ دەدات، هەر کاتێك ئەو فیتنەیە رووی دا، ئەوەی حوشتری هەیە با بچێت بە لای حوشترەکەی خۆیەوە، وە ئەوەی کە خاكو زەوی هەیە با بچێت بەلای خاكو زەویەکەی خۆیەوە. پیاوێکیش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر یەکێك نەحوشترو نە مەڕو نە زەوی هەبوو چی بکات؟ ئەویش فەرموی: با بەردێك هەلگرێتو شمشێرەکەی خۆی پێ بشکێنێتو پاشان بۆی دەرچێت، ئەگەر توانای دەرچونی هەبو. خوایە شاهیدبە پێم ووتن، خوایە شاهیدبە پێم ووتن خوایە شاهیدبە پێم ووتن. پیاوێکی تریش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بەزۆر راپێچیان کردم بۆ یەکێك لە دوو بەرەکەی شەڕەکەو پیاوێك بەشمشێرەکەی لێی دام یان تیرێکم بەرکەوتو کوژرام؟ ئەویش فەرموی: گوناهی خۆی و گوناهی تۆش دەچێتە ئەستۆی ئەو و دەچێتە ئاگرەوە).

[1] صحيح مسلم (٤/٢١٢-٢٢١٣) رقم (٢٨٨٧).

هەروەها (ابوذر) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ﴿أرأيت إن قتل الناس بعضهم بعضا حتى تغرق حجارة الزيت من الدماء كيف تصنع؟ اقعد في وأغلق عليك بابك، قال: فإن لم أترك؟ قال: فأت من أنت منهم فكن فيهم، قال: فآخذ سلاحي؟ قال: إذن تشاركهم فيما هم فيه ولكن إن خشيت إن يروعك شعاع السيف فالق طرف ردائك على وجهك حتى يبوء بإثمه وإثمك ويكون من أصحاب النار﴾[1]، واتە: (ئەگەر ڕۆژێك هات و خەڵك کەوتنە کوشتنی یەکتر تا وای لێدێت بەردەکانی زەیت(کە شوێنێکە لەشاری مەدینە) لە خوێندا نوقم ببن، چی دەکەیت؟ دانیشە لەماڵی خۆتدا و دەرگا لەسەر خۆت دابخە، ووتی: ئەی ئەگەر وازیان لێ نەهێنام، ئەویش فەرمووی: پێشتر لەگەڵ کێدا بوویت هەر لەگەڵ ئەواندابە، ووتی: ئەی شمشێرەکەم لەگەڵ خۆم بەرم؟ ئەویش فەرمووی: کەواتە تۆش بەشدار دەبیت لەتاواندا لەگەڵیاندا، بەڵام ئەگەر زانیت شمشێریان لێ بەرزکردیتەوەو بریسکەکەی ترساندیتی، ئەوا لێواری عەباکەت بدە بەدەموچاوتدا، بۆ ئەوەی ئەگەر کوشتیتی گوناهی خۆی و تۆش بچێتە ئەستۆی و پێی بچێتە ئاگری دۆزەخ).

لەم فەرمودە پیرۆزانەوە بومان دەردەکەوێت کەلەکاتی فیتنەو کوشتاری موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا بە هیچ شێوەیەك بەشداربوون جائز نیە، بەڵکو دورەپەرێزی و هەڵهاتن لەو فیتنانە جێبەجێ کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی(ﷺ) تەنانەت ئەگەر بەزۆریش ڕاپێچکرایت نابێت دەست بکەیتەوە، بەڵکو بکوژرێیت باشترە لەوەی بکوژیت.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە حەزدەکەم ئاماژەی پێبکەم ئەویش ئەوەیە کە هەندێك لە موسڵمانانی ئەمڕۆ ئەو فەرموودانە دەکەن بەبیانوو بۆ خۆدزینەوە لە جیهادی کافر و تاغوتان و ئەو ڕژێمە ستەمکارانەی کە ئەمڕۆ بە زەبری ئاگر و ئاسن حوکمی خوایان وەلاناوەو یاسا دەستکردەکانیان بەسەر گەلانی موسڵماندا چەسپاندووە، وەسوکایەتی بە هەموو پیرۆزیەکانی ئیسلام و موسڵمانان دەکەن، بەبیانووی ئەوەی کە جیهاد کردن لەگەڵیاندا لە ڕیزی ئەو فیتنانەیە کە پێغەمبەرﷺ نەهی لێکردوە، چونکە لەڕیزی ئەوانیشدا نوێژکەر و موسڵمان هەیە، بێئاگا لەوەی کە گەورەترین فیتنە وەلا خستنی حوکمی خواو کارنەکردن بە شەرعی ئیسلامە کە جیهادی ئەو تاغوتانەی پێدەبێت بە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانان هەتا حوکمی خوا دەگەڕێتەوە، وە

[1] صحيح رواه احمد وابوداود والحاكم.

هەر کەسێکیش لەژێر ئاڵای ئەو تاغوتانەدا بجەنگێت ئەوا بە ئیجماعی زاناکانی ئیسلام حوکمی ئەوانی هەیە هەرچەندە نوێژکەریش بێت و لافی ئیسلامەتی لێ بدات.

دەبێت باش لەوە حاڵی بین کە نەهی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەشداریکردن لە فیتنەدا، مەبەست پێی فیتنەی شەڕکردنی موسڵمانانە لە نێوان خۆیاندا وەك لە فەرمودەکاندا بە ئاشکرا دەردەکەوێت، نەك وابتێگەن کە جیهادی کافران و تاغوتان فیتنە بێت، وە بەڵگەی زیاتریش لەسەرئەوە ئەو فەرمودەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە (ابوهریرە) لێی دەگێڕێتەوەکە فەرموویەتی: ﴿أضلتكم فتن كقطع الليل المظلم، أنجى الناس منها صاحب شاهقة، يأكل من رِسلِ غنمه، أو رجل من وراء الدروب، آخذ بعنان فرسه، يأكل من فيء رمحه﴾[1]، واتە: (فیتنەکان وەك پارچە شەوی تاریك ڕەشماڵی کردووە بەسەرتاندا، وە ڕزگارترین کەسیشتان لەو فیتنانە کەسێکە کەلەو کاتانەدا لەبەرزایی چیاکان سەرقاڵی مەڕ و ماڵاتەکەی بێت و لەبەروبومەکەی بخوات، یان کەسێکە لغاوی ئەسپەکەی بەدەستەوە گرتووەو لە پێناوی خوادا غەزاو جیهاد دەکات و لە دەست کەوتی ڕمەکەی دەستی خۆی دەخوات، کە جیهادی پێدەکات).

کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات کە لەکاتی فیتنەو کوشتاری موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا، ئێمە پشت لەو فیتنەیە بکەین، بەوەی خۆمان بە جیهادی کافر و تاغوتانەوە سەرقاڵ بکەین، ڕزگاربوونی دونیاو قیامەتیش هەر لەوەدایە، وەزۆر بەئاشکراو ڕوونی جیاوازی خستۆتە نێوان هەردوو جۆری کوشتارەکە، ئەوەتا لەکاتێکدا کە فەرمانمان پێدەکات بە دوورەپەرێزی و خۆپاراستن لە کوشتاری موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا، لە هەمان کاتدا فەرمانمان پێدەکات کەسەرگەرم و سەرقاڵی جیهادبین، چونکە ئەوە باشترین ڕێگە چارەیە تا موسڵمانان دەست لەیەخەی یەکتر بەردەن، وەڕووبکەنە دوژمنە سەرەکیەکەیان کە ناحەزان و دوژمنانی ئیسلامن.

## سیانزەیەم/ دروست بوونی (٧٣) بەرەکەو شوێنپێ هەڵگرتنی گەلانی ڕابردوو:

لە هۆکاری بەرپابوونی ئەو فیتنەو ئاشوبانەی کەپێشتر باسمان لێدەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کە ئومەتەکەی دەبنە حەفتاو سێ بەرەوە، وە هەر بەرەیەکیش خەڵکی بۆلای خۆی بانگەشە دەکات و لافی ئەوەش لێدەدات کە تەنها خۆی لەسەر حەقەو باقی گرۆهەکانی تریش ڕێگە بەتاڵن.

---

[1] رواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي، وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة(٣/٤٦٦)(٤/٦٤٢).

(ابوهريره) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إفترقت اليهود على احدى وسبعين فرقة وتفرقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة وتفترق امتي على ثلاث وسبعين فرقة﴾[1]، واتە: (جولەکە بوون بە حەفتاو یەك بەرەوە، وە دیانەکان بوونە حەفتاو دوو بەرە، وە ئومەتەکەی منیش دەبنە حەفتاو سێ بەرە).

هەروەها (ابي عامر عبدالله بن لحى) دەگێڕێتەوە دەڵێت لەگەڵ معاويەی کوڕی ئەبو سوفيان چووين بۆ حەج، کاتێك کە گەیشتینە شاری مەککە، پاش ئەوەی کە نوێژی نیوەڕۆی کرد، هەستاو ووتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن أهل الكتابين إفترقوا في دينهم على ثنتين وسبعين ملة وان هذه الأمة ستفترق على ثلاث وسبعين ملة {يعني الأهواء} كلها في النار الى واحدة وهي الجماعة وإنه سيخرج في امتي اقوام تجارى بهم تلك الأهواء كما يتجارى الكلب بصاحبه لايبقى منه عرق ولامفصل الا دخله) والله يامعشر العرب لئن لم تقموا بما جاء به نبيكم(ﷺ) لغيريكم من الناس احرى ان لا يقوم به﴾[2]، واتە: (جولەکەو دیانەکان لەسەر دینەکەیان بوونە حەفتاو دوو بەرەوە، وە ئەم ئومەتەی من دەبن بە حەفتاو سێ بەرەوە (مەبەستی پێی هەواو ئارەزووە)، هەموویان دەچنەئاگرەوە تەنها یەکێکیان نەبێت کە ئەوانیش کۆمەڵە سەرەکیەکەن (الجماعة)، وە لە ئومەتەکەی من کۆمەڵێك پەیدادەبن تێکەڵ بەو هەواو ئارەزوانە دەبن و شوێنی دەکەون هەر وەك چۆن ئەوکەسەی کە سەگ قەپی لێگرتووە ژەهرەکەی بەخوێنیدا دەڕووات و بەگیانیدا بڵاو دەبێتەوە، تاوای لێدێت هیچ دەمارو ماسولکەیەکی نامێنێت کەتێی نەچێت)، پاشان معاويە ووتی: سوێند بەخوا ئەی میللەتی عەرەب ئەگەر ئێوە نەتوانن ئاینی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) ڕابگرن و پێی هەستن ئەوا خەڵکی تر لە پێشترن کە پێی هەڵئەستان و جێبەجێی نەکەن).

بەڵێ ئومەتی ئیسلامیش وەکو ئومەتەکانی پێشتر دووچاری ئەو دەردە کوشندەیە بووە کەگەورەترین هۆکاری لاوازی و پەرتەوازە بوونی هەموو گەلێکە، کە ئەویش دەردی چەند بەرەیی و چەند دەستەو تاقمیە کە هەر یەکەیان ڕێچکەیەك لە ڕاستە ڕێگەکە بۆ خۆی دادەبڕێت و هەواو ئارەزووی خۆی دەکاتە سەر مەشق و خەڵکانێکی زۆریش بە خۆیانەوە فریو دەدەن و سەرگەردانیان دەکەن، وە هەموو یەکێکیش لەو ڕێچکانە کۆتاییەکەی ئاگری دۆزەخە وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت.

---

[1] صحيح رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه وفي صحيح الجامع الصغير (٣٥٨/١) رقم (١٠٩٤).

[2] رواه احمد وابي داود والحاكم وصححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة (م٢/ج٣/١٤-٢٣) رقم (٢٠٤).

وە ئەوەی کە پێویست بەڕوونکردنەوە دەکات لێرەدا ئەوەیە کە ئەو حەفتاو سێ فیرقەیەی کە پێغەمبەر(ﷺ) باسیان دەکات مەبەست پێیان کێیە؟ ئایا ئەو حەفتاوسێ فیرقەیە تەنها موسڵمانەکان دەگرێتەوە لە نێوان خۆیاندا یان هەموو ئەو کۆمەڵ و حزب و بیروباوەڕە نا ئیسلامیانەش دەگرێتەوە کە لە کۆنەوە و هەتا ئەمڕۆش سەریان هەڵداوە و دروست بوون؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش ئەگەر لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ورد ببنەوە دەبینین دەفەرموێت: (وتفترق امتي على ثلاث و سبعين فقة) واتە: (ئومەتەکەی منیش دەبن بە حەفتاو سێ بەرەوە) کە ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی ئەو کۆمەڵ و دەستەو گرۆهانە دەگرێتەوە کە لە چوارچێوەی ئیسلام و بەرنامەکەی خوادا کاردەکەن، بەڵام بەهۆی هەواو ئارەزوو و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانەوە، هەندێك بیرۆکەو ڕێچکەی تایبەتیان لە ڕاستەڕێی ئیسلامەکەی دابڕیوەو لە کۆمەڵی موسڵمانان و شوێن پێی پێغەمبەرﷺ و هاوڕێکانی لایان داوە، نموونەی ئەمانەش لە مێژووی ئیسلامدا زۆرن وەك (خەوارجەکان و موعتەزیلەکان و مورجیئەکان و جەبریەکان و ڕافزیەکان و..) چەندین گرۆهی تری لەم جۆرانە کە ژمارەیان لە حەفتا فیرقە تێپەڕ دەکات، تەنانەت مێژوو نوسێکی وەك (ابن کثیر) لە کتێبی (البدایة والنهایة)دا دەڵێت: لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا تەنها لە شاری بەغداد نزیکەی هەفتا کۆمەڵی لەو جۆرەی تێدابوو کە هەموویان خۆیان بە کۆمەڵی سەرەکی موسڵمانان دەزانی وە زۆرجاریش بەهۆی بیروبۆچوونە جیاوازەکانیانەوە ڕووبڕووی بوونەوە و تێك هەڵپژان لە نێوانیاندا دروست دەبوو.

ئەم کۆمەڵانە جیاوازی نێوانیان بەهۆی لێکدانەوەی جیاوازیان بوو بۆ دەقە ئیسلامیەکان، وە هەر لە چوارچێوەی ئیسلام و ئومەتی پێغەمبەریشدا(ﷺ) بوون بەزیاتر لە حەتا بەرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەدەرحەقیاندا دەفەرموێت هەموویان دەچنە ئاگر بەهۆی شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو و بەرژەوەندیەکانی خۆیانەوە تەنها کۆمەڵە سەرەکیەکەیان نەبێت کە لە ڕێ و شوێنی من و هاوەڵەکانم لایان داوە.

بەڵام ئەو کۆمەڵ و حزب و بیروباوەڕانەی کە هەر لەسەرەتاوە باوەڕیان بەوە نیە کە قورئان دەستور بێت و ئیسلام بەرنامەی ژیان بێت و شوێن کەوتووی بەرنامەو یاسا دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤن، بەڵکو دوژمنایەتی بەرنامەی ئیسلام و کۆمەڵی موسڵمانان دەکەن، ئەوانە لەئومەتی پێغەمبەرﷺ ناژمێردرێن و ناچنە ڕیزی حەفتاو سێ فیرقەکەوە، چونکە ئەمانە لەدەرەوەی بازنە ئیسلامیەکان و کێشەی ئەوان لە چوارچێوەی ئیسلام و ئومەتی ئیسلامی دا نیە، بەڵکو کێشەکەیان لەگەڵ ئیسلام و خودی ئیسلام خۆیدایە.

کەواتە حەفتاو سێ فیرقەکە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسیان دەکات مەبەستی پێیان ئەو کۆمەڵە ئیسلامیانەن کە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە ڕاستەڕێی ئیسلام لایانداوەو شوێن پێی پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵەکانیان ون کردووە، وە هەر کۆمەڵ و حزبێکی ئیسلامی یان هەر کەسێك لە ناو کۆمەڵ و لایەنێکی ئیسلامیدا لە هەر شوێن و کاتێکدا بێت، بەمەرجێك پابەندبن بە قورئان و بەرنامەی ئیسلام و شوێن پێی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکانی هەڵبگرن ئەوا بە کۆمەڵە ڕزگاربووەکە دەژمێرێن إن شاء الله.

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئومەتەکەی بۆیە دەبن بە حەفتاو سێ فیرقەوە وەك جولەکەو دیانەکان، چونکە شوێن پێی ئەوان هەڵدەگرن و چاو لەوان دەکەن.

(ابوهریرە) ڕەزای خوای لێبێت بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لاتقوم الساعة حتى تاخذ امتي بأخذ القرون قبلها شبرا بشبر وذراعا بذراع، فقيل: يارسول الله كفارس والروم؟ قال: ومن الناس الا أولئك﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا ئومەتەکەم شوێن پێی میللەتانی پێش خۆی هەڵدەگرێت، بست بە بست و باڵ بە باڵ، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت پێی فارس و ڕۆمەکانە؟ فەرمووی: ئەی خەڵك کێن جگە لەوانە).

هەروەها (ابو سعیدی خودری) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا بشبر وذراعا بذراع حتى لو دخلوا جحر ضب لاتبعتموهم، قلنا: يا رسول الله اليهود والنصارى؟ قال فمن﴾[2]، واتە: (بەڕاستی ئێوە شوێن پێی ئەوانەی پێش خۆتان هەڵدەگرن بست بە بست و باڵ بە باڵ، تەنانەت ئەگەر ئەوان بچنە کونی بزن مژەکەوە ئێوەش دوایان دەکەون، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا جولەکەو دیانەکان؟ فەرمووی: ئەی کێ؟).

بەڕاستی لەم سەردەمەدا ئەم فەرمودە پیرۆزە لە موسڵمانان هاتۆتەدی، ئەوا بەچاوی خۆمان دەبینین چۆن موسڵمانی ئەم سەردەمە چاولێکەری هەموو بێباوەڕێکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەکەن، پیاوەکانمان چاو لە پیاوەکانیان دەکەن، ئافرەتانمان چاو لە ئافرەتانیان دەکەن ئیسلام لەهەموو شتێکدا لاسایان دەکەنەوە، بەو هۆیەوە خەڵکانێکی زۆر ئیسلامەکەیان دۆڕاندوەو پێیان وایە موسڵمانان بەپێشکەوتن و شارستانێتیە مادیەکەی ئەوان ناگەنەوە تەنها بەوە نەبێت قورئان و بەرنامەی ئیسلام وەلا بنێن و شوێن پێی ئەوان هەڵبگرن.

---

[1] صحيح البخاري (١٣/٣٠٠-مع الفتح).

[2] صحيح البخاري (١٣:٣٠٠-مع الفتح) وصحيح مسلم (ڕۆژهەڵات/٢١٩-٢٢٠-مع شرح النووي).

حیجاب و پۆشاکی ئیسلامیان گۆڕی بە سترێج و مینی جۆب و مایۆی غەربی، ڕشی ئیسلامیان گۆڕی بە ریش و سمێڵ تاشین و پشت مل هەڵپاچین و لاجان درێژکردنەوە، قورئان خوێندن و زیکری خوایان گۆڕی بە مۆسیقاو گۆرانی و ڕەشبەڵەك، ناوی پیاوچاکان و خواناسان و سەرکردە و زانا ئیسلامییەکانیان گۆڕی بۆ ناوی هونەرمەند و مۆسیقاژەن و گۆرانی بێژو سەماگێڕی تیاترۆخانەکان، مزگەوت ومالّە خویان گۆڕییەوە بە نادی و بارِ و مەیخانەکان، قورئان و شەریعەتی ئیسلامیشیان گۆڕی بە یاسا و بەرنامە دەستکردەکان. بەڕاستی شوێن پێی جولەکە و دیانەکانیان هەڵگرتووە بست بە بست و باڵ بە باڵ تەنانەت ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بەکونی بزن مژەیەکدا ئەمانیش بەدوایاندا خۆیان پیادەکەن.

## چواردەیەم/ فیتنەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە سەر هەڵدەدەن:

حەزدەکەم کۆتایی ئەم بەشە بەچەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) بێنم کە ئاماژە بەوە دەکەن کە بەشی زۆری فیتنەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە سەر هەڵدەدەن ڕۆژهەڵاتیش مەبەست پێی ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینەیە کە عێراق و ئێران بەگشتی دەگرێتەوەو باشوری عێراقیش بە تایبەت. ابو هریرە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿رأس الكفر نحو المشرق﴾[1]، واتە: (سەری کوفر لە ڕۆژهەڵاتەوەیە).

وە (عبدالله ی کوری عومەریش) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کەڕۆژێکیان لە تەنیشت مینبەرەکەوە وەستاو دەستی بەرەو ڕۆژهەڵات ڕاکێشا و فەرمووی: ﴿الفتنة هاهنا من حيث يطلع قرن الشمس﴾[2]، واتە: (فیتنە ئالێرەوە دێت، لەو جێگایەی کە قۆچی خۆری لیّ هەڵدێت).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا عائیشە داکی موسڵمانان ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿رأس الكفر هاهنا من حيث يطلع قرن الشيطان﴾[3]، واتە: (سەری کوفر ئالێرەوەیە، لەو شوێنەی کە قۆچی شەیتانی لیّ هەڵدێت).

وە لە فەرمودەیەکی تردا (ابن عمر) ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿اللهم بارك لنا في شامنا، اللهم بارك لنا يمننا، قالوا: يا رسول الله وفي نجدنا!؟ فأظنه قال في الثالثة: هناك الزلازل و الفتن وبها يطلع قرن الشيطان﴾[4]، واتە: (خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە

---

[1] رواه البخاري و مسلم و مالك في الموطأ، وفي جامع الأصول (٦١/١٠) رقم (٧٥٢٨).

[2] رواه البخاري و مسلم.

[3] رواه البخاري (٤٥/١٣-مع الفتح) وصحيح مسلم (٢٢٢٩/٤) رقم (٢٩٠٥).

[4] صحيح البخاري (٤٥/١٣-مع الفتح).

شامەوە، خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە یەمەنەوە، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا بۆ نەجدیش!؟ پێم وایە لە سێیەمدا فەرمووی: بومەلەرزەو فیتنە والەوێ، لەوێوە قۆچی شەیتان هەڵدێت).

(نجد) لە زمانی عەرەبیدا مەبەست پێی شوێنێکی بەرزە، و خەڵکی مەدینەش بە بیابانی عێراقیان دەگوت (نجد).

هەر بۆیە (سالمی کوڕی عبداللە کوڕی عومەر) کاتێك کە خراپەکاری خەڵکی عێراقی دەبینی پێی دەوتن (ئای خەڵکی عێراق چەند پرسیار لە شتی بچوك دەکەن و گوناهی گەورە ئەنجامدەدەن، گوێم لە باوکم بوو دەیگوت گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: ﴿إن الفتنة تجيء من هاهنا– وأومأ بيده نحو المشرق– من حيث يطلع قرن الشيطان﴾[1]، واتە: (فیتنە ئالێرەوە دێت–ئیشارەتی بۆ ڕۆژهەڵات دەکرد–لەو شوێنەی کە قۆچی شەیتانی لێ هەڵدێت) ئێوەش ئەی خەڵکی عێراق بەشمشێر گەردنی یەکتر دەپەڕێنن.

بەڵێ هەرکەس چاوێك بە لاپەڕەکانی مێژوودا بخشێنێتەوە دەزانێت کە هەموو فیتنەکان لەناوچەی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵی دەکردە سەر ئیسلام و جیهانی ئیسلامی، هەر لەوێوە ئەو فیتنەیە هەستا کە بووە هۆی کوشتنی ئیمامی عوسمان و سەدان سەحابی و هەزاران موسڵمان بەدەستی یەکتر، هەر لە خاکی عێراقدا ئیمامی عەلی و ئیمامی حوسەینی کوڕی و زۆربەی بنەماڵەی پێغەمبەرﷺ قەتڵ و عام کران و خوێنیان ڕژا، هەر لە خاکی عێراقەوە فیتنەی خەوارجەکان سەری هەڵداو هەتا کۆتایی سەردەمی ئەمەویەکان هەر بەردەوام بوو، هەر فیتنە شۆڕشی زنجەکان ساڵی (٢٥٥)ی کۆچی لە بەسرە هەڵگیرسا، هەر لەوێشەوە ساڵی (٢٧٨)ی کۆچی فیتنەی قەرامیتەکان هەستا، کە ئەم دوو کۆمەڵە بوونە مایەی کوشتنی سەدان هەزار موسڵمانی بێتاوان، هەر لەوێشەوە ڕەشەبای مەغۆل و تەتار هەڵیکردو جیهانی ئیسلامیان قڕکرد، وە هەر لە ڕۆژهەڵاتیشەوە لەئاخرزەماندا دەجال بە خۆی و سوپاکەیەوە دێت، وە زۆربەی فیتنەکانیش لە شاری کوفەو لەشاری بەسرەوە سەریان هەڵدەدا، هەر بۆیەش لەو فەرمودە صحیحەی کە ابوداود لە (انس)ەوە ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی شاری (بصرە) پێی دەفەرموێت: ﴿يا أنس إن الناس يمصرون أمصارا وإن مصرا يقال له البصرة أو البصيرة فإن أنت مررت بها أو دخلتها فإياك وسباخها و كلاءها وسوقها وباب أمرائها وعليك بضواحيها فإنه يكون بها خسف وقذف ورجف وقوم يبيتون يصبحون قردة وخنازير﴾[1]، واتە: (ئەی ئەنەس، خەڵکی شار دروست دەکەن و ئاوەدانی دەکەنەوە، شارێك

---

[1] رواه مسلم في صحيحه (٢٢٢٩/٤) رقم (٢٩٠٥).

[1] رواه ابوداود بأسناد صحيح وفي مشكاة المصابيح(١٩/٣) رقم (٥٤٣٣).

هەیە پێی دەوترێت بصرە، ئەگەر هاتوو پیایدا تێپەڕبوویت یان چوویتە ناوی، ئاگاداربە نزیك زەوی ڕوت و لەوەڕگا و دارخورما و بازاڕو دەرگای بەرپرسەکانی نەبیتەوە نەچیتە ناوی، هەر لـە قـەراغ شارەکە بمێنەرەوە چونکە ئەوشارە دووچاری ڕۆچوون و ئاگرباران زرمەو ناڵەو ڕاتەکان دەبێت، وە کەسانێکی تێدا دەبێت شەو کە دەخەون بەیانی لە خەو هەڵدەستن بوون بە مەیمون و بەراز).

ئەی صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی فەرمودەکانت هەمووی وەك گزنگی بەیان سەریان هەڵداو هاتەدی، بێجگە لەو هەموو شەڕ و کاولکاریەی کەپێشتر بەسەر شاری بەسرەدا هاتووە، ئێستاش بەچاوی خۆمـان دەبیـنین چـۆن هـەر لەسـەرەتای جـەنگی نێـوان عێراق-ئێرانەوە و دواتریش جەنگی کەنداو هەتا ئەمڕۆ بەردەوام ئەو شارە تۆپ باران و ئاگرباران و بۆردومان دەکرێت و سەدان خانوو و دوکان و بازاڕ و کوچەو کۆڵانی ڕۆچـوون و خەڵکەکەشـی کەوتنە ژێر دار و پەردوی بینا ڕوخاوەکانەوە بەڕاستی هەر لە کۆنەوە هەتا ئەمڕۆش کەسێك نیە لـە بیری بێت ئەم عێراقە بێ شەڕو فیتنە و ئاژاوە و کوشتار بووبێت، بۆیە هەر لەکۆنیـشەوە بـە عێـراق وتراوە (بلد الجبابرة) واتە وولاتی ستەمکاران، بەڕاستی سەری کوفر لێرەوەیـە، لـەم عێراقـەی کـە قۆچی شەیتانی لێ هەڵدێت.

## بەشی دووەم

## ئەو نیشانانەی کە تا ئێستا ڕوودەدەن و بەردەوامن

ئەو نیشانانەی کە لەم بەشەدا باسیان دەکەین زۆربەی هەرەزۆریان، بەڵکو دەتوانین بڵێین هەرهەموویان ڕوویان داوەو هەتا ئەمڕۆش هەر بەردەوامن و بەئاشکرا دەبینرێن و بوونەتە ڕووداوی بەرجەستە لە واقعی ئەمڕۆی موسڵمانانادا.

### یەکەم/ نەمانی دەست پاکی و ئەمانەت:

ابوهریرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذا ضيعت الأمانة فانتظر الساعة قال كيف إضاعتها قال إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة﴾[1]، واتە: (ئەگەر ئەمانەت ون کرا ئەوا چاوەڕێی قیامەت بکەن، ووتیان: مەبەستت لە ون کردنی چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هەر کاتێك کاروبار کەوتە دەست کەسانێك کە شیاوی نەبن ئەوا چاوەڕێی قیامەت بن).

(ابن عمر)یش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من أشراط الساعة... وتخوين الأمين وإئتمان الخائن﴾[2]، واتە: (لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە... خیانەتکار بە دەست پاك لەقەڵەم بدرێت و دەست پاکیش بە خیانەتکار دابنرێت).

بەڕاستی ئەمڕۆ بە دەگمەن کارمەندێك یان بەرپرسێك دەبینرێت بە شیاوێتی و شایەنێتی خۆی لە جێگەی دانرابێت و بەدەست پاکی و بێ خیانەتی کاری خۆی ئەنجام بدات، بەڵکو زۆربەی زۆری کارمەندان و بەرپرسانی ئەمڕۆ بەچاوی پاروی قەڵەو سەیری کاروباری هاوڵاتیان دەکەن کەبە ئامانەت خراوەتە ئەستۆیان، سەیریش لەوەدایە ئەو کەسانەی کاری خیانەت و دەست پیسیان لێ ئاشکرا دەبێت بەردەوام پلەوپایەیان زیاتر بەرز دەکرێتەوە، وە ئەوانەشی کەدەست پاکن و ئامادەنین خیانەت لە ئەمانەت بکەن بە پیاوخراپ لە قەڵەم دەدرێن لەکار لادەبرێن، ئەمانەش هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دینداری و لەخواترسی لەناو خەڵك و بەرپرساندا نەماوە بۆیە خیانەتکار دەکرێت بە دەست پاك و دەست پاکیش بە خیانەتکار.

---

[1] صحيح البخاري (١١/٣٣٣-الفتح).

[2] صحيح رواه احمد والبزار وذكره الألباني في (الصحيحة) رقم (٢٢٩٠).

## دووەم/ کەسانی بێ نرخ کاروباری موسڵمانان دەگرنە دەست:

(ابوهریرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إنها ستأتي على الناس سنون خداعة يصدق فيها الكاذب ويكذب فيها الصادق ويؤتمن فيها الخائن ويخون فيها الأمين وينطق فيها الرويبضة قيل وما الرويبضة قال السفيه يتكلم في أمر العامة﴾[1]، واتە: (ساڵانێکی هەڵخەڵەتێنەر بەسەر خەڵکیدا دێت، درۆزنی تێدا دەکرێت بەڕاستگۆ، ڕاستگۆشی تێدا دەکرێت بەدرۆزن، وە خیانەتکاری تێدا دەکرێت بە دەستپاك و دەستپاکیشی تێدا دەکرێت بە خیانەتکار، و (رويبضة) قسەی تێدا دەکات) وتیان: (رويبضة) چییە؟ فەرمووی: (کەسانی ناکەس بەچەو بێ‌نرخ قسە لەکاروباری گشتی خەڵکدا دەکەن).

وە لە بەشێك لە فەرمودە درێژەکەی جبرائیلدا، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ولكن سأحدثك عن أسراطها... إذا كانت الحفاة العراة رؤوس الناس، فذاك من أشراطها﴾[2]، واتە: (بەڵام باسی نیشانەکانی قیامەتت بۆ دەکەن... ئەگەر ڕوت و قوتە پێ‌پەتیەکان بوونە سەرکردەی خەڵك ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت).

هەروەها (حذیفەی یەمانی) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (حتى يقال للرجل ما أجلده وما أظرفه وما أعقله وما في قلبه مثقال حبة من خردلٍ إيمان﴾[3]، واتە: (وای لێدێت بە پیاو دەوترێت ئای چەند ئازاو بەجەرگە! ئای چەند قسەخۆشە، ئای چەند ئاقڵە، کەچی هێندەی مسقاڵە دەنکە تۆوێکیش ئیمان لە دڵیدا نییە).

(عومەری کوڕی خەتاب) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من أشرط الساعة أن يغلب على الدنيا لكع ابن لكع، فخير الناس يومئذٍ مؤمن بين كريمين﴾[4]، واتە: (لە نیشانەکانی قیامەت هەرچی ناکەس بەچەی کوڕی ناکەس بەچە هەیە دەسەڵاتی دونیا دەگرنە دەست، وە باشترین کەس لەو زەمانەدا ئیماندارێکە لە نێوان دوو کەسی بەڕێزدا).

ئەم فەرموودانەو چەندین فەرمودەی تری لەم جۆرە بەوپەڕی ڕاستگۆیی تەعبیر لە واقعی ئەمڕۆی موسڵمانان دەکەن لە سەرانسەری جیهاندا، کە چۆن گرفتار بوون بە دەست کۆمەڵە سەرکردەو دەسەڵاتدارێکەوە کە نە باوەڕ و لە خواترسان لە دڵیاندا هەیە لە زوڵم و ستەم بیانگرێتەوە، وە نە

---

[1] صحيح رواه احمد والطبراني وابن ماجه والحاكم، وفي (الصحيحة)للألباني برقم (١٨٨٨)(٤/٥٠٨).

[2] صحيح مسلم (رؤذهةلآت/١٦٣-مع شرح النووي).

[3] صحيح البخاري (١١/٣٣٣-مع الفتح) و صحيح مسلم (١/١٦٧-١٧٠-مع شرح النووي).

[4] قال الهيثمي: رواه الطبراني في الأوسط باسنادين ورجال أحدهما ثقات، مجمع الزوائد(٧/٣٢٥).

ڕەگەزو ڕەچەڵەکێکی واشیان هەیە کە لە ناو و سومعەی خۆیان بترسن کەشەرمێکیان بۆ دروست بکات، لەخراپەو بەدڕەوشتی بیانگێڕێتەوە.

**سێیەم/ کەم بوونی زانست و زۆربوونی نەزانین (کەمەبەست زانست و زانیاری شەرعی یە):**

(انس کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من أشرط الساعة أن يرفع العلم ويثبت الجهل﴾[1]، واتە: (لەنیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە زانست هەڵدەگیرێت و نەزانین دەچەسپێت).

هەروەها (شقيق) دەگێڕێتەوە دەڵێت لەگەڵ (عبدالله و ئەبوموسا)دا بووم، ووتیان: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن بين يدي الساعة لأياما ينزل فيها الجهل ويُرفع فيها العلم﴾[2]، واتە: (لە پێش قیامەتدا ڕۆژانێك دێن نەزانینی تێدا دادەبەزێت و زانستی تێدا هەڵدەگیرێت).

هەروەها (عبدالله ی کوڕی عەمری عاص) دەگێڕێتەوە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (إن الله لا يقبض العلم انتزاعا ينيزعه من العباد ولكن يقبض العلم بقبض العلماء حتى إذا لم يبق عالما اتخذ الناس رءوسا جهالا فسئلوا فأفتوا بغير علم فضلوا وأضلوا﴾[3]، واتە: (خوای گەورە زانست هەڵناگرێت بە لێکردنەوە لە دڵی بەندەکانی بکاتەوە، بەڵام زانست ناهێڵێت بە نەهێشتنی زاناکان، هەتا کاتێك کە وای لێ هات زانا نەما، ئیتر خەڵکی کەسانێك نەزان دەکەن بەگەورەی خۆیان و پرسیاریان لێ دەکەن، ئەوانیش بەنەزانی فەتوایان بۆ دەدەن، سەر لەخۆشیان و لەوانیش دەشێوێنن).

وە ئیمام (عبدالله ی کوڕی مبارك) لە کتێبی (الزهد)دا کە نوسراوی خۆیەتی لە (ابي امية الجمحي) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إن من أشرط الساعة ثلاثا: إحداهن أن يلتمس العلم عند الأصاغر...﴾[4]، واتە: (سێ شت لە نیشانەکانی قیامەتن: یەکێکیان ئەوەیە کە خەڵکی لەلای کەسانی بچوك بەدوای زانستدا دەگەڕێن).

وە پرسیاریان لە (عبدالله ی کوڕی مبارك) کرد مەبەست لە کەسانی بچوك کێیە؟ فەرمووی: ﴿الذين يقولون برأيهم، فأما صغير يروي عنه كبير، فليس بصغير﴾، واتە: (ئەوانەی کە بە ڕەئی

---

[1] صحيح البخاري (ڕۆژهەڵات/١٧٨-مع الفيح) وصحيح مسلم (٢٢٢/١٦-مع شرح النووي).

[2] صحيح البخاري (١٣/١٣-مع الفتح).

[3] صحيح البخاري (١٩٤/١-مع الفتح)، وصحيح مسلم (٢٢٣/١٦-٢٢٤-مع شرح النووي).

[4] صحيح رواه الطبراني وابن مبارك في (الزهد) ص (٦١)، وذكره الألباني في (صحيحه) رقم(٦٩٥).

خۆیان قسە دەکەن و فەتوا دەدەن، نەك ئەوەی کە بەتەمەن منداڵە). وە لە حاشیەی کتێبی (الزهـد) دەڵێت مەبەست لە کەسانی بچوك ئەهلی بیدعەتە.

وەهەر سەبارەت بە نیشانەکانی قیامەت ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذا كثُرَ خطباء منابركم وركَنَ عُلمائكُم الى ولاتكم فأحلوا لهم الحرام وحرموا عليهم الحلال فأفتوهم بما يشتهون﴾[1]، واتە (ئەگەر وتاربێژی سەر مینبەرەکانتان زۆر بوون و، زاناکانتان پاڵیان دا بە سەرکردەکانتانەوە و بوون بە پیاوی ئەوانو حەرامیان بۆ حەڵاڵ کردنو حەلاڵیان لێ حەرام کردنو بە ئارەزوی دڵی بەرپرسەکان فەتوایان بۆدان ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بکەن).

وە هەر لە فەرموودەدا کە ئیمامی عەلی دەیگێڕێتەوە: ﴿من اقتراب الساعة اذا تعلم علمائكم ليجلبوا به دنانيركم ودراهمكم واتخذتم القرآن تجارة﴾[2]، واتە: (لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت ئەگەر زاناکانتان بۆ ئەوە فێری زانست دەبوون کە دینار و درهەمی پێ کۆبکەنەوە، وە قورئانیشتان کرد بە بازرگانی).

شێخ (محمد بن رسول)ی بەرزنجی خاوەنی کتێبی (الأشاعة لأشراط الساعة) دەفەرموێت: (مەبەستی فەرمودەکە ئەوەیە قورئان بە پارە دەخوێنن نەك بۆ خوا)[3]

بەڕاستی وابزانم هیچ کام لە فەرمودانە پێویست بە شەرح و ڕوونکردنەوە ناکات، چونکە هەرکەس خوای گەورە جوتێك چاوی پێ بەخشیبێت، ڕاستی هاتنەدی فەرمودەکان بەچاوی خۆی دەبینێت، خۆزەگە ئەو بەناو زانایانەی کە دینیان بەدونیا فرۆشتووەو قورئانیان کردۆتە دەست مایە بۆ پارە پەیداکردن.وە بەردەوام لەبەردەم دەرگای بەرپرسەکان و سەرکردەکاندا کەوتون و قیامەتیان بەدنیای ئەوان دەفرۆشن و گیرفانیان پڕیوتی لە فەتوای لۆك و ئامادەکراو بۆ ڕەزامەندی سەرکردەکان و حزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانیان، خۆزگە چاویکیان بەم فەرمودانەدا دەخشاندەوەو هۆشێکیان وەبەر خۆیاندا دەهێنایەوەو بیرێکیان لەحاڵی خۆیان دەکردەوە بەڵکو شەرم بیانگرێت و چی دی لەوە زیاتر نەبن بە مشەخۆر لەسەر ئیسلام و ئیسلام ناشیرین نەکەن.

---

[1] جزء من حديث طويل رواه أبو الشيخ وعويس والديلمي، كلهم عن علي كرم الله وجهه.

[2] جزء من حديث طويل رواه أبو الشيخ و عويس والديلمي، كلهم عن علي كرم الله وجهه.

[3] الأشاعة لأشراط الساعة للشيخ محمد بن رسول البرزنجي، ص١١٢.

## چوارەم/ زۆربوونی پۆلیس و دەست و پێوەندی ستەمکاران:

(ابو امامه) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يخرج رجال من هذه الأمتي في آخر الزمان معهم سياط كأنها أذناب البقر، يغدون في سخط الله ويروحون في غضبه﴾[1]، واتە: (لە ئاخرزەماندا پیاوانێك لەم ئومەتەی من پەیدا دەبن، قامچییان پێیە هەر دەڵێی کلکی مانگایە، بەیانی تا نیوەڕۆ لە ڕقی خوادا دەبن و نیوەڕۆش تا ئێوارە لە تووڕەبوونی خوادا دەبن).

مەبەستیش بەو قامچییانەی کە لە کلکی مانگا دەچن ئەو کێبلانەیە کە ئەمڕۆ بۆ لێدان و ئەشکەنجەدانی خەڵکی بەکاردەهێنرێت، زۆر جاریش جەمسەری کێبڵەکە تۆزێك ڕووت دەکرێت و وایەرەکانی پرژ دەکرێتەوەو هەروەك کۆتایی کلکی مانگای لێ دێت بە مەبەستی ئەوەی باش لەپشتی ئەو کەسە بچەقێت کە لێی دەدەن.

وەلە ڕیوایەتێکی تردا کە (ابو امامه) ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿سيكون في آخر الزمان شرطة يغدون في غضب الله ويرو حون في سخط الله، فإياك أن تكون من بطانتهم﴾[2]، واتە: (لە ئاخرزەماندا جۆرە شورتەیەك دەبن کە لە تووڕەبوونی خوادا ڕۆژ بەسەر دەبەن و لەرقی خواشدا خۆریان لێ ئاوادەبێت، خۆت بپارێزە نەکەیت لە دەست و پێوەندی ئەوانەبێت). وە لە چەند فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی ئاگری داوە بەو قامچی و کێبڵ بەدەستانە.

ابوهریره ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿صنفان من أهل النار لم أرهما قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس...﴾[3]، واتە: (دوو پێڕ هەن لە ئەهلی ئاگر من نەمدیون (واتە لەدوای خۆم پەیدادەبن)، پێڕی یەکەمیان کەسانێکن قامچیان پێیە لە کلکی مانگا دەچێت لە خەڵکی دەدەن...).

وە هەر لە (ابوهریرە)وە ئیمام موسلم دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووە: ﴿إن طالت بك مدة أوشكت أن ترى قوما يغدون في سخط الله ويرو حون في لنعته في أيديهم مثل أذناب

---

[1] رواه أحمد والحاكم باسناد صحيح وفي (الصحيحة) للألباني (٥١٧/٤) رقم (١٨٩٣).

[2] رواه الطبراني في الكبير وفي صحيح الجامع الصغير (٣١٧/٣) رقم (٣٥٦٠) وفي الصحيحة رقم (١٨٩٣).

البقر﴾[1]، واته: (ئەگەر تەمەن مۆڵەتت بدات هێندەی نەماوە کەسانێك ببینیت،ڕۆژبە ڕقی خوا دەبەنە سەر و ئێوارەش بە لەعنەتی خوا شتێکتان بە دەستەوەیە وەك کلکی مانگا).

هەروەها (ابن عباس)دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿یکون علیکم أمراءهم شرّ من المجوس﴾[2]، واته: (ڕۆژانێك دێت کەسانێك دەبن بە بەرپرس و سەرکردەتان لە ئاگرپەرستەگان خراپتر ن).

پەڕاستی لە سەردەمانێکی رابردوودا کە ئیسلام حوکمی دەکرد و خەلافەتی ئیسلامی بەرقەراربوو تەنها لە شارە گەورەکاندا یەك بنکەی پۆلیس هەبوو کە ئەویش کاری پاراستنی ئاسایشی خەلکی و دەست گیرکردنی تاوانباران بوو بە فرمانی قازی موسلمانان، بەلام ئەمودەزگایە ئەمرۆ لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا چەندین ناوی جۆراو جۆر و چەندین لقی جۆراو جۆری لێ بۆتەوە وەك (مخابرات، استخبارات، ئەمن، طواريء، قوات خاصة، ئەمنی خاصە....) کەهەریەکەیان هەزاران ئەندامی کێڵ بەدەستی هەیەو کاریشیان لەبری پاراستنی ئاسایشی هاولاتیان سەرکوتکردن و داپلۆسینی هەموو ئەو خەلکانەیە کەبە شێوەیەك لە شێوەکان دەنگ و نوزەیەکی نارەزایی لە دژی ستەم و زۆرداریی رژێمەکانیان لە قورگ بێتە دەر، بەتایبەتی ئیسلامیەکانی ئەمرۆ کە لە سەرانسەری جیهاندا زۆربەی هەرەزۆری کێڵەکان لە جەستەو پشتی ئەواندا کاردەکەن و، دەیان هەزار کێبڵ بەدەستیش موچەی حەرام لە سەر خوێن و فرمێسك و ئاهو ناڵەی ئەوان لە ژێرزەمینە تاریکەکاندا وەردەگرن، وە پێم وایە هیچ میللەتێك ئەمرۆ لە جیهاندا هێندەی میللەتی کوردی موسلمان هەست بە ڕاستیی هاتنەدی ئەم فەرمودە پیرۆزانەی پێغەمبەرﷺ ناکات، چونکە کەم میللەت هەیە وەکو گەلی کورد زامی ئەو کێڵە ڕەشانەی کە لە کلکی مانگا دەچن بە جەستەی ڕۆڵەکانیەوە دیاربێت و هێندەی ئەوانیش ئازار و ئەشکەنجەی لەدەستی ئەو قامچی بەدەستانە دی بێت.

## پێنجەم/ پەیدابوونی ئافرەتی ڕووت و زۆربوونی زیناکردن:

ابوهریرە رەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ﴿صنفان من أهل النار لم أرهما قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس و نساء كاسيات عاريات مميلات مائلات رءوسهن كأسنمة البخت المائلة لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها و ان ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا﴾[1]، واته: (دوو پێڕ هەن لە ئەهلی ئاگر نەمدیون، کۆمەڵێك قامچیان پێیە لە کلکی مانگا

---

[1] صحيح مسلم (١٧/١٩٠-مع شرح النووي).

[2] رواه الطبراني في الصغير والأوسط ورجاله رجال الصحيح غير مؤمل بن إهاب وهو ثقة. مجمع الزوائد(٥/٢٣٥).

[1] صحيح مسلم (١٧/١٩٠- مع شرح النووي).

دەچێت لە خەڵکی پێدەکەن، وە ئافرەتانێك کە پۆشاکو جلیان لەبەردایە، بەڵام بەشی زۆری لەشیان ڕووتەو مەیلیان بۆ هەواو ئارەزوو و ڕابواردنەو کە دەشرۆن بەرێگادا لەنجەو لاردەکەن تا زیاتر سەرنج ڕابکێشن پرچیان لەدواوە کۆدەکەنەوەو لولی دەکەنو لەسەر سەریان دای دەنێن هەروەك پشتی حوشتر، ئەو ئافرەتانە نەدەچنە بەهەشتەوەو نە بۆنیشی دەکەن، کە بۆنی بەهەشت لە دورایی ئەوەندەو ئەوەندەوە دەکرێت.).

کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوجۆرە ئافرەتانەی خستۆتە ڕیزی کێڵ بەدەستەکانەوەو ڕۆژی قیامەتیش لەگەڵ ئەوان حەشردەکرێن. (عبدالله ی کوڕی عمر)یش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەر(ﷺ)ی بیستووە فەرموویەتی: (سيكون في آخر امتي رجال ركبون على السروج كأشباه الرجال ينزلون على أبواب مسجد نسائهم كاسيات عاريات على رؤسهم كأسنمة البخت العجاف إلعنوهن فإنهن ملعونات...)[٢]، واتە: (لەکۆتایی ئومەتەکەمدا پیاوانێك دەبن سواری زین دەبن هەر دەڵێی ماڵ و خانوەو بەسواری ئەوانە دێنە دەرگای مزگەوتەکان، ژنەکانیشیان ڕووت و قوت هەر بەناو جل و پۆشاکیان لەبەردایە، پرچیان لەسەر سەریان هەر وەك پشتی حوشتر کۆمەڵکردوە، ئەو ئافرەتانە لەعنەتیان لێ بکەن چونکە لەعنەتیان لێ کراوە ).

بەڕاستی ئەم فەرمودەیە لە گەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئاماژە بە پەیدابوونی سەیارە و ئۆتۆمبیل دەکات و هەر دەڵێی لەو ڕۆژەدا کە ئەم وتە پیرۆزەی تێدا فەرمووە، بەچاوی پیرۆزی سەیری واقعی ئەمڕۆی کردووە، چۆن پیاوانی ئومەتەکەی بەسواری سەیارە ڕوو دەکەنەمزگەوتەکان، کەچی لەولاشەوە بێ ئەوەی گوێی پێ بدەن ئافرەتەکانیان و کچ و خوشکەکانیان ڕووت و سافیرە، جلی کورت و تەسك و تەنك لەبەردەکەن و قژیان لەف دەکەن و دەموچاویان ئارایشت دەکەن و بۆنی خۆش لە خۆیان دەدەن و بەهەزارو یەك شێوە خۆیان دەڕازێننەوە، پاشان دێنە سەر کوچەو شەقام و کۆڵانەکان و بەلەنجەو لار پیاسە دەکەن و پێغەمبەریش(ﷺ) لەدەرحەقیان دەفەرموێت ئەو جۆرە ئافرەتانە لەعنەتیان لێ بکەن چونکە خواو مەلائیکەتەکانیش لەعنەتیان لێ دەکەن و لە ڕەحم و بەزەیی خوا بێ بەشن.

وە لە فەرمودەیەکی تردا کە ئیمامی حاکم ڕیوایەتی دەکات پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿سيكون في آخر هذه الأمة رجال يركبون على المياثر، حتى يأتوا أبواب مساجدهم، نساؤهم

[٢] مسند الإمام أحمد (٣٦/١٢) رقم (٧٠٨٣) تحقيق احمد شاكر وقال(اسنادهم صحيح).

كاسيات عاريات﴾[1]، واته: (لە کۆتایی ئەم ئوممەتەدا پیاوانێك دەبن سواری زینی گەورە دەبن و هاتوچۆی پێ دەکەن، ژنەکانیشیان ڕووت و قووت هەر بەناو جلیان لەبەردایە).

هەروەها (ابو هريرە) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (من أشرط الساعة... أن تظهر ثياب تلبسها نساء كاسيات عاريات﴾[2]، واتە: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە جۆرە جل و بەرگێك پەیدا دەبێت کە ئافرەتانێك لەبەری دەکەن کەمێکی جەستەیان دادەپۆشێت و بەشێکی زۆری ڕووتە و بەدەرەوەیە).

بەڵێ ئاکامی ئەم ڕووتی و بەرەڵایی و خۆ ڕازاندنەوەی ئافرەت لەم سەردەمەدا، زۆربوون و بڵاوبوونەوەی زینایە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەیەکێك لە نیشانەکانی قیامەتی لەقەڵەم داوە.

ئەوەتا (انس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن من أشراط الساعة ويضهر الزنا﴾[3]، واتە: (یەکێك لەنیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کەزیناکردن سەرهەڵدەداو ئاشکرادەبێت).

بەڵێ ئەمڕۆ لە هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە بەناو ئیسلامین و خەڵکەکانیان موسڵمانن، دەیان و سەدان مەڵاو گازینۆی تایبەت هەیە کەبە ئاشکراو بەڕۆژی ڕووناك و بەچاودێری دەزگابەرپرسەکان بازرگانی بە (زینا) وە دەکرێت، وە هەزاران ئافرەت لەو جێگایانەدا کاروکاسبی ڕەسمیان بۆتە زیناکردن و داوێن پیسی.

هەروەها (ابو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿سيأتي على الناس سنوات خداعات... وتشيعُ فيها الفاحشة﴾[4]، واتە: (ساڵانێکی هەڵخەڵەتێنەر بەسەر خەڵکیدا دێت کە تیایدا داوێن پیسی و زیناکردن پەرەدەسێنێت و بڵاو دەبێتەوە).

بەڵێ ئەمڕۆ کار گەیشتۆتە ئەوەی کەسانێکی زۆر نەك هەر ئەوکارە بەد ڕەوشتیانە ئەنجام دەدەن، بەڵکو بەحەرامیشی نازانن و بەحەڵاڵی لەقەڵەم دەدەن، تەنانەت چەندین ڕێکخراو کەبەناو داکۆکی

[1] رواه الحاكم في المستدرك (٤/٤٣٦) وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه وقال الذهبي (عبدالله القتباني أحمد رواة الحديث وإن كان قد أحتج به مسلم فقد ضعفه أبو داود والنسائي). قال أبو حاتم: (وهو قريب من ابن الهيثم) ولكن الأحاديث الأخرى تشهد له وتقوية.

[2] قال هيثمي (في الصحيح بعضه ورجاله رجال الصحيح غير محمد بن الحارث بن السفيان وهو ثقة). (مجمع الزوائد(٧/٣٢٧).

[3] صحيح البخاري (١/١٧٨–مع الفتح) وصحيح مسلم (١٦/٢٢١–مع شرح النووي).

[4] رواه الحاكم في المستدرك (٤/٥١٢) وقال (هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه) و وافقه الذهبي.

لەمافی ئافرەت دەکەن لەپشتیانەوە چەندین حزب لایەنی سیاسی وەستاوەو پشتگیریان دەکات بەئاشکراو بەبێ پەردە لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا، داوای سڕینەوەی لەویاسایانە دەکەن کە (زینا) بەتاوان لەقەڵەم دەدات و، ئەنجامدانی ئەو کارە قێزەونە دەکەن بەمافێکی سروشتی ئینسانەکان، وەدەڵێن ئیسلام بەو کارە دەڵێت (زینا)، بەڵام ئێمە پێی دەڵێین پەیوەندیەکی سروشتی لە نێوان ژن و پیاودا کەپێویست ناکات هیچ کۆسپ و بەربەستێك لەبەردەمیدا دابنرێت. ئەوەی جێی داخ و سەرسوڕمانیشە کەسانێك داوای ئازادی زیناو لابردنی عەقدی شەرعی مارەکردن دەکەن، کەبە ڕەچەڵەك موسڵمانن و لەسەر ئوممەتی ئیسلام حیساب دەکرێن.

بەڕاستی ئەمە هاتەدی ئەم فەرموودە پیرۆزەیە کە (ابو مالـك)ی ئەسعەری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿ليكونن في أمتي أقوام يستلون الحر والحرير والخمر والمعازف﴾[1] واتە: (کۆمەڵانێك لە ئومەتەکەم پەیدا دەبن زیناکردن و ئاوریشم پۆشین و مەی خواردنەوەو مۆسیقا ژەندن حەڵاڵ دەکەن).

هەروەها (نواسی کوڕی سمعان) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ويبقى شرار الناس، يتهارجون تهارج الحمر، فعليهم تقوم الساعة﴾[2]، واتە: (زەمانێك دێت تەنها خەڵکی خراپ دەمێنێت، وکو گوێ سواری یەکتر دەبن قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت).

بەهەمان شێوە (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿والذي نفسي بيده لا تفنى هذه الأمة، حتى يقوم الرجل الى المرأة فيفترشها في الطريق، فيكون خيارهم يومئذٍ من يقول: لو واريتها خلف هذا الحئط)[3] واتە: (سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەم ئومەتە لەناو ناچێت تا زەمانێك بەسەردا دێت، پیاو هەڵدەستێت لەسەر ڕێگە ئافرەت ڕادەکێشێت، باشترین کەسی ئەو زەمانەش ئەوەیە بوێرێت پێی بڵێت: ئەگەر ببیەیتە پشت ئەو دیوارەوە باشترە).

بەڵێ دەیان ڕووداوی لەم جۆرە لە کوچەو کۆڵانەکانی شارێکی وەك ئەستەمبوڵدا دەبینرێت کە بۆ ماوەی (٥٠٠) ساڵ بنکەی خەلافەتی ئیسلامی و سەرچاوەی خواپەرستی و ڕەوشت و بەها پیرۆزە ئیسلامیەکان بوو، تەنانەت لەو شارەدا بازاڕی وای تێدایە، کە ئافرەت وەکو هەموو

---

[1] صحيح البخاري (١٠/١٥ مع الفتح).
[2] صحيح مسلم (١٨/٧٠ مع شرح النووي).
[3] رواه ابو يعلى، وقال هيثمي (رجاله رجال الصحيح) مجمع الزوائد(٧/٣٣١).

کالاّیەکی تر بەرِووتی و بەبێ هیچ بەرگ و پۆشاکێك لە جامخانەی تیاترۆخانەکاندا دانراوە و نرخی تایبەتیان لەسەرە.

هەوارگەی کەنار دەریاکان و باخچە گشتیەکان و مەلەوانگە تێکەڵەکانی ژن و پیاویش لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا هەمووی گەواهی هاتنە دی فەرمودەکانی پێغەمبەرن(ﷺ).

## شەشەم/ خواردنەوەی مەی و بە حەلاڵ زانینی:

(أنس ی کوڕی مالك) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من أشرط الساعة... ويُشرَبُ الخمر﴾[1]، واتە: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە مەی خواردن زۆر و ئاشکرا دەبێت).

هەروەها (عبادەی کوڕی صامت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لَتَستَحلَنَّ طائفة من أمتي الخمر بأسمٍ يُسمونها إياه﴾[2]، واتە: (کۆمەڵانێك لە ئومەتەکەم مەی حەلاڵ دەکەن و بەناوی تر ناوی دەبەن).

بەڵێ مەی خواردنەوە ئەمڕۆ بۆتە شتێکی عادەتی و، هیچ غەریب نیە بەهەر شارو شارۆچکەو ئاواییەکی موسڵمانانندا بڕۆیت، چەندین بارِ و مەی خانەو دوکانی مەی فرۆشتن دەبینیت، تەنانەت دوکانەکانی مەی فرۆشتن لە هەر شارێکدا بگریت دەیان ئەوەندەی کتێبخانەکان دەبن و ژمارەی بارِ و مەی خانەکانیش زۆر لە ژمارەی مزگەوتەکان زیاترن، وە لە هەوارگە و پارك و سەیرانگاکانیشدا زۆربەی خانەوادەکان بەپیاو و ژن و منداڵەوە بەشدار دەبن لە مەی خوردنەوە.

وە هەر لە فەرمودەکەی پێغەمبەریشدا(ﷺ) هاتووە کەکۆمەڵانێکی زۆر ئەمڕۆ مەی خواردنەوە بە حەرام نازانن و پێشی ناڵێن مەی بەڵکو پێی دەڵێن (مەشروباتی رِۆحی)، وە هەشیانە دەڵێن عارەق حەرامە بەڵام بیرە حەرام نیە و هەندێکیان دەڵێن ئەگەر زۆر بخۆیتەوە حەرامە، بەلاّم لەموناسەباتدا حەرام نیە و هەندێکیشیان دەڵێن بۆ گورچیلە باشەو دکتۆر بۆی نوسیوم. بەم شێوەیە هەزار و یەك بڕوبیانوو دروست دەکەن بۆ حەلاڵ کردنی مەی خواردنەوە پێیان وایە ئەگەر توانیان خۆیان و خەڵکی هەڵخەڵەتێنن، خواشیان پێ هەڵدەخەڵەتێت، خوا پەنامان بدات.

---

[1] صحيح مسلم (٢٢١/١٦ مع شرح النووي).

[2] رواه أحمد وابن ماجه وقال ابن حجر في الفتح (٥١/١٠): سنده جيد و صححه الألباني في صحيح الجامع الصغير (١٣/٦-١٤) رقم (٤٩٤٥).

## حەوتەم/ زۆربوونی ئامێری مۆسیقاو گۆرانی بێژان:

(سهل ی کوڕی سەعد) ڕەزای خـوای لێبێـت دەگێڕێـتەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿سیکون في آخر الزمان خسف و قذف و مسخ، قيل: ومتى ذلك يا رسـول الله؟ قـال: اذا ظهـرت المعازف والقينات﴾[1]، واتە: (لە ئاخرزەمان خاك ڕۆچوون و ئاگرباران و ڕوو وەرگێڕان زۆر دەبێت، وتیان: کەی ئەوە ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی هەرکاتێك ئامێری مۆسـیقا ژەنـدن و ئافرەتی گۆرانی بێژ زۆربوون).

وە لـە فەرمودەیەکی تردا (عومران ی کوڕی حصین) دەگێڕێتەوە کـە پیاوێـك لـە موسـڵمانان وتی ئەی پێغەمبەری خوا کـەی ئەوشـتانە ڕووئـەدات؟ ئـەویش فـەرمووی: ﴿اذا ظهـرت القينـات والمعازف و شربت الخمور﴾[2]، واتە: (هەر کاتێك گۆرانی بێژانی ئافرەت و ئامێری مۆسـیقا زۆربـوو وە عەرەقیش بە ئاشکرا دەخورایەوە).

هەروەها (ابن عباس) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ليبيتن اقوام مـن هـذه الأمـة على طعام و شراب و لهو، فيصبحوا قد مسخوا قردةً و خنـازير﴾[3]، واتـە: (کەسـانێك لـەم ئومەتـە شەوبەخوادن و خواردنەوە و گۆرانی وتن دەبەنە سەر کـەڕۆژیان لێدەبێـتەوە خـوای گـەورە ڕووی وەرگێڕاون و کردوونی بە مەیمون و بەراز).

(ابی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ليكونن من امتي اقوام يستحلون الحرَّ والحرير والخمـر والمعـازف﴾[4]، واتـە: (لـە ئومەتەکـەم کۆمـەڵێك پەیـدادەبن زیناکردن و ئاوریشم پۆشین و مەی خواردنەوەو ئامێری مۆسیقا ژەندن بە حەڵاڵ دەزانن).

بەڕاستی ئەمڕۆ هیچ شتێك هێندەی ئامێری مۆسیقاو گۆرانی بێژان زۆر نیە کە ناوی هونەرمەنـد و هونەرمەندان لەخۆیان دەنێن، وە ژمارەی تیپە مۆسیقی و گـۆرانی بێـژو مۆسـیقا ژەنـەکان هێنـدە زۆربووە لـە ژمارە نایەن، دەیان قوتابخانەو پەیمانگا هەیە بۆ فێرکردنی بەکارهێنانی ئامێرە مۆسـیقیەکان و بەرهەم هێنانی مۆسیقا ژەن و گۆرانی بێژی زیاتر، وە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و هۆکـانی ڕاگەیانـدنیش لـە خزمەتیاندایە، بەشێوەیەك ئەگەر هەردوو گوێشت بئاخنیت هـەر گوێـت لـە گـۆرانی و مۆسـیقا دەبێت.

---

[1] رواه ابن ماجه والطبراني و قال الألباني صحيح. صحيح الجامع الصغير(٣/٢١٦) رقم (٣٥٥٩).

[2] اخرجه الترمذي، وفي الصحيحة للألباني (٤/٢٩٣) رقم (١٧٨٧).

[3] رواه ابو نعيم في أخبار اصبهان، و في الصحيحة للألباني(٤/١٣٥) رقم (١٦٠٤).

[4] صحيح البخاري (١٠/٥١ مع الفتح) وفي صحيحة للألباني.

تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لەو موسـلّمانانەش کەپابەنـدن بـە ئیـسلامەوە پێـان وایـە گـۆرانی و بەکارهێنانی هەموو چەشنە ئامێرەکانی مۆسیقا هیچ حەرام نیەو کارێکی پەسەندە کە ئەمـەش ڕاسـتی هاتنەدی فەرمودەکانی پێغەمبەرە(ﷺ).

## هەشتەم/ زۆربوون و بڵاوبوونەوەی سوخۆری و کەمبوونەوەی پارەی حەڵاڵ:

(ابن مسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێـتەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿بـين يـدي الـساعة يظهر الربا﴾[1]، واتە: (لە پێش هاتنی قیامەتدا سوخۆری زۆر دەبێت و بڵاودەبێتەوە).

هەروەها (أبو هريرە) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿ليـأتين غلـى النـاس زمـان لايبالي المرء بما أخذ المال، أمن حلال أم من حرام﴾[2]، واتە: (زەمانێك بەسەر خەڵکیدا دێت، ئینـسان گوێنەداتێ پارەکەی لەکوێوە پەیدا دەکات، لە حەڵاڵەوە یان لە حەرامەوە).

(حذيفه ی یەمانی) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿لاتقـوم الساعة حتى يعز الله فيه ثلاثا، درهما من حـلال وعلمـا مـستفادا وأخـا في الله عـز وجـل﴾[3]، واتـە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا خوای گەورە وادەکات سێ شت لە دونیادا زۆر دەگمەن بن، درهەمێك لە حەڵاڵ و زانستێك سودی هەبێت و وەبرایەکیش لەڕێی خوادا).

ئەم فەرمودانە باس لە بارودۆخی ئەمڕۆی موسڵمانان دەکەن، بەشی هەرە زۆری خەڵکی ئەمڕۆ تەنها مەبەستیان پارە پەیداکردنە بێ ئەوەی بیر لە حەڵاڵیی یان حەرامیی ئەو پارەیە بکەنەوە، یان ئـەو ڕێگەیەی کەپێی پەیدا دەکەن، هەر کاتێ: کە دەستی بۆ دەبەیت بەڕێگەیەك لە ڕێگـەکان حـەرامی تێکەڵ بووە، تا وای لێهاتووە دینارێکی حەڵاڵ بـووە بەشـتێکی دەگمـەن، لەولاشـەوە سـووخۆری بووەتە بنەمای ئابووری ئەمڕۆ لـە ئاستی گشت دەوڵەتان و کۆمپانیا بازرگانیەکان و سەرمایەدارەکان و خەڵکانێکی زۆریشدا، کە کارە ئابووری و مامەڵە بازرگنیەکانیان هەر هـەمووی لەسـەر بنـەمای سوو وەرگرتن دامەزراوە و گشت بانکەکانی جیهانیش ئەمڕۆ هەر لەسەر ئەو بنەمایە کاردەکەن، کە ئەمەش بووەتە مایەی ئەوەی هاوڵاتیان جـەماوەری موسـڵمان بەگـشتی بەچـاری ناچـارەوە مامەڵـە لەگەڵ ئەو دەزگا سووخۆریانەدا بکەن و دەست تێکەڵی ئەو تاوانە بکەن کەخوای گـەورە نـەفرینی

---

[1] رواه الطبراني كما في الترغيب والرهيب للمنذري (٩/٣) وقال (رواته رواة الصحيح).
[2] صحيح البخاري(٣١٣/٤-مع الفتح) سنن النسائي (٢٤٣/٧).
[3] رواه دلي وعزاه في الجامع الصغير للطبراني ولأبي نعيم في الحلية(١١٧/٤) عن حذيفة وقال الهيثمي: (فيه روح بن صلاح ضعفه ابن عدي ووثقه الحاكم وابن حبان وبقية رجاله ثقاة)، مجمع الزوائد (ڕۆذمەڵآت/١٧٢).

لە ئەنجامدەرانی کردووە و پێغەمبەر(ﷺ) سەرھەڵدانی ئەم حاڵەتە نامۆو دزێو و دژ بە شەریعەتە و بڵاوبوونەوەی بەم شێوازەی کە ئەمڕۆ دەیبینین کردۆتە یەکێك لەنیشانەکانی قیامەت.

## نۆیەم/ گرنگی دان بە ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان:

(أنس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يتباهى الناس في المساجد﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا خەڵکی گرنگیەکی زۆر دەدەن بە ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و شانازی پێوەدەکەن).

وە هەر (ئەنەس) ڕەزای خوای لێبێت لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من أشرط الساعة أن يتباهى الناس في المساجد﴾[2]، واتە: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە خەڵکی بایەخێکی زۆر دەدەن بە ڕازاندنەوەو نیگار کێشانی مزگەوتەکان).

ئیمامی بوخاریش لە (صحيح البخاري)دا دەڵێت ئەنەسی کوڕی مالك فەرمووی: ﴿يتباهون بها ثم لا يعمرونها إلا قليلا....﴾، واتە: (دەیڕازێننەوە بەڵام زۆر بەکەمی ئاوەدان دەبێت و خەڵك ڕووی تێدەکات). وە (ابن عباس) دەفەرموێت: (لتزخرفنها كما زخرفت اليهود والنصارى) واتە: (بەنەقش و نیگار دەیانڕازێننەوە هەر وەکو چۆن جولەکەو دیانەکان بەنەقش و نیگار کڵێسەکانیان دەڕازێننەوە﴾[3]

وە پێغەمبەر(ﷺ) هەڕەشەی لەناوچوون و کاول بوون لە ئومەتەکەی دەکات هەر کاتێك مزگەوت و قورئانەکانیان بە نەقش و نیگار ڕازاندەوە ئەوەتا (ابي الدرداء) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿أذا زوقتم مساجدكم حليتم مصاحفكم فالدمار عليكم﴾[4]، واتە: (هەر کاتێك مزگەوتەکانتان جوان و پڕ زەوق کرد و قورئانەکانتان نەخشاوە و ڕازاوە کرد، ئەوا کاولکاری و تیاچوون بەشتانە).

هەر بۆیەشە(عومەری کوڕی خەتاب) ڕەزای خوای لێبێت نەهی کردووە لە نەخشاندن و ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان چونکە خەڵکی لە نوێژدەکات و خەیاڵیان پەرت دەکات وە کاتێك کە

---

[1] رواه أحمد وقال الألباني(صحيح). صحيح الجامع الصغير (١٧٤/٦) رقم (٧٢٩٨).

[2] رواه النسائي وقال الألباني صحيح. صحيح الجامع الصغير (٢١٣/٥) رقم (٥٧٧١) وصحيح ابن خزيمة (٢٨٢/٢)(رقم ١٣٢٢-١٣٢٣) تحقيق د. محمد مصطفى الأعظمي وقال (اسناد صحيح).

[3] صحيح البخاري (٥٣٩/١-مع الفتح) كتاب الصلاة باب بنيان المسجد.

[4] رواه الترمذي وقال الألباني (اسناد حسن). صحيح الجامع الصغير(٢٢٠/١) رقم (٥٩٩) وفي الصحيحة (٣٣٧/٣)رقم (١٣٥١).

مزگەوتەکەی پێغەمبەریان(ﷺ) لە سەردەمی ئەودا تازەکردەوە فەرمووی: ﴿أكنوا الناس من المطر، وأياك من تحمر أو تصفر فتفتن الناس﴾[1]، واتە: (وا دروستی بکەن خەڵکی باران لێیان نەدات، بەڵام نەکەن سووری بکەن یان زەردی بکەن و خەڵکیی تووشی فیتنە بکەن).

بەڵێ خەڵکی ئەمڕۆ تەنها ئامۆژگاریەکەی عومەریان پشت گوێ نەخستووە و بەس، بەڵکو کار لە سوور کردن و زەردکرن تێپەڕیووەو مزگەوتەکانی ئەمڕۆ بەهەزارو یەك شێوە نەقش و نیگار ڕازێندراونەتەوەو هەموو جۆرەکانی هونەری نەخشاندن و نیگار کێشان پێشبڕکێی تێدا دەکەن، خەڵکی ئەمڕۆ وادەزانێ مزگەوت و ئاوەدان کردنەوەی لەڕێگەی ڕازاندنەوەو دیکۆرکاریەوە دەبێت، بێ ئاگا لەوەی کە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت لەڕێی عیبادەت و زیکر و قورئان خوێندن و خوێندنی زانستی شەرعی و هاتوو چۆی بەردەوامیەوە دەبێت.

مزگەوتەکان ئەمڕۆ جوان و ڕازاوەو نەخشێندراون، بەڵام چەند کەمن ئەوانەی ڕوویان تێدەکەن و بەزیکر و فیکر و ویرد و عیبادەت ئاوەدانیان دەکەنەوە، قورئانەکان ئەمڕۆ دەنەخشێنرێن و بەئاوی ئاڵتوون ڕووکەش دەکرێن، بەڵام چەند کەمن ئەوانەی ڕێز لە قورئان دەگرن و هەقی خۆی دەدەنێ و کاری پێدەکەن.

ئەمڕۆ لە کاتێکدا مزگەوتەکان هەزاران هەزار دینار بۆ دروستکردنی گومەزەو منارەو دیکۆرسازیەکەی بەکاردەهێنرێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ڕێ دەگیرێت لە موسڵمانان کەبەبەردەوامی هاتوچۆی بکەن و ئاوەدانی بکەنەوەو شەریعەتی خوای تێدا فێربن، ئێستا مزگەوتەکان وەك فەرمانگەکانی تری میری کاتی دەوامیان دیاریکراوە، چارەکێك پێش بانگ دەکرێنەوەو چارەکێکیش دوای بانگ دادەخرێن و خوێندنی زانستی شەرعی و ووتنەوەی وانەی ئاینیش تیایدا قەدەغەیە.

تەنانەت لەهەندێ لەدەوڵەتەکاندا وەك تورکیای کەمالیی ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر لەمزگەوتە کۆن و ناودارەکان کراونەتە مۆزەخانەو هەوارگەی سەیرانچی یەکان، کە ڕۆژانە هەزاران گەشتیار لە جولەکەو دیانو بوذی و گاپەرستەکان بە شۆرتو مایۆی غەربیەوە ڕووی تێدەکەنو تیایدا دەسوڕێنەوەو بە کامێراکانیان وێنەی دەگرن، وە تەنها نوێژی جومعە نەبێت ڕێنادرێت نوێژەکانی تری تێدابکرێت، وە ئەگەر لە ڕۆژەکانی تردا لەسوچێك یان لە پەنایەکی مزگەوتەکەدا موسڵمانێك دوو ڕکعەت نوێژ بکات ئەوا عەدەسەی دەیان کامێرای گەشتیارە بیانیەکان ڕووی تێدەکەنو

[1] صحيح البخاري (١/٥٣٩–مع الفتح).

ڕێنەی دەگرن وەك ئەوەی شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیان دیبێت کەسێك لەناو مزگەوتدا نوێژ بکات.

ئەمە لە لایەکەوە حاڵی مزگەوت بەدەست دوژمنانی ئیسلامەوە، لەلایەکی تریشەوە مزگەوت بەدەست ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانی ناحاڵیی خۆشمانەوە دەناڵێنێت. بەداخەوە خەڵکانێکی زۆر لەو موسڵمانانەی کە هاتوچۆی مزگەوت دەکەن و ڕوی تێدەکەن بێئاگان لە ئادابی مزگەوت و چۆنیەتی پاراستنی حورمەتی ئەو جێگە پیرۆزە، زۆرجار دەبینیت هەندێك لە پیاوە بەساڵاچووەکان یان کەسانێك تازە ڕوویان لەمزگەوت کردووە مزگەوت بەشوێنی حەوانەوەو کۆڕو کۆبوونەوەی دنیایی دەزانن، دەنگی تێدا بەرزدەکەنەوەو باسی چەندین مەسەلەو کاروباری دنیای تێدا دەکەن و ڕێی نوێژو قورئان خوێندنیش لە خەڵك دەگرن، کەئەمەش کارێکە خوای گەورە غەزەبی لێدەگرێت و پێغەمبەریش(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا کە(بیهقی) لە ئیمام (حسن)ەوە بە (مرسل)ی ڕیوایەتی دەکات دەفەرموێت: ﴿يأتي زمان على الناس يكون حديثهم في مساجدهم في أمر دنياهم فلا تجالسهم فليس لله فيهم حاجة﴾[1]، واتە: (زەمانێك دێت بەسەر خەڵکیدا قسەی ناو مزگەوتەکانیان هەر باسی کاروباری دنیا دەبێت، ئێوەش لە کۆڕو مەجلیسیاندا دەمەنیشن، چونکە خوای گەورە کاری پێیان نییە).

وە یەکێکی تر لە شێوازەکانی ڕێزنەگرتنی مزگەوت و ماڵی خوا لەلایەن موسڵمانانەوە ئەوەیە کەژمارەیەکی زۆری مزگەوتەکان وەکو ڕێگەی لێهاتووە خەڵکی هاتوچۆی پێدا دەکەن و تەنانەت دوو ڕکات نوێژیشی تێدا ناکەن کەئەم ڕەفتار و کردەوەیە بەرامبەر بە ماڵی خوا هەرگیز لەسەردەمانی پێشوودا لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا نەبووە بەڵام ئەمڕۆ هێندە زۆربووەو، بووەتە شتێکی عادەتی.

ابن مسعود دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿(أنس ی کوری مالك) من أشراط الساعة يمر الرجل بالمسجد لايصلي فيه ركعتين﴾[2]، واتە: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە پیاو بەمزگەوتدا تێدەپەڕێت کەچی دوو ڕکات نوێژی تێدا ناکات).

وە هەر ابن مسعودیش لەڕیوایەتێکی تردا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿(أنس ی کوری مالك) من أشراط الساعة ان تتخذ المساجد طرقا﴾[1]، واتە: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە مزگەوتەکان دەکرێن بەڕێگای هاتوچۆ).

---

[1] رواه البيهقي عن الإمام حسن مرسلا.

[2] صحيح ابن خزيمة (٢/٢٨٣-٢٨٤) وفي صحيحة للألباني (م٢/٢٥٣) رقم (٦٤٩).

ئەمانە هەمووی نیشانەی قیامەتن کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردووە و ئـەمڕۆ هـەموو خـەڵك بـە چاوی خۆی دەیان بینێت.

## دەیەم/ زۆربوونی کوشتن وکوشتـار:

هەرچەندە لە بەشی یەکەمدا باسی ئەم نیشانەیەمان کرد بەڵام لەبەر ئەوەی هەتا ئەمڕۆ دیاردەی کوشـتن و کوشتار هەر بەردەوامە لەنێوان موسـڵمانانـدا بەڵکو بەداخەوە چـەندین ئەوەنـدەی جـاران زیادی کردووە. بۆیە بەپێویستمان زانی لەم بەشەشدا تیشکێکی زیاتری بخەینە سەر.

(أبو هريره) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لاتقـوم الـساعة حتـى يكثـر الهـرج، قالوا: وما هرج يارسول الله؟ قال: القتل القتل﴾[2]، واتـه: (قیامـەت هەڵناسـێت هـەتا (هـەرەج) زۆر دەبێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا هەرەج چییە؟ فەرمووی (کوشتن، کوشتن)).

(ابن مسعود)یش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿بـين يـدي الـساعة أيـام الهـرج، يزول فيها العلم، ويظهر فيها الجهل﴾[3]، واتە: (لەپێش هـاتنی قیامەتـدا ڕۆژانـی کوشـتن و کوشـتار سەرهەڵدەدات، زانیاری (مەبەست پێی زانیاری شەرعییە) تێدا نامێنێت و نەزانین زۆر دەبێت).

(ابو موسی ی ئەشعەری)یش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ان بين يدي الـساعة الهرج قالوا وما الههرج قال القتل أكثر مما نقتل انا لنقتل في العام الواحد أكثر من سبعين ألفا قـال إنـه ليس بقتلكم المشركين ولكن قتل بعضكم بعضا قالوا ومعنا عقولنا يومئذ قال إنه لينـزع عقـول أكثـر أهل ذلك الزمان ويخلف له هباء من الناس يحسب أكثرهم انه على شيء وليسوا على شيء﴾[4]، واتە: (لەپێش هاتنی قیامەتدا هەرەج سەرهەڵدەدات، ووتیان هەرەج چـییە؟ فـەرمووی: کوشـتن، ووتیـان جالەوە زیاتر کە ئێمە دەکوژین، ئێمە لە یەك ساڵدا زیـاتر لـە حـەفتا هـەزار دەکـوژین، فـەرمووی ئەوکوشتنەی من باسی دەکەم کوشتنی کـافر و بێ بڕوایـان نیـە، بـەڵکو خۆتـان لـەناو خۆتانـدا یەکتردەکوژن، جالەوکاتەدا عەقڵ و هۆشمان لای خۆمانە؟ فـەرمووی: زۆربـەی خـەڵکی ئەوزەمانـە عەقڵیان هەڵدەگیرێت و خەڵکێکی هیچ و پوچ دەمێننەوە کە زۆربەیان پێـیان وایـە لەسـەر شـتێکن بەڵام لەسەر هیچیش نین).

---

[1] منحة المعبود في ترتيب مسند الطيالسي (٢/٢١٢) ومستدرك الحاكم (٤/٤٤٦) وقال هذا حديث صحيح الأسناد. وقال الذهبي (موقوف).

[2] صحيح مسلم (١٨/١٣-مع شرح النووي).

[3] صحيح البخاري (١٣/١٤ مع الفتح).

[4] صحيح رواه ابن ماجه والبغوي في شرح السنة، أنظر صحيح الجامع الصغير (٢/١٩٣) رقم (٢٠٤٣).

کەواتە فەرموودەکان بەڕوون و ئاشکرایی باس لە کوشتاری موسڵمانان دەکەن لەنێوان خۆیاندا، موسڵمان ئەمڕۆ لەناوخۆیاندا بوون بە هەزار بەرەوە، هەر کۆمەڵەو خۆی بەشت دەزانێت و کۆمەڵەکانی تر بەهیچ، بەشی زۆری ئەو خەڵکەش عەقڵ و هۆشی بەدەستی خۆی نەماوە، هەریەکەو لەژێر ئاڵا و ڕەنگ و دروشم و ناوێکی تایبەتدا شەڕ لەگەڵ ئەوی تردا دەکات، لەپێناوی بێنرخترین شتدا یەکتر دەکوژن، خوێن بووە بە بێ نرخترین شت و کوشتنیش ئاسانترین کارە، کار گەیشتۆتە ڕادەیەك زۆرجار بکوژ نازانێت لەسەر چی دەکوژێت و کوژراویش نازانێت لەسەر چی کوژراوە، هەروەك (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿والذي نفسي بيده لاتذهب الدنيا حتى يأتي على الناس يوم لايدري القاتل فيم قتل ولا المقتول فيم قتل فقيل كيف يكون ذلك؟ قال الهرج القاتل و المقتل في النار﴾[1]، واتە: (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە دونیا نابڕێتەوە هەتا ڕۆژێکی وا بەسەر خەڵکیدا دێت بکوژ نازانێت لە پێناوی چیدا دەکوژێت، کوژراویش نازانێت لەسەرچی کوژراوە، ووتیان ئەوە چۆن ڕوودەدات؟ فەرمووی: هەرەجە، بکوژ و کوژراو دەچنە ئاگری دۆزەخەوە).

بەڵێ فەرموودەکەی پێغەمبەرە(ﷺ) عەقڵی زۆربەی خەڵکی ئەم زەمانە هەڵگیراوە و کەسانێك ماونەتەوە هەموو شتێك دەزانن تەنها شەرعی خولنەبێت وەشوێن هەموو ڕێچکەو ڕێبازێك دەکەون تەنها ئیسلام نەبێت، هەموو شتێك لە دڵیاندا هەیە تەنها ترسی خوانەبێت، هەر بۆیە خۆ خۆری و کوشت و کوشتار و خوێن ڕشتنی بە ناحەق بووەتە ڕەفتار و پیشەی بەناو موسڵمانانی ئەم زەمانە، بکوژ و کوژراویشیان بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەهلی دۆزەخە، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەشدا هەر موسڵمانێك بتوانێت خۆی دورەپەرێز بگرێت لەکاتی ڕوودانی ئەو فیتنەو هەرەجانەدا وە بەندایەتی خوای خۆی بەرێکوپێکی بکات ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) لەدەرهەقیدا دەفەرموێت: ﴿العبادة في الهرج كهجرة الي﴾[2]، واتە: (بەندایەتی کردن بۆ خوا لەکاتی فیتنەی هەرەجدا، هێندەی کۆچکردنێك بۆلای پێغەمبەر خێری هەیە).

## پانزەیەم/ بەرزکردنەوەی بیناو خانووبەرە:

(أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە(جبريل)ی فەرموو کاتێك پرسیاری نیشانەکانی قیامەتی لێکرد: ﴿واذا تطاولة رعاء البهائم في البنيان، فذاك من أشراطها﴾[3]،

---

[1] صحيح مسلم (٣٥/١٨-مع شرح النووي).
[2] صحيح مسلم، رقم (٢٩٤٨)، وصحيح ابن ماجه للألباني (ج٢/٣٦٢) رقم (٣٩٨٥).
[3] صحيح البخاري (١/١١٤-مع الفتح) وصحيح مسلم (١/١٦١-١٦٤).

واتە: (هەرکاتێك شوانی مەڕ و بزنەکان خانووی بەرز و قات قاتیان دروستکرد، ئەوە یەکێکە لەنیشانەکانی). وە لە ڕیوایەتێکی تری ئیمامی موسلیمدا: ﴿وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاة يتطاولون في البنيان﴾[1]، واتە: (یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە پێ پەتیە ڕووت و برسیەکان کە شوانی مەڕ و بزن بوون ببینیت خانووی بەرز و قات قات دروست بکەن). وە لە ڕیوایەتێکدا کە (ئیمام أحمد) لە (ابن عباس)ی دەگێڕێتەوە دەڵێت: ﴿يارسول الله ومن اصحاب الشاة الحفاة الجياع العالة؟ قال العرب﴾[2]، واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا ئەو خاوەن مەڕ و بزنە ڕووت و برسیانە کێن؟ فەرمووی عەرەب).

وە لە ڕیوایەتێکی تریشدا کە (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لاتقوم الساعة.... حتى يتطاول الناس في البنيان﴾[3]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا خەڵکی خانووی قات قاتی بەرز دروست دەکەن).

بەڵێ فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتوونەتەدی و خەڵکی ئەمڕۆ بیانی وا دروست دەکەن کەلە دەیان نهۆم پێکهاتووە بەتایبەتی ئەو عەرابانەی هەتا دوێنێ ڕووت و پێ پەتی بوون و مەڕ و بزنیان دەلەوەڕاند و نان نەبوو بیخۆن و بەشی زۆریان لەچادرو خێوەتگادا دەژیان یان لە خانووی گڵ دا دەژیان کە بستێك لە بالآی خۆیان بەرزتر نەبوو، ئەمڕۆ دەیانبینین لە ژێر سایەی نەت و پترۆڵدا هەمووی لە خانووی چەند نهۆمیدا دەژین و سەدان و هەزاران کۆشکی وایان دروستکردوە کە دورگەی عەرەبی لەمێژووی تەمەنیدا شتی وای بەخۆیەوە نەدیوە، کە ئەمەش بەپێی فەرموودەکان یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت.

## دوانزەیەم/ لێك نزیك بوونەوەی کات و لێك نزیك بوونەوەی بازاڕەکان:

(أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى.... يتقارب الزمان﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا کات لە یەك نزیك دەبێتەوە). وە لەریوایەتێکی تردا (أبو هريرە) و (أنس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوایان لێبێت دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان فتكون السنة كالشهر ويكون

---

[1] صحيح مسلم (١٥٨/١-مع شرح النووي)

[2] مسند احمد (٣٣٢/٤-٣٣٣) رقم (٢٩٢٦) شرح احمد شاكر وقال (اسناده صحيح) وقال الألباني اسناده لابأس به في الشواهد. انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة(٣٣٢/٣) رقم (١٣٤٥).

[3] صحيح البخاري (٨١/١٣-٨٢-مع الفتح).

[1] صحيح البخاري (٨١/١٣-٨٢ مع الفتح).

لشهر كالجمعة وتكون الجمعة كاليوم ويكون اليوم كالساعة وتكون الساعة كاحتراق السعفة﴾[٢]، واته: (قيامەت هەڵناسێت هەتا كات لێك نزيك دەبێتەوە، ساڵ وەك مانگی لێدێت و مانگ وەك هەفتەی لێدێت و هەفتە وەكو رۆژێكی لێدێت و رۆژێك وەكو سەعاتێكی لێدێت و سەعاتێكیش وەكو سوتانی پوشێكی دارخرمای لێدێ).

ئەم فەرمودانە كەباس لە لێك نزيك بوونەوەی كات دەكەن لەلايەن زاناكانەوە بەچەند شێوازێكی جیاواز لێك دراونەتەوە كە پێمان وایە گونجاوترينيان ئەوەيە كە باس لە ئەمڕۆی خۆمان دەكات كەتوانراوە بە هۆی هۆكارەكانی گواستنەوەی پێشكەوتووی ئەم سەردەمە وەكو(ئۆتۆمبێل و فڕۆكە و شەمەندەفەر و مانگی دەستكردەوە) ئەوكاتانەی كەپێشتر پێويستی دەكرد بۆ گواستنەوە و هاتوچۆ لەنێوان شوێنە جیاجیاكاندا كورت بكرێنەوەو لێك نزيك بكرێنەوە تاوای لێهاتووە ئەورێگەيەی كە بە ساڵێك يان مانگێك يان هەفتەيەك ببڕدرێت ئێستا زۆر بەكەمتر لەو كاتە ببڕدرێت، وە لە فەرمودەكانی تريشدا كە (أبو هريرە) ڕیوایەتی دەكات دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى تظهر الفتن ويكثر الكذب وتتقارب الأسواق﴾[٣]، واتە: (قيامەت هەڵناسێت هەتا فيتنەو ئاژاوە سەر هەڵدەدات و درۆكردن زۆر دەبێت و بازاڕەكانيش لێك نزيك دەبنەوە) نزيك بوونەوەی بازاڕيش لەم فەرمودەيەدا هەر وەك نزيك بوونەوەی كات وایە، ئەوەتا بازاڕاكانی جيهان ئەمڕۆ بەهۆی هۆكارەكانی گەياندن و پەيوەندی كردنەوە وەك يەك بازاڕيان لێهاتووەو تەواو لێك نزيك بوونەتەوە، بەڕادەيەك كە سەركەوتن يان دابەزينی نرخی كاڵاو دراوەكان لەهەر بازاڕێكی جيهاندا دەستوبرد ڕەنگدانەوەی دەبێت لەهەموو بازاڕەكانی جيهاندا و كاردەكاتە سەريان. وەبازاڕەكان بەردەوام ئاگادارن لەيەكتر، بەمەش بازاڕەكان لەيەكتر نزيك بوونەتەوە و كاتيش لێك نزيك بووەتەوە، كەئەمەش بە پێی فەرموودەكان پێغەمبەر(ﷺ) يەكێكە لە نيشانەكانی قيامەت.

---

[٢] رواه أحمد عن أبي هريرة والترمذي عن أنس. وقال الهيثمي رجاله رجال الصحيح. مجمع الزوائد (٣٣١/٧) وفي صحيح الجامع الصغير(١٧٥/٦) رقم (٧٢٩٩).

[٣] رواه أحمد وقال الهيثمي: ((رجاله رجال الصحيح غير سعيد ابن سمعان وهو ثقة)) مجمع الزوائد (٣٢٧/٧).

## چەند فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر(ﷺ) کەباس لەهەندێ نیشانەکان دەکات کەتا ئەمڕۆ هاتوونەتەدی و ئێستاش بە چاو دەبینرێن

١- (عبدالله ی کوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يظهر الفحش والتفاحش، وقطيعة الرحم، وسوء المجاورة﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا خراپەکاری و داوێن پیسی و بچڕاندنی صیلەی ڕەحم و خزمایەتی، و دراوسێ خراپی زۆر دەبێت و ئاشکرا دەبێت).

٢- (ابن عباس) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يكون قوم يخضبون في آخر الزمان بالسواد كحواصل الحمام، لا يريحون رائحة الجنة﴾[2]، واتە: (لە ئاخرزەماندا خەڵکانێك دەبن سەرو ڕیشیان بۆیەی ڕەش دەکەن وەك ژێر چەنەی کۆتر بۆنی بەهەشت ناکەن). وە پێدەچێت مەبەست لە ژێرچەنەی کۆتر لە فەرمودەکەدا ئەوکەسانەبێت کە ڕیشیان لە هەردوولاوە دەتاشن، بەڵام لەئاستی چەناگەو ژێر ملیاندا دەیهێڵنەوە هەروەك ژێرچەنەی کۆتر کە ئەمڕۆ دەبینین خەڵکانێکی زۆر ڕیش و سمێڵیان بەو جۆرە هێشتۆتەوە.

٣- (ابن مسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿بين يدي الساعة تسليم الخاصة وفشو التجارة حتى تشارك المرأة زوجها في التجارة﴾[3]، واتە: (پێش هاتنی قیامەت وای لێدێت سەلام تەنها لەدۆست و ناسیاو دەکرێت، وە بازرگانی زۆر بەربڵاو دەبێت هەتا وای لێدێت ئافرەتیش لەگەڵ مێردەکەیدا بەشداری دەکات لەکارو کاسبی و بازرگانیدا).

٤- (عەمری کوڕی تغلب) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن من أشراط الساعة أن يفشو المال و يكثر، وتفشوا التجارة﴾[4]، واتە: (لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە پارە بڵاودەبێتەوەو زۆر دەبێت و بازرگانیش زۆر بەبڵاو دەبێت).

---

[1] مسند أحمد (١٠/٢٦-٣١- شرح أحمد شاكر) وقال اسناده صحيح و مستدرك الحاكم (١/٧٥-٧٦)وصححه ووافقه الذهبي.

[2] مسند امام أحمد (٤/١٥٦) رقم (٢٤٧) شرح أحمد شاكر وقال صحيح. وقال الألباني أخرجه أبو داود والنسائي و أحمد والضياء.... بإسناد صحيح على شرط الشيخين.

[3] مسند أحمد (٥/٣٣٣-شرح أحمد شاكر) وقال اسناده صحيح. ومستدرك الحاكم (٤/٤٤٥-٤٤٦).

[4] رواه أحمد والنسائي وفي الصحيحة الألباني (م٢/٢٥١-٢٥٢).

٥- (أنس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يأتي على الناس زمان الصابر على دينه كالقابض على الجمر﴾[1]، واتە: (زەمانێك بەسەر خەڵکیدا دێت ئەو کەسەی ئارام دەگرێت لەسەر دینەکەی وێنەکەی وەکو ئەوە وایە پشکۆیەك ئاگری لەمشت گرتبێت).

٦- (أنس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من اقتراب الساعة ان يرى الهلال قبلا لليلة، فقال لليلتين﴾[2]، واتە: (لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی قیامەت ئەوەیە مانگی یەك شەوە گەورە دەردەکەوێت بەشێوەیەك کەشەوی یەکەم دەبینرێت، دەوترێت دووشەوەیە).

٧- (عبدالله ی کوڕی عمر) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يأخذ الله شريطته من أهل الأرض، فيبقا فيها عجاجة، لايعرفون معروفا، ولاينكرون منكرا﴾[3]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت تا خوای گەورە پیاوچاکانی سەرزەوی دەباتەوە بۆلای خۆی،ئیتر تێکەڵەیەك دەمێنێتەوە نەچاکیان پێچاکەو نەخراپیان پێ خراپە).

٨- (عمرە یکوڕی شعیب) لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يأتي زمان على الناس يغربلون فيه غربلة، يبقى منهم حثالة، قد مرجت عهودهم و أماناتهم، وأختلفوا فكانوا هكذا، وشبك بين أصابعه﴾[4]، واتە: (زەمانێك دێت بەسەر خەڵکیدا چاکەکانیان لە بێژن دەدرێن ئیتر کەسانێکی پوچەڵ دەمێننەوە پەیمان و ئەمانەتیان تێکەڵ بووە و نەماوە و جیاوازی و دووبەرەکی کەوتۆتە نێوانیان و ئاوایان لێدێت(پەنجەکانی دەستی تێکەڵ کرد)).

٩- (معاذ ی کوڕی انس) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لاتزال الأمة على شريعة حسنة مالم تظهر فيهم ثلاث، مالم يقبض منهم العلم ويكثر فيهم ولد الحنث، ويظهر فيهم الصقارون، قالوا: وما الصقارون؟ قال: نشو يكونون في آخر الزمان تكن تحيتهم بينهم اذا

---

[1] رواه الترمذي. صحيح الجامع الصغير(١٣٢٦/٢) رقم (٨٠٠٢).

[2] صحيح الجامع الصغير(٢١٤/٥) وقال الألباني رواه الطبراني في(الأوسط) والضياء المقدسي وهو(حسن).

[3] مسند أحمد (١٨١/١١-١٨٢) شرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح ومستدرك الحاكم(٤٣٥/٤) وقال هذا حديث صحيح ووافقه الذهبي.

[4] مسند أحمد(١٢/١٢شرح أحمد شاكر) وقال اسناده صحيح. ومستدرك الحاكم (٤٣٥/٤) وقال هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه ووافقه الذهبي.

تلاقوا التلاعن﴾[1]، واته: (ئەم ئومەتە لەسەر ڕێگەی ڕاست دەمێنێتەوە تا ئەو كاتەی سێ شت لەناویاندا سەر هەڵدەدات هەتا ئەوكاتەی زانستی شەرعی لەناویاندا هەڵئەگیرێ و منداڵی زۆڵیان تێدا زۆربێت و(صقارون)یان تێدا پەیدابێت وتیان صقارون كێن؟ فەرمووی: كەسانێكی هەرزە و تازە پێگەیشتوون لە ئاخر زەماندا پەیدا دەبن كاتێك كە بەیەك دەگەن لەبری سەلام كردن جوێن و لەعنەت ئاڕاستەی یەكتر دەكەن).

بەڵێ ئەم جۆرە كەسانە ئێجگار زۆرن كە لە بری سەلام كردن بەووشەی زۆر بێ ئەدەبانە یەكتر بانگ دەكەن و چاكوچۆنی لەگەڵ یەكتر دەكەن، ڕۆژانە دەیان كەس لەوانە دەبینین كەهەر لە دوورەوە ووشەی (هەتیو، خوێڕی، ناپیاو، گەواد......) زۆرجاریش كوفری زۆر گەورەی وەك (كوڕی خوا، كوڕی ئاسمان) بەكاردەهێنن، خوای گەورە پەنامان بدات.

١٠- (ابن مسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ان الإسم بدأ غريباً وسيعود غريباً كما بدأ فطوبى للغرباء، قيل: من هم يارسول الله؟ قال: الذين يصلحون اذا فسد الناس﴾[2]، واته: (بەڕاستی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێكرد، لەكۆتاییشدا بەنامۆیی دەگەڕێتەوە بەهەمان شێوە كەدەستی پێكرد، جائافەرین و خۆشبەختی بۆ نامۆكان وتیان كێن ئەوان ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوانەی كەچاك دەكەن كاتێك كە خەڵك خراپ دەبن).

١١- (أنس ی كوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كەووتیا ئەی پێغەمبەری خوا كەی دەست لە فەرمان بەچاكەو ڕێگە گرتن لە خراپە هەڵگرین و وازی لێبهێنین؟ ئەویش فەرمووی: ﴿اذا ظهر فيكم ما ظهر في بني اسرائيل اذا كانت الفاحشة في كباركم والملك في صغاركم والعلم في رذالكم والمداهنة في خياركم﴾[3]، واته: (هەركاتێك گەورەكانتان دەستیان دایە داوێن پیسی و دەسەڵاتیش بەدەست منداڵ و هەرزەوە بوو و زانست و زانیاریش لەلای كەسانی كەم نرخ بوو، پیاو چاكەكانیش دووڕوو و ماستاوچی بوون).

١٢- (ابو امامە ی باهلی) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لينقضن عرى الإسلام عروة عروة فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها و اولهن

[1] رواه أحمد (٤٣٩/٣) قال في المجمع (٢٠٢/١) وفيه ابن لهيعة وزبان، وكلاهما ضعيف وقد وثقا وقد تابعة ابن لهيعة رشدين، ورواه الطبراني في الكبير (١٦١/٢٠) رقم (٤٣٩) ورواه الحاكم ايضاً.

[2] صحيح رواه أحمد والترمذي وابن ماجه والدامي والبغوي وفي الصحيحة الألباني(٢٦٧/٣-٢٦٨) رقم (١٢٧٣).

[3] اخرجه الأمام أحمد في المسند(١٨٧/٣) وابن ماجه في سننه (١٣٣١/٢) رقم (٤٠١٥) وقال البوصيري: اسناده صحيح ورجاله ثقات. مصباح الزجاجة (٣٠٠/٢ رقم ١٤١٢).

نقضا الحكم وآخرهن الصلاة﴾[1]، واته: (بەڕاستی گرێکانی ئەم ئیسلامه گرێ بەگرێ هەڵدەوەشێت و دەکرێنەوە، هەرکە گرێیەك هەڵوەشاوە خەڵکی دەست بەگرێکەی دوای ئەوەوە دەگرن، یەکەمی گرێکان کە هەڵدەوەشێت حوکمە وە کۆتاییەکەشیان نوێژە).

١٣- (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿والذي نفس بيده لا تذهب الدنيا حتى يمر الرجل على القبر فيتمرغ عليه ويقول ياليتني كنت مكان صاحب هذا القبر وليس به الدين مابه إلا البلاء﴾[2]، واتە: (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە دونیا کۆتایی پێنایەت هەتا وای لێدێت پیاو بەلای گۆڕێکدا تێدەپەڕێت خۆی لە خۆڵەکەی وەردەدات و دەڵێت خۆزگە من لەجێی مردووی ناو ئەم گۆڕەبوومایە، ئەوەش نیە لەبەر دینداری وابڵێت بەڵکو لەبەر زۆری بەڵاو موسیبەتە).

١٤- (ابو موسی ی ئەشعەری) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يجعل كتاب الله عارا، ويكون الإسلام غريبا، وحتى تبدو الشحناء بين الناس، وحتى يقبض العلم، وتهرم الزمان، وينقص عمر البشر، وتنقص السنون والثمرات، يؤمن التهماء، ويتهم الأمناء، ويصدق الكاذب، ويكذب الصادق، ويكثر الهرج، وحتى تبنى الغرف فتطال، وحتى تحزن ذوات الأولاد، وتفرح العواقر، ويظهر البغي والحسد والشح، ويهلك الناس، ويكثر الكذب، ويقل الصدق، وحتى تختلف الأمور بين الناس، يتبع الهوى، ويقضي بالظن، ويكثر المطر ويقل الثمر، ويغيض العلم غيضاً، ويفيض الجهل فيضا ويكون الولد غيظاً والشتاء قيظاً، وحتى يجهر بالفحشاء، وتزوى الأرض زياً، وتقوم الخطباء بالكذب، فيجعلون حقي لشرار أمتي، فمن صدقهم بذلك ورضي به لم يرح رائحة الجنة﴾[3]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت تاوای لێدێت قورئانەکەی خوا دەبێتە عەیبەو ئیسلام غەریب دەبێت، وە تا وای لێدێت ناکۆکی دەکەوێتە نێوان خەڵکی و زانستی شەرعی هەڵدەگیرێت و زەمانە پیردەبێت و تەمەنی خەڵك کەم دەبێت، بەرهەمی ساڵ و بەروبوم کەم دەکات و تاوانبار بەدەست پاك دادەنرێت و دەست پاکیش بە تاوانبار، ڕاستگۆ دەکرێتە درۆزن و درۆزن دەکرێتە ڕاستگۆ و کوشت و کوشتاری ناوخۆی موسڵمانان زۆردەبێت، وەهەتا وای لێدێت خان و

---

[1] رواه أحمد والطبراني وابن حبان وقال في المجمع(٢٨١/٧) بعد أن نسبه لأحمد والطبراني: (رجالهما رجال الصحيح).

[2] صحيح مسلم (٢٢٣١/٤) رقم (٢٩٠٧) وابن ماجه.

[3] رواه ابن ابي الدنيا والطبراني وابو نصر السجزي وابن عساكر بسند جيد(الإشاعة لأشرط الساعة ص١١٢-١١٣).

بەرزدەكرێتەوەو بە ئاسماندا دەچێت، وە هەتا وای لێدێت خاوەن منداڵ خەفەتباردەبێت و بێ منداڵ و نەزۆك دڵخۆش دەبێت، دەست درێژی و حەسودی و پیسكەیی زۆردەبێت خـەڵكی تیادەچن و دەفەوتێن و درۆ زۆردەبێت و بەروبوم كەم دەبێت و زانستی شەرعی كەم دەبێت و نامێنێ و نەزانین زۆرئاشكرا دەبێت، كوڕ دەبێتە مایەی خەفەت و وەرزی زستان گەرم دەبێت و هەتا وای لێدێت زیناو داوێن پیسی بەئاشكرا دەكرێت و ڕێگەی هاتوچـۆی دووروودرێـژی سـەر ڕووی زەوی وای لێـدێت كـورت دەبێتـەوەو زوو دەبڕدرێـت و ووتاربێـژی سـەر مینبـەرەكان درۆ بـۆ خـەڵكی دەكـەن و حەقەكـەی مـن دەدەنـە خراپـەكارانی ئومەتەكـەم، جاهەركەسێك باوەڕ بە قسەكانیان بكات و پێی ڕازیبێت بۆنی بەهەشت ناكات).

١٥- پێغەمبەر(ﷺ) بە (جبریل)ی فەرموو: ﴿وسأخبرك عن أشراطها اذا ولـدة الأمـة ربتهـا...﴾[١]، واتە: ( نیشانەكانی قیامەتت پێدەڵێم یـەكێكیان ئەوەیـە كـەئافرەت منداڵەكـەی خـۆی ببێتـە سەرداروو خاوەنی). كەبێ دەچێت مەبەستی لەبێرێزی منـداڵ بێـت لەگـەڵ دایكیـدا تـا وای لێدێت بەچاوی كەنیزەك و كارەكەر سەیری دایكی خۆی بكات و مامەڵەی لەگەڵ بكات.

١٦- (ئیمامی عەلی) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من أشـراط الساعة حیف الأئمة وتصدیق بالنجوم وتكـذیب بالقـدر﴾[٢]، واتـە: (یـەكێك لـە نیـشانەكانی قیامەت ئەوەیە ئیمام و پێشەواكان زوڵم دەكەن و خەڵكی باوەڕ بە ئەستێرە و بەخت دەكـەن و درۆ بە قەزاو قەدەر دەكەن). بەڵێ بەشی زۆری خـەڵكی ئـەمڕۆ هـەتا بـەخت گرتنـەوە و جادوگەری و قاوە خوێندنەوە و بورج گرتنەوە وەستابێت بـاوەڕ بـە قـەزاو قـەدەری خـوایی ناكەن.

١٧- (أبو هریرە) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿اذا اقترب الزمان لم تكد رؤیا المسلم تكذب﴾[٣]، واتە: (كە ئاخر زەمـان نزیـك بـووەوە وای لێـدێت زۆر بەكـەمی خـەون بینینـی موسڵمانان بە درۆ دەردەچێت). پێدەچێت مەبەستی ئەوەبێت خەو بینینی موسڵمانان لـەئاخر زەماندا وەك خۆی دەردەچێت و پێویست بە لێكدانەوە ناكات.

١٨- (ثوبان) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿یوشـك الأم أن تداعي علیكم كما تداعي الأكلة إلى قصعتها فقال قائل ومن قلة نحن یؤمئذ قال بل أنتم یومئـذ

---

[١] صحیح البخاري (١/١١٤-مع الفتح) وصحیح مسلم (١/١٥٨م مع شرح النووي).

[٢] رواه البزار بسند حسن (الإشاعة لأشراط الساعة ص١١٤).

[٣] صحیح البخاري (١٢/٤٠٤-مع الفتح) وصحیح مسلم (١٥/٢٠-مع شرح النووي).

كثير ولكنكم غُثاء السيل ولنزعنَّ الله من صدور عدوكم المهابة منكم ولقـذفن الله في قلـوبكم الوهن فقال قائل يا رسول الله ومنذ الوهن قال حب الدنيا و كرهية الموت﴾[1]، واته: (هێنـدەی نـەماوە میلـلـەتانی دونیـا دابـارن بنیـشنە سـەرتان هـەروەك چۆن دالّـە كـەرخۆر دەنیـشنە سەركەلاكەكەیان، یەكێك وتی بۆ لەو ڕۆژەدا ئێمە كەمین؟ ئەویش فـەرمووی: بـەلْكو ئێـوە ئەوڕۆژە زۆرن بەلاّم پوش و خەوشن هەروەكا پـوش و خەوشـی سـەرئاوی لافـاو وە خـوای گەورەش ترسی ئێوە بەتەواوی لە دلّی دوژمنەكانتانـدا هەلّـدەگرێت، وەبەتـەواوەتیش وەهـم دەخاتە دلّی ئێوەوە، یەكێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەهن چییە؟ فەرمووی: خۆشەویـستی دونیاو ڕق لێبوونەوەی مردن).

١٩- (ابن مسعود) ڕەزای خوای لـێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ان بين يـدي الساعة... ظهر القم﴾[2]، واتە: (لە پێش هاتنی قیامەت دا قەلّەم زۆر دەبێت). مەبەستی ئەوەیە كە خوێندەوار زۆر دەبێت و كتێب نوسینیش بلاّودەبێتز.

٢٠- (أبو هريره) ڕەزای خوای لـێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يكون في آخـر الزمان دجالون كذابون يأتونكم من الأحاديث بما لم تسمعوا أنتم ولا آباؤكم فإياكم وإيـاهم لا يضلونكم ولا يفتنونكم﴾[3]، واتە: (لە ئاخر زەماندا كەسانێك جادووگەر و درۆزن پەیدا دەبن، قسەی واتان بۆ دێنن كە نەئێوەو نەباوباپیرانتان قسەی واتان نەبیستووە، خۆتانیان لـێ بپارێزن، سەرتان لـێ نەشێوێنن و توشی فیتنەتان نەكەن).

٢١- (ابن مسعود) ڕەزای خوای لـێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿أن بين يـدي الساعة... شهادة الزور وكتمان شهادة الحق﴾[4]، واتە: (لە پێش هاتنی قیامەتدا شـایەتی دانـی درۆ و شاردنەوەی شایەتی ڕاست زۆردەبێت).

٢٢- (أنس ی كوڕی مالك) ڕەزای خوای لـێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿أن من أشراط الساعة أن يرفع العلم، ويَظهر الجهـل، ويفـشو الزنـا، و يـشرب الخمـر، ويـذهب الرجال، وتبقى النساء حتى يكون لخمسين امرأة قيم واحد﴾[5]، واتە: (لە نیشانەكانی قیامـەت

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة (٦٨٤/٢) رقم (٩٥٨).

[2] مسند الإمام أحمد(٥/٣٣٣-٣٣٤) رقم (٣٨٧٠) شرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح.

[3] صحيح مسلم (١٢/١) رقم (٧).

[4] مسند أحمد(٥/٣٣٣) تحقيق أحمد شاكر وقال اسناده صحيح. وتفسير ابن كثير (٦/١٤٠) وفتح الباري (٥/٢٦٢).

[5] صحيح البخاري (١/٧٨-مع الفتح) و صحيح مسلم(١٦/٢٢١ مع شرح النووي) واللفظ لمسلم.

ئـەوەی زانـستی شـەرعی هەڵـدەگیرێت و نـەزانین زۆر و ئاشـکرا دەبێـت و زنـا کـردن بڵاودەبێتەوە و عەرەق دەخورێتـەوەو، پیـاوان منـامێنن و ئـافرەت دەمێنـنـەوە تـاوای لـێـدێت پـەنجائافرەت یـەك پیـاو سەرپەرشـتیان دەکـات). ئـەویش بـەهۆی زۆری شـەڕ و جـەنگ و وێرانکاریەکانەوەیە کە بەزۆری پیاوی تێدا دەکوژرێت، هـەروەك چـۆن لـە ئاکـامی جـەنگی عێراق-ئێران و جەنگی کەنداودا کار گەیشتبووە ئـەوەی لـە ناوچـەکانی باشـووری عێراقـدا لەهەندێك گوند و ئاوایی زۆر بەدەگمەن پیاو دەبینرا.

٢٣- (أنس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن من أمارات الساعة أن يظهر موت الفجأة﴾[1]، واتە: (یەکێك لە نیـشانەکانی قیامـەت ئەوەیـە مردنـی کتـوپڕ زۆردەبێـت). کـە ئەمـەش نیـشانەیەکە لـەم زەمانـەدا بـەزۆری دەبینرێـت کەخەڵکانێکی زۆر بەسەکتەی دڵ یان جەڵتەی دەماغ کتوپڕ دەمرن خـوای گـەورە پـەنامان بدات.

٢٤- (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجا وأنهارا﴾[2]، واتە: (قیامەت هەڵناسـێت تـاوای لـێـدێت خـاکی عەرەب پڕدەبێتەوە لە باخچەو ڕووبار). بەڵێ ئەو عەرەبستانەی کە تا دوێنێ بەدەگمـەن ئـاو و سەوزایی تێدا دەبینرا ئەمڕۆ کتوپڕ بە هۆی پارەی نەوت و دەوڵەمەندی خەڵکەکەیەوە سەدان هەزار باخچەو هەوارگەو سەیرانگای پڕ ئـاو و سـەوزایی تێـدا دروسـتکراوە بەڕادەیـەك کـە هەرگیز خاکی عەرەب شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە.

٢٥- (عبدالله ی کوڕی عمرو کوڕی عاص) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێـتەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿انه لم يكن نبي قبلي الا كان حقا عليه أن يدل أمته على خير ما يعلمه لهم وينذرهم شر ما يعلمه لهم وان أمتكم هذه جعل عافيتها في أولها وسيصيب آخرها بلاء وأمور تنكرونها وتجيء فتنة فيوقق بعضها بعضا وتجيء الفتنة فيقول المؤمن هذه مهلكتي ثم تنكشف وتجيء الفتنة فيقول المؤمن هذه هذه فمن أحب أن يزحزح عن النار ويدخل الجنة فلتأته منيته وهو يؤمن بالله واليوم الآخر وليأت الى الناس الذي يحب أن يأتى اليه ومن بايع اماما فأعطاه

---

[1] رواه الطبراني في(الأوسط) والضياء المقدسي. وقال الألباني(حسن).أنظر صحيح الجامع الصغير(٥/٢١٤) رقم (٥٧٧٥).

[2] صحيح مسلم(٧/٩٧-مع رشح النووي).

صفقة يديه وثمرة قلبه فليطعه ان استطاع فان جاء آخر ينازعه فاضربوا عنق الآخر﴾[1]، واته: (به دڵنیاییەوە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لەپێش مندا ئیلا پێویست بووە لەسەری، ئوممەتەکەی ڕێنومایی بکات بۆ هەموو ئەو خێرو چاکانەی کە دەیزانێت بۆیان، وە ئەم ئوممەتەی ئێوە خێرو خۆشیەکەی خراوەتە سەرەتاکەیەوە وە کۆتاییەکەی دووچاری بەڵاو هەندێك نەهامەتی وادەبێت کە پێتان نامۆیە، وە فیتنەیەك دێت کە لایەکی لایەکی تری پینە دەکات، وەفیتنەی وا دێت کە ئیماندار دەڵێت: بەمەیان بەمەیان لەناو دەچم، پاشان دەرەوێتەوە، جاهەرکەسێك حەز دەکات لە ئاگر لابدرێت و بخرێتە بەهەشتەوە، با کارێکی وا بکات کە هەرکات مردنی هات باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت، وە بە شێوازێك ڕوو لە خەڵك بکات کە خۆشی حەزبکات بە هەمان شێوە ڕووی تێبکەن، وە هەرکەسێکتان بەیعەتی دا بە پێشەوایەك، بەدەستخستنە ناو دەست بەڵێنی پێداو بەری دڵی خۆی پێبەخشی، با هەتا دەتوانێت بەردەوام بێت لەسەر گوێڕایەڵی کردنو لە فەرمانی دەرنەچێت، وە ئەگەر یەکێکی تر هات و داوای لێسەندنەوەی پێشەوایەتی لە یەکەم کرد بۆخۆی ئەوا لە ملی ئەوەی دووهەمیان بدەن).

٢٦- (حذیفەی یەمانی) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿یکون دعاة علی أبواب جهنم من أجابهم الیها قذفوه فیها قلتُ یا رسول الله صِفهم لنا قال هم قوم من جلدتنا یتکلمون بألسنتنا قُلتُ فما تأمرني ان أدرکني ذلك قال فَالزَم جماعة المسلمین و امامهم فأن لم یکن لهم جماعة ولا امام فاعتزل تلك الفِرَقَ کلها ولو أن تعَضَّ بأصل شجرة حتی یدرکك الموت وأنت کذلك﴾[2]، واتە: (بانگەوازکەرانێك پەیدا دەبن لەسەر دەرگاکانی دۆزەخ هەرکەسێك وەڵامیان بداتەوەو بەقسەیان بکات فڕێی دەدەنە ناویەوە) ووتم ئەی پێغەمبەری خوا وەصفیان بکە بۆان. فەرمووی: (ئەوانە کەسانێك لە پێستی خۆماننداو، بەزمانی خۆمان قسەدەکەن) ووتم جا فەرمانی چیم پێدەکەی ئەگەر کەوتمە ئەو زەمانە؟ فەرموی: (پەیوەست بە بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە، ئەگەر نە کۆمەڵ و نەپێشەواش هەبوو، ئەوا خۆت دوورە پەرێز بگرە لە گشت ئەو تاقم و لایەنانە ئەگەر قەپیشت کردووە بە قەدی دارێکدا، تا لەسەر ئەو حاڵە کاتی مردنت دێت). ئەم فەرموده پیرۆزە باس لەو کۆمەڵ و ڕێچکە نائیسلامیانە دەکات کە لە ئاخر زەمانیدا دروست دەبن و هەریەکێکیان کەسانێك بانگەشەی بۆدەکەن و هەرکەسێك باوەڕیان پێبکات و بەدەم بانگەشەکەیانەوە بچێت دینی

---

[1] رواه مسلم والنسائي وابن ماجة وأحمد وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة: حديث رقم (٢٤١).

[2] صحيح سنن ابن ماجة للألباني، حديث رقم (٣٢١٤) وفي الصحيحة(٢٧٣٩).

خۆی دەدۆڕێنێت و ڕێگەی دۆزەخ دەگریتە بەر، وە فەرمان بەموسڵمانان دەکات کە ئەگەر لەو ڕۆژەدا کۆمەڵ و پێشەوای ئیسلامی هەبوو ئەوا پابەیوەست بێت پێیانەوە، ئەگەر نا با خۆی دوورە پەرێز بگرێت لە گشت ئەو ڕێچکەو ڕێبازە نائیسلامیانەی کە لەو کاتەدا پەیدا دەبن هەرچەندە خاوەنەکانیشی هاوڵاتی و هاوزمانی خۆمان بن، چونکە شوێنکەوتوی ئەو ڕێگانە هەموی بە دۆزەخ دەگات.

٢٧- (عابس الغفاري) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿بادروا بالموت ستاً امرأة السفهاء وكثرة الشرط وبيع الحكم واستخفافاً بالدَّم وقطيعة الرحم ونشئاً يتخذون القرآن مزامير يُقَدِّمونه يغنيهم وإن كان أقَلَّ منهم فقهاً﴾[1]، واتە: (دەست پێشی بکەن بەکاری چاکە پێش ئەوەی شەش شت ڕووبداتو بێتە پێشەوە: دەسەڵات کەوتنە دەستی کەسانی بێنرخ و هیچ و پوچ، وە زۆربوونی پۆلیس و فرۆشتنی حوکم و، بە سوك سەیر کردنی خوێن ڕشتن و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و پەیدابوونی کەسانێکی تازە پێگەیشتوو کە قورئان دەکەنە ئامێر بۆ ئاوازەکانیان، کەسێکیان پێش دەخەن بۆ پێشنوێژی کە تەنها بە ئاوازی خۆش قورئانیان بۆ بخوێنێت هەرچەندە لە هەمووشیان زانیاری و تێگەیشتنی لە ئایین کەمتر بێت).

٢٨- (عبد الله ی کوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا دانیشتبوون ئەویش باسی لە فیتنەکان کردو درێژەی بە باسەکە دا هەتا باسی فیتنەی (الاحلاس)ی کرد، یەکێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا فیتنەی (الاحلاس) چیە؟ فەرمووی: ﴿هي هرب و حرب ثم فتنة السراء دخنها من تحت قدمي رجل من أهل بيتي يزعم أنه مني وليس مني وانما أوليائي المتقون ثم يصطلح الناس على رجل كَوَرِك على ضلع ثم فتنة الدهيماء لاتدع أحدا من هذه الأمة الا لطمته لطمةً فاذا قيل انقضت تمادت يصبح الرجل فيها مؤمناً ويمسي كافراً حتى يصير الناس الى فسطاطين فسطاط ايمان لا نفاق فيه و فسطاط نفاق لا ايمان فيه فاذا كان ذاكم فانتظروا الدَّجّال من يومه أو من غده﴾[2] ، واتە: (ڕاکردن و ئاوارەیی و سەرو ماڵ تیاچوونە، پاشان فیتنەی خۆشگوزەرانی دێت کە هەڵگیرسانی دوکەڵەکەی لە ژێرپێی پیاوێکەوە دەبێت لە ئالوبەیتی من، لافی ئەوە لێدەدات کە لە منە، بەڵام لەمن نیە، بەڵکو تەنها کەسانی لەخواترس و پارێزکار دۆستی منن، پاشان خەڵکی ئاشت دەبنەوەو ڕێك

---

[1] رواه أحمد والطبراني وفي الصحيحة للألباني برقم (٩٧٩).

[2] رواه أبو داود وأحمد والحاكم وقال صحيح الأسناد وصححه الذهبي.

دەکەون لەسەر پیاوێك کە باری لارەو وەك پەراسوو خوارە، پاشان فیتنەی کارەساتە ڕەشەکان دێت کە کەس نامێنێت لەم ئوممەتە کە لێدانی ئەو فیتنەیەی بەرنەکەوێت، هەرکەووترا تەواو بوو، درێژ دەبێتەوە، پیاو بە ئیمانداری ڕۆژی تیادا دەکاتەوەو بەبێ باوەڕی خۆری لیٚ ئاوا دەبێت، هەتا وای لیٚ دێت خەڵك دەبن بە دوو بەشەوە بەشێکی ئیماندار کەهیچ نیفاقێکی تێدا نیە، هەرکاتێکیش ئەوە ڕووی دا ئیتر ئەمڕۆو سبەی چاوەڕێی هاتنی دەججال بکەن).

٢٩- (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يأتي على العلماء زمانٌ أحبّ الى أحدهم من الذهب الأحمر﴾[1]، واتە: (سەردەمانێکی وا دێت بەسەر زاناياندا-مەبەست پێی زانایانی ئاینییە- هەریەکەیان مردنی لەلا خۆشترە لە ئاڵتونی سور).

٣٠- (عبدالله ی کوڕی عمر) ڕەزای خوایان لێبێت دەگێڕێتەوە: دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ڕوومان هات فەرمووی: ﴿يا معشر المهاجرين خمسٌ اذا ابتليتم بهنّ وأعوذ بالله أن تدركوهن لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها الا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مَضَوا ولم ينقصوا المكيال والميزان الاّ أخِذوا بالسِّنينَ وشدَّة المئونة وجَورِ السلطان عليهم ولم يمنعوا زكاة أموالهم الا منعوا القطر من السماء ولو لا البهائم لم يمطروا ولم ينقضوا عهدالله وعهد رسوله إلا سلط الله عليهم عدوا من غيرهم فأخذوا بعض مافي أيديهم ومالم تحكم أئمتهم بكتاب الله ويتخيروا مما أنزل الله إلا جعل الله بأسهم بينهم﴾[2]، واتە: (ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان! پێنج بەڵاهەن ئەگەر دووچاریان بن، پەنا بەخوا دەگرم لەوەی پێیان بگەن: داوێن پیسی لە هەر میللەتێکدا سەری هەڵدابێت و ئاشکرا بووبێت، ئەوا جۆرە تاعون و دەرد و نەخۆشیەکی وایان تێدا پەیدا دەبێت کە هەرگیز لە باوباپیرانی پێشتریاندا نەبینراوە[3]، وە ئەگەر کێشانەی پێوانە و ترازووەکانیان کەم بکەن ئەوا دووچاری گرانی و بار قورسی و زوڵم و ستەمی دەسەڵاتداران دەبن، وە ئەگەر زەکاتی ماڵەکانیان نەدەن ئەوا بارانیان لە ئاسمانەوە لیٚ دەگیرێتەوەو لەبەر خاتری ئاژەڵیش نەبوایە هیچ نەدەباری، وەهەرکات پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەیتان شکاند ئەوا خوای گەورە دوژمنێکی دەرەکیتان بەسەردا زاڵ دەکات

---

[1] رواه الحاكم (٥١٨/٤) وقال: صحيح على شرطهما، وأقره عليه الذهبي، وفي منتخب الكنز (٤٠٧/٥) برواية أبي نعيم عن أبي هريرةﷺ.

[2] صحيح سنن ابن ماجه للألباني وقال(حسن) وفي الصحيحة رقم (١٠٦).

[3] وەك نەخۆشی ئایدز کەپێشتر نەبینراوە.

که بەشێکی دەسەڵاتەکەی ژێردەستان لـێ بسـتێنن، وە ئەگـەر پێشەواو سەرکردەکانیـشتان حوکم بە کتێب و بەرنامەی خوا نەکەن وە بەئارەزووی خۆیان هەندێکی لێ وەرگرن و ئەوی تری وەلا بنێن ئەوا خوای گەورە خۆ خۆری و کوشتار دەخاتە نێوانتان.

٣١- (ابو سـعیدی خـدری) ڕەزای خـوای لێبێـت دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿والذي نفسي بيده لاتقوم الساعة حتى تكلم السباع الإنس حتى تكلم الرجل عذبة سوطه وشراك نعله تخبره فخذه بما أحدث اهله من بعده﴾[1]، واتە: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، قیامەت هەڵناسێت هەتا وای لێ دێت گیاندارە دڕندەکان قسە لەگەڵ مرۆڤ دەکـەن، و پیاو جێ دەستی قامچیەکەی و قەیتانی پێڵاوەکەی خۆی قسەی لەگەڵ دەکەن و، وە ڕانی خـۆی پێی دەڵێت کە لەپاش خۆی خێزانەکەی چی کردووە).

[1] رواه أحمد باسناده صحيح وأخرجه ابن الحبان والحاكم مفرقا وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وفي الصحيحة للألباني رقم(١٢٢).

## بەشی سێیەم

## ئەو نیشانانەی کە لەمەو پاش دەردەکەون ((نیشانە گەورەکان))

ئەو نیشانانەی کە لە دوو بەشی پێشوودا باسمانکرد لـە لای زاناکـان بـە نیـشانە بـچووکەکان دادەنـرێن، بـەلاّم دوا زەنگـی نزیـك بوونـەوەی ڕۆژی دوایـی بریتیـە لـە ڕوودان و سـەرهەلّدانی کۆمەلّێك نیشانەی گەورە کە لە ماوەیەکی کورت و کەمدا یەك بەدوای یەکدا دێـن بـە شـێوازێك کەهەر وەك پێغەمبەر(ﷺ) باسی لێوە دەکات و دەفەرموێت: ﴿خروج الآيات بعضها على إثر بعض، يتابعن كما يتابع الخرز في النظام﴾[1]، واتە: (هاتن و دەرچـوونی نیـشانەکان یـەك بـەدوای یەکـدا دەبێت، هەروەك چۆن ملوانکەیەك مورووەکانی یەك بەدوای یەکدا دێن).

وەك لە فەرمەدەیەکی تردا کە (عبداللە ی کوڕی عومەر) دەگێڕێتەوە و دەلّێت پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿الآيات خرزات منظومات في سلك، فإن يقطع السلك يتبـع بعـضها بعـضا﴾[2]، واتـە: (نیشانەکان وەك مورووی هۆنراوە وان لەسەر پـەتێك، هـەر لەگـەلّ پەتەکـە پـچڕا بـەدوای یەکـدا دەخزێن‌و دەکەونە خوار).

ئەو نیشانە گەورانەش هەرچەندە لەلای زانایان ڕوون و ئاشکرایە لـە ماوەیـەکی کورتـدا یـەك بەدوای یەکدا دێن وە کە دەستی پێکرد وەستانی نییە تا کەوتنە خوارەوەی دوا موورو واتە تا هـاتنی دوا نیشانەی قیامەت، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشـدا تـەرتیب کردنـی نیـشانەکان واتـە: (کامیـان بـەدوای کامیاندا دێت و کامیان لە پێش کامیان ڕوودەدات). زاناکان لەسەری یەك دەنـگ نـین بـە تایبـەت کەلە فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر جار ئـەو نیـشانانە بەتەرتیبەکـەی خۆیـان نـەهاتوون یـاخود تەرتیبەکەیان لە فەرمودەیەکەوە بۆ فەرمودەیەکی تر جیاوازی هەیە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشـدا تـوانراوە تاڕادەیەکی زۆر لە ڕوانگەی فەرمودەکانەوە، ڕەوتی ڕوودانی ئەو نیشانانە ڕێك بخرێت.

بۆ نموونە ئیمامی موسلیم لە صحیحەکەیدا ئەو نیشانە گەورانە دووجار لەسەر زاری یەکێك لە هاوەلاّنی پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە ئەویش (حوذەیفەی کـوڕی ئوسـەیدی غـەفاری)یـە، بـەلاّم تەرتیبی نیشانەکان لەدوو فەرمودەکەدا لەیەکتر جیاوازن ئەوەتا لە یەکێکیاندا دەفـەرموێت: ﴿اطلـع النبي(ﷺ) علينا ونحن نتذاكر، ما تذاكرون؟ قالوا: نذكر الساعة، قال: إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات، فذكر: الدخان والدجال والدابة وطلوع الشمس من مغربهـا ونـزول عيـسى ابـن مـريم

---

[1] رواه الطبراني في (الأوسط). وقال الألباني (صحيح). أنظر صحيح الجامع الصغير(٣/١١٠) رقم (٣٢٢٢).

[2] مسند أحمد (١٢/٦-٧) رقم (٧٠٤٠) شرح أحمد شاكر و قال: (اسناده صحيح).

ويأجوج ومأجوج وثلاثة خسوف خسف بالمشرق وخسف بالمغرب وخسف بجزيرة العرب وآخر ذالك نار تخرج من اليمن تطرد الناس الى محشرهم﴾[1]، واته: (جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لێمان دەرکەوت لە کاتێکدا ئێمە خەریکی قسەو باس بووین، فەرمووی ئەوە باسی چی دەکەن؟ ووتمان باسی قیامەت، فەرمووی قیامەت هەڵناسێت هەتا دە نیشانە لە پێش هاتنیدا نەبینن، پاشان فەرمووی: (دووکەڵ و دەجال و دابە و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و دابەزینی عیسی ی کوڕی مەریەم صەلات و سەلامی خوای لەسەربێت و یاجوج و ماجوج و سێ ڕۆچوون، ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاوا ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەوانەش ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەر خەڵکی ڕاودەنێت بەرەو شوێنی حەشرکردنیان).

وە لەوی تریاندا کە هەر ئیمام موسلیم لە هەمان سەحابی دەیگێڕێتەوە کە ئەمجارە لەڤزو تەرتیبەکە جیاوازە بەم جۆرە: ﴿ان الساعة لا تكون حتى تكون عشر آيات خسف بالمشرق وخسف بالمغرب وخسف في جزيرة العرب والدخان والدجال ودابة الأرض ويأجوج ومأجوج وطلوع الشمس من مغربها ونار تخرج من قعرة عدن ترحل الناس﴾[2]، وفي رواية (والعاشرة نزول عيسى بن مريم). واتە: (قیامەت نایێت هەتا دە نیشانە ڕوودەدات: ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاوا و ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەب و دووکەڵ و دەجال و دابەی زەوی و یاجوج و ماجوج و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و ئاگرێك کەلەناوجەرگەی عەدەن دەردەچێت و خەڵکی کۆچ پێدەکات). وە لە ڕیوایەتێکیشدا دەڵێت: (وە دەیەمینیان دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمە).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە گێڕانەوەی ئەو نیشانانە تەرتیبەکەیان نەپاراستووە، بەڵام لە ڕێگەی تێبینی و ووردبوونەوە لە فەرموودەکان، تەرتیبی هەندێکیانمان بۆ دەردەکەوێت، بەتایبەتیش وەك باسمان کرد هەموویان بەدوای یەکتردا دێن، بۆنموونە(محمدی مهدی) پێش دەجال دێت و دواتر ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە و عیسای کوڕی مەریەمیش لە ئاخر ڕۆژی تەمەنی دەجالدا دێتە خوارەوە چونکە لەگەڵ هاتنە خوارەوەیدا دەجال دەکوژێت و پاشانیش لە حوکمڕانی عیسادا صەلات و سەلامی خوای لەسەربێت، یاجوج و ماجوج دێن، بەڵام هەندێك لە نیشانەکانی تر وەك دوکەڵ و ڕۆچوون و دبەو هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە ئەمانەهیچ بەڵگەیەکی ئەو تۆ نیە بۆ تەرتیب کردنیان، ئێمەش بە پشتیوانی خوا هەوڵ دەدەین لێرەدا بەپێی توانا لە تەرتیبی زاناو نوسورە بەرێزەکانی پێشوو لەم بوارەدا دەرنەچین و بەپێی تواناش هەوڵ

---

[1] صحيح مسلم(١٨/٢٧-٢٨) مع شرح النووي.

[2] صحيح مسلم (١٨/٢٨-٢٩).

دەدەین ڕووداوەکان بەتەرتیبێکی ڕاست و لە شوێنی خۆیدا باس بکەین. ئەگەر ڕاستمان کردوو پێکامان ئەوا سوپاسی خوای لەسەر دەکەین، ئەگەر هەڵەیەکیشمان کرد ئەوا هەڵەی خۆمانە و داوای لێبوردنی لە خوای گەورە لێ دەکەین.

## هاتنی ( محمدی مهدی )

فەرموودە صحیحەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن کە لە ئاخر زەماندا لە کاتێکدا کە ئیسلام غەریب دەبێت و شەریعەتی خوا لەکار دەخرێت موسڵمانان بێ شوان و ڕابەر دەبن و سەرتاپای زەوی زوڵم و ستەم دەیگرێتەوە و زۆرداران و ستەمکاران تیایدا خاوەن دەسەلات دەبن تا وای لێدێت کەس هیوای خێرو چاکەی نامێنێت کەجارێکی تر بگەڕێتەوە سەرزەوی، ئالەوکاتەدا خوای گەورە ڕووی ڕەحمەتی خۆی لە بەند دڵسۆزەکانی دەکات و ئیمام و پێشەوایەکی خاوەن ئیمان و عەزیمەتیان بۆ دەرەخسێنێت کەلە سەر دەستیدا دین زیندو دەبێتەوە ئیسلام و موسڵمانان سەربەرز دەبن و قەلای کوفرو ستەمکاران هەرەس دێنێت و سونەت دەبوژێتەوەو بیدعەت دەمرێت و خێر و بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزی بە جۆرێك بەسەر زەویدا دەڕژێت کە وێنەو نموونەی لە هیچ زەمانێکدا نەبووە، هاتنی ئەم پێشەوا ئیسلامیەش بەکوێرایی چاوی هەموو دوژمن و ناحەزێکی ئەم دینە ڕاستییەکە کە وەکو هوموو هواڵە ڕاستیەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) دێتە دی و قەدەری خواش هەر بەئەنجام دەگات ئەو پێشەواو سەرکردە ئیسلامیەش (محمدی مهدی)یە.

ئەو فەرموودانەش کە باس لە هاتنی (محمدی مهدی) و نیشانەکانی و ڕووداوەکانی سەردەمی دەکەن هێندە زۆرن، وەکو بەشی زۆری زاناکان دەفەرموون گەیشتۆتە پلەی (تواتر) هەرمەسەلەیەکیش کە لە فەرموودەکاندا گەیشتە پلەی (تواتر)، ئەوا باوەڕ نەبوون پێی خوا پەنامان بدات خاوەنکەی بەرەو کوفر دەبات.

ئیمامی شەوکانی لەو بارەیەوە دەفەرموێت (ئەو فەرموودانەی کە لە بارەی (محمدی مهدی) چاوەڕوان کراوە هاتوون و توانراوە لەسەری بوەستین، زیاتر لە پەنجا فەرموودەن کەتیایاندایە (صحیحە) و تیایاندایە (حسن)ەو تیاشیاندایە (ضعیف)ی (منجبر)ە، کە بەبێ هیچ دوودڵی و گومانێك گەیشتوونەتە پلەی (تواتر)، بەڵکو لە هەموو زاراوەکانی (أصول)دا بۆ زۆر لەوە کەمتر دەتوانرێت سیفەتی (تواتر)ی بۆ بچەسپێت، وە ووتەی سەحابەکانیش دەربارەی (محمدی مهدی) بەهەمان شێوە ئێجگار زۆرە، کە حوکمی بەرزکردنەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەیە، چونکە

ئەمە مەسەلەیەك نییە كە كەس بتوانێت بەئیجتیهادی خۆی قسەی تێدا بكات)[1] وە (شیخ عبدالعزیز بن باز)یش لەو بارەیەوە دەڵێت: (مەسەلەی (مهدی) زانراوو و ئاشكرایە و فەرموودەكان لەسەری بەڵێشاون، بەڵكو (متواتر)نیشانەكانی و پاڵپشتی یەكتر دەكەن، وە (تواتر)ەكەشی لەلایەن زیاتر لە كەسێك لە ئەهلی عیلمەوە سەلمێنراوە، (تواتر)ەكەش (تواتر)ێكی مەعنەویە، لەبەر زۆریی ڕێگاكانی و جیاوازی مەخرەجەكانی و هەروەها سەحابەكان و ڕوایەكانی و لەفزەكانی، كە ئەمانە هەمووی بەڕاستی بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە ئەم كەسە مژدە پێدراوە، مەسەلەیەكی چەسپاوەو هاتنی حەقە)[2]

ئەمەو (شیخ عبدالمحسن بن حمد العباد)یش ئەو سەحابانەی بژاردووە كە فەرموودەكانی سەبارەت بە مهدیان گێڕاوەتەوە، ژمارەیان گەیشتۆتە (٢٦) سەحابی، وە ژمارەی ئەو كتێبانەی سوننەتیش كە ئەو فەرموودانەیان گێڕاوەتەوە گەیشتۆتە (٣٦) كتێب، لەوانە هەر چوار كتێبەكەی (سنن) مەسنەدی ئیمام أحمد و (صحیح)ی ابن حبان و (مستدرك)ی ئیمام حاكم و چەندینی تر[3]

ئەمەو سەرباری دەیان كتێبی تر كە تایبەت بە مهدی ئاخرزەمان نوسراون لەلایەن زانایانی باوەڕپێكراوی ئیسلامەوە، كە ژماردنی هەموویان لەمەبەستی ئەم كتێبە دەردەچێت.

كە ئەمانەش هەموویان وایان كردووە باوەڕبوون بەو مەسەلەیە ببێتە یەكێك لە بڕگەكانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

## ناو و سیفەتی ( محمدی مهدی ):

فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ناو و شۆڕەتی (محمدی مهدی) گەلێك زۆرن بۆیە ئێمە هەموویان ناهێنین و تەنها نمونەیان لێ دێنین. لەوانە ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ﴿المهدي منا أهل البيت يصلحه الله في ليلة﴾[4]، واتە: (مەهدی لە ئال و بەیتی ئێمەیە، خوای گەورە لە شەوێكدا دەیسازێنێ بۆ ئەم كارە).

وە (ابو سعیدی خدری)یش دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لتملأن الأرض جورا وظلماً، فإذا ملئت جورا وظلماً، يبعث الله رجلا مني اسمه اسمي واسم ابيه اسم ابي، فيملؤها عدلا وقسطا كما ملئت جورا وظلماً، فلاتمنع السماء شيئاً من قطرها ولا الأرض شيئاً من نباتها يمكث

---

[1] لەكتێبی (الأذاعة)ی صدیق حسن خان ل ١٢٦ كەلە كتێبی (التوضیح في تواتر ما جاء في المهدي المنتظر والدجال والمسیح)ی ئیمامی شەوكانیەوە وەری گرتووە.

[2] القیامة الصغری د. محمد سلیمان الأشقر ص٢٠٨.

[3] القیامة الصغری د. محمد سلیمان الأشقر ص٢٠٩.

[4] رواه أحمد وابن ماجه وفي الصحیحة للألباني رقم (٢٣٧١).

فيكم سبعا أو ثمانيةً فإن أكثر فتسعاً﴾[1]، واته: (زەوی پردەبێت لە زوڵم و ستەم، وە کە پڕبوو لە زوڵم و ستەم خوای گەورە پیاوێك دەنێرێت لە نەوەی من، ناوی ناوی منەو ناوی باوکیشی ناوی باوکی منە، زەوی پردەکات لە ڕێکی و دادپەروەری، هەر وەك چۆن پڕبو لە زوڵم و ستەم، لە زەمانی ئەودا ئاسمان هیچ لە بارانی ناگرێتەوە و زەویش هیچ لەڕوەکی گل ناداتەوە، حەوت یان هەشت ساڵتان لە ناودا دبێت، ئگەر زۆری خایاند ئەوا نۆ ساڵ).

لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت (مهدی) وە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (محمد) یان (أحمد)ەو باوکیشی ناوی (عبدالله)یە و ماوەی دەسەڵاتدارێتیشی حەوت تا نۆ ساڵ دەخایەنێت. وە زۆربەی فەرموودەکان ئەو ڕاستییە دووپات دەکەنەوە کە (مهدی) لە ئال و بەیتی پێغەمبەر(ﷺ) وەلەنەوەی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە(ﷺ) هەروەك (أم سلمە)ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿المهدي من عشرتي من ولد فاطمة﴾[2]، واتە: (مەهدی لە خانەوادەی منە لە نەوەی فاتیمەیە).

سەبارەت بە شێوەو ڕوخساری ئیمام مەهدی (ئەبو سەعیدی خودری) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿المهدي مني أجلي الجبهة أقنى الأنف الأرض قسطا و عدلا كما ملئت جوراً و ظلما يملك سبع سنين﴾[3]، واتە: (مەهدی لە منەو ناوچاوانی (أجلي)یەو. لوتی (أقنى)یە، زەوی پڕ دەکات لە ڕێکی و دادوەریی پاش ئەوەی کە پڕی بوو لە تاوان و ستەم. وە موڵکەکەی حەوت ساڵ دەخایەنێت).

(أجلي) بە کەسێك دەوترێت کە ناوچاوانی پان بێت و کەمێك قژی لە ئاستی ناوچاوانیدا بەرەو دواوە تەنك بووبێت یان ڕوتابێتەوە.

(أقنى) بە لووتێك دەوترێت کە باریك و ڕێك بێت و لە ناوەڕاستیدا کەمێك بۆ ناوەوە چەمابێتەوە، کۆتاییەکەشی بۆ سەرەوە بەرز بووبێتەوە، کە ئەمە جوانترین جۆری لووتە.

## شوێنی هاتنی (ئیمام مهدی):

[1] رواه الطبراني والبزار و أبو نعيم وفي الصحيحة للألباني رقم (١٥٢٩).

[2] رواه ابو داود و ابن ماجه والحاكم وأبو عمر الداني وقال الألباني صحيح. أنظر صحيح الجامع الصغير (٢٢/٦) رقم (٦٦١٠).

[3] رواه أبو داود والحاكم. وقال الألباني اسناده (حسن) صحيح الجامع(٢٢/٦-٢٣) رقم (٦٦١٢).

سەبارەت بە شوێنی هاتن و دەرکەوتنی (مەهدی) ئاخرزەمان (ثوبان) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يقتل عند كنزكم ثلاثة كلهم ابن خليفة ثم لا يصير إلى واحد منهم ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يقتله قوم..{ثم ذكر شيئا لا أحفظه}رفقال: فإذا رأيتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فإنه خليفة الله المهدي﴾[1]، واتە: (لە ئاست و شوێنی کەنزەکەتان (مەبەست پێی ئاڵتونەکەی ناوی فوراتە)، سیان لێیان دەبێتە شەڕ هەرسێکیان کوڕە پادشان، پاشان بۆ هیچ کەسێکیان نابێت، پاشان ئالا ڕەشەکان لە ڕووی ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەون، کوشتنێك دەتان کوژن و هیچ میللەتێك وا نەکوژراوە....(پاشان شتێکی ووت لەبیرم نەماوە) پاشان فەرمووی: هەر کاتێك بینیات بەیعەتی بدەنێ، ئەگەر بەسەر بەفریشدا خۆتان خشاندووە، چونکە ئەوە خەلیفە مەهدی یە کە لەلایەن دەست نیشان کراوە).

وە (أم سلمە) ڕۆژی قیامەت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿يكون إختلاف عند موت خليفة، فيخرج رجل من أهل المدينة هاربا الى مكة، فيأتيه ناس من أهل مكة فيخرجونه وهو كاره فيبايعونه بين الركن و المقام﴾[2]، واتە: (ناکۆکیەك ڕوودەدات لە کاتی مردنی پادشایەکدا، لەو کاتەدا پیاوێك لە خەڵکی مەدینە هەڵدێت بەرەو (مەکە)، پاشان کەسانێك لە خەڵکی (مەکە) بەزۆر دیهێننە دەرەوە و بە زۆر بەیعەتی پێ دەدەن لە نێوان (رکن) و (مقام)دا....).

وەهەر (أم سلمە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يعوذ عائذ بالبيت، فيبعث إليه بعث فإذا كانوا ببيداء من الأرض خسف بهم﴾[3]، واتە: (کەسێك پەنا دەباتە بەر ماڵی بەیت (واتە کەعبە)، پاشان کۆمەڵێك ڕەوانە دەکرێنە سەری، کاتێك کە دەگەنە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن بەزەویدا).

وە (حفصە)ی دایکی موسڵمانانیش ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿سيعوذ بهذا البيت قوم ليست لهم منعة و لا عدد ولا عدة يبعث إليهم جيش، حتى اذا كانوا ببيداء من الأرض خسف بهم﴾[1]، واتە: (کۆمەڵێك پەنا دەبەنە بەر ئەم ماڵی بەیتە، نەپارێزەر و

---

[1] رواه ابن ماجه والحاكم. وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي. وقال ابن كثير هذا(اسناده قوي صحيح). النهاية الفتن والملاحم (١/٢٩). بەڵام ألبانی پێی وایە بڕگەی (خليفه الله) زیادە لە فەرموودەکەدا.

[2] رواه أحمد وأبو داود وإبن شيبة والطبراني في (الأوسط). وقال الهيثمي في مجمع الزوائد: (رجاله رجال الصحيح). وفي الصحيحة للألباني رقم (١٩٢٤).

[3] صحيح مسلم (٢٢٠٨/٤) رقم (٢٨٨٢).

[1] صحيح مسلم (٢٢٠٩/٤) رقم (٢٨٨٣).

نەپاڵپشتیان هەیە و نەژمارەو نە تفاق سوپایەکیان دەکرێتە سەر، کاتێك کە سوپاکە دەگەنە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن).

لەم فەرموودانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیمامی مەهدی لە بنچینەدا خەڵکی شاری (مەدینە)یە وە لە نێوان (ركن)و (مقام)دا لە شاری مەکە بەیعەتی پێدەدرێت لەلایەن کەسانێکی ژمارە کەم بێ چەك و تفاقەوە، بەڵام لەو فەرموودەیەدا کە (ثوبان) ڕیوایەتی دەکات وادەردەکەوێت کە پێشتر مەهدی لەو سوپایەدا بێت کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دێن و ئاڵاکەیان ڕەشە، هەر وەك (أبن كثير) لە شەرحی ئەو فەرموودەیەدا دەڵێت(مەبەست لەوەیە کە ئەو مەهدیەی ستایش کراوەو مژدە بەهاتنی دراوە لە ئاخر زەماندا سەرەتای دەرکەوتن و سەرهەڵدانی لە ڕووی ڕۆژهەڵاتەوە دەبێت، لە پاشاندا لای ماڵی بەیت بەیعەتی دەدرێتێ، (هەروەك چەند فەرموودەیەك ئاماژە بەوە دەکەن)[2]

بەڵێ پێ دەچێت (مەهدی) لە سەرەتادا بە مەبەستی جیهاد ڕوو لە ڕۆژهەڵات بکات و لەوێش سوپایەکی ئیسلامی بەتواناو زەبر دروست بێت کە دەبنە قەڵاو پشتیوان بۆ خۆی و بانگەوازەکەی، وەلەسەر دەستی ئەو سوپایەشدا لە ئاخر زەماندا هەیبەت و دەسەڵاتی ئیسلام دەگەڕێتەوە، وەك لە چەندین فەرموودە ئاماژەی بۆ کراوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر(ﷺ) جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەگەر بەسەر بەفریشدا خۆمان خشاندووە، خۆمان بگەیەنینە ئەو سوپایەو بەیعەتی پێ بدەین.

---

[2] النهاية/لفتن والملاحم (١/٢٩-٣٠).

## ئەو ڕووداوانەی کە لە پێش هاتنی (مەهدی)دا ڕوودەدەن:

هەندێك ڕووداو و نیشانە هەن کە لە پێش هاتنی (محمدی مهدی) دا بەماوەیەکی کەم ڕوودەدەن و هەر کات ئەو ڕووداوانە سەریان هەڵدا، بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بووترێت کە(محمدی مهدی) لە ژیاندایەو لە ماوەیەکی کەمدا ئاشکرا دەبێت، گرنگیرین ئەو ڕووداو و نیشانانەش:

## یەکەم/ گرتنەوەی ئاوی ڕوباری فورات:

(أبو هريره) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿لا تقوم السّاعة حتى يَحسر الفرات عن جَبَلٍ من ذَهَب، يَقتَتِلُ النّاسُ عليه فَيُقتَلُ من كلِ مئةٍ تسعةٍ وتسعون، ويقول كلُّ رجلٍ لعَلِي أكونُ أنا الّذي أنجو﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا ئاوی فورات دەگیرێتەوە و چیایەك ئاڵتونی تێدا دەردەکەوێت، خەڵکی کوشتارێکی زۆری لەسەر دەکەن، هەتاوای لێدێت لە هەموو سەد کەسێك نەوەدو نۆی دەکوژرێت، وە هەر پیاوێك دەڵێت بەڵکو من ئەو کەسە بم کەڕزگارم دەبێت). وەلە ڕیوایەتەکەی (ثوبان)یشدا کە لەپێشەوە باسمان کرد (يَقتَتِلُ عندَ كنزِكُم ثلاثةٌ كلّهم إبنُ خلفيةٍ...). لە پاش شەڕکردنی سێ کوڕە پاشاکە لەسەر کەنزو ئاڵتونەکەی ئاوی فورات کە دواتر بۆ هیچیان نابێت، ئاماژە بەوە دەکات کە لەپاش ئەم ڕووداوە سوپا ئاڵا ڕەشەکەی ڕۆژهەڵات دێن کە (محمدی مهدی)یان لەگەڵدایە.

لەم فەرموودانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لەپێش هاتنی (محمدی مهدی)دا ئاوی فورات دەگیرێتەوەو ئاڵتونێکی زۆری تێدا دەردەکەوێت، وە لەسەر ئەو ئاڵتونە سێ کۆمەڵ یان سێ دەوڵەت یاخود بڵێین سێ سوپا، بەسەرکردایەتی سێ کەس کەهەر سێکیان باوکیان پاشاو دەسەڵاتدار بوون، چونکە (خەلیفە) لە فەرموودەکەدا مەبەست پێی خەلیفەی ئیسلام نییە، چونکە ناگونجێت لە یەك کاتدا سێ خەلیفە هەبن، بەتایبەت کە لەپێش هاتنی مەهدیدا خەلافەتی ئیسلام بوونی نەماوە، لێیان دەبێتە شەڕ و کوشتار بە جۆرێك کە لەسەد کەس تەنها یەك کەس ڕزگاری دەبێت، هەر بۆیە وەك لە (لفظ)ێکی تری فەرموودەکەدا کە لەلای (بخاری) هاتووە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿فمن حضره فلا يَأخُذَ منه شيئاً﴾[2]، واتە: (هەر کەس ئامادەی بوو با هیچ لەو ئاڵتوونە نەبات). چونکە بەڕاستی فیتنەیەکی گەورەیە.

---

[1] صحيح البخاري (١٣/٧٨–مع الفتح) وصحيح مسلم (١٨/١٨–مع شرح النووي).

[2] رواه البخاري، رقم الحديث (٧١١٩).

ئەمەو لەوانەیە هەندێك كەس مانای ئەو فەرموودەیە بەنەوت بكەن و بڵێن پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی پێی نەوت بووە، بەڵام پێم وایە ئەوە لێكدانەوەی لاوازە، چونكە فەرموودەكە بە ئاشكرا (جبل من ذهب) واتە: (چیایەك لە ئاڵتوون)ی بەكارهێناوە، بەڵام نەوت لە قوڵایی زەوی دەردەهێنرێت و وەك هەموو دەزانین هەرگیز لە شێوەی چیادا نەبووە و ئەویش لە زۆربەی شوێنەكانی دونیادا هەیەو دەردەهێنرێت و كەسیش بەو شێوەیە یەكتریان لەسەر نەكوشتووە.

ئەمەو سەبارەت بەو شوێنەی كە ئاڵتوونەكەی تێدا دەردەكەوێت، هیچ فەرموودەیەكی وام بەرچاو نەكەوتووە كە جێی متمانە بێت، هەرچەندە هەندێك ریوایەت باس لەوە دەكەن كە ئاڵتوونەكە لە شوێنێكدا دەردەكەوێت پێی دەوترێت (قرقیسیا) بەڵام وەك ووتمان ناتوانرێت پشتیان پێ ببەسترێت و جێی متمانەش نین.

لە كۆتاییشدا پێم باشە بڵێم، لای هەمووان ئاشكرایە كە ئەمڕۆ دەوڵەتی توركیا چەندین بەربەستی لەسەر ڕووباری فورات دروست كردووە و هەر تاوە ناتاوێك هەڕەشە لە سوریاو عێراق دەكات بەگرتنەوەی ئاوی ڕووبارەكە، وەئەو بەربەستانەش هێندە گەورەن كە توركیا دەتوانێت لەڕێگەیانەوە بەتەواوی ئاوی فورات بگرێتەوە، دڵنیاشین لە كاتی لە كاتی گرتنەوەیدا ڕاستی فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ دێتە دی و دبێتە یەكێكی دی لە موعجیزەكانی ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە وەگرتنەوەی ئاوەكەش هێندەی نەماوە تەنها درەنگ و زوو كەوتووە.

## دووەم/ هاتن و دەركەوتنی (سوفیانی):

(أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يَخرُجَ رجلٌ يُقالُ لهُ السُفياني في عُمقِ دمشق، وعامةُ من يَتبَعُهُ من كلب، فَيَقتُلُ حتى يبقر بطُون النساء ويقتُلَ الصبيان، فتَجمَعُ لَهُم قَيسٌ فَيقتُلُها حتى لا يَمنَع ذَنب تلعة، ويخروج رجلٌ من أهل بيتي في الحرّة فيبلغ السفياني، فيبعثُ إليهِ جنداً من جنده فيهزمهم، فَيسيرُ إليه السفياني بمن مَعَهُ حتى إذا صار ببيداء من الأرض خُسف بهم، فلا ينجوا منهم إلا المُخبِرُ عنهُم﴾[1]، واتە: (پیاوێك پەیدا دەبێت پێی دەوترێت سوفیانی لە قوڵایی (دمشق)ەوە، وە زۆربەی ئەوانەی كە شوێنی دەكەون لە خێڵی (كلب)ن، كوشتارێكی زۆر دەكات هەتا وای لێدێت سكی ئافرەت هەڵدەدرێت و منداڵ دەكوژێت، پاشان خێڵی (قیس) لە دژی كۆدەبنەوە ئەویش بەسەریاندا زاڵ دەبێت و دەیان كوژێت، لەو كاتەدا پیاوێك لە ئال و بەیتی من لە ناوچەی (حرە) (جێگەیەكە لە شاری مەدینە) سەر هەڵدەدات و

[1] رواه الحاكم في المستدرك (٤/٥٢٠) وصحيح إسناده على شرط الشيخين ووافقه الذهبي.

هەواڵی بە سوفیانی دەگات، ئەویش لەشکرێك لە لەشکرەکانی خۆی بۆ دەنێرێت بەڵام دەیان بەزێنێت، ئەم جارە سوفیانی بە خۆیی و سوپاکەیەوە بۆی بەڕێ دەکەون، هەتا کاتێك کە دەگەنە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن بەناخی زەویدا، کەسیان لێ ڕزگار نابێت تەنها ئەوە نەبێت کەهەواڵیان دەهێنێتەوە).

لەم فەرموودە پیرۆزەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی مەهدیدا پیاوێکی زاڵم و ستەمکار لە سوریا دەسەڵات دەگرێتە دەست و چەندین شەڕو کوشتار دەکات تا لەکۆتاییدا (محمدی مهدی) لە وڵاتی حیجاز سەرهەڵدەدات و پێ دەچێت کە سوفیانی دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بێت، بۆیە بوونی هێزێکی ئیسلامی لە ناوچەکەدا پێ قبوڵ ناکرێت و دووجار لەشکر کێشی دەکاتە سەریان، جاری یەکەم سوپاکەی لە شەڕی مەهدیدا دەشکێت و جاری دووەمیش خۆی و سوپاکەی ڕۆدەچن بەناخی زەویدا، وەپێویستە بزانین کە سوفیانی ناوی ئەو پادشا زاڵمە نیە بەڵکو لەقەب و شۆرەتیەتی، وە پێ دەچێت کە بارودۆخی سیاسی ناوچەکە لەو کاتە لە باربێت بۆسوفیانی، بۆیە دەتوانێت لەشکرەکەی دووجار ڕەوانەی حیجاز بکات.

## سێیەم/ هاتنی لەشکرێك لەڕۆژهەڵاتەوە کە ئاڵاکەیان ڕەشە:

هەروەك پێشتر باسمان کرد لەو فەرموودەیەدا کە (ثوبان) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەیگێڕێتەوە تیایدا هاتووە: ﴿.... ثمَّ تطلعُ الرايات السود من قِبلَ المشرِق، فيقتلونكم قتلاً لم يَقتُلهُ قومٌ ....(ثم ذكر شيئا لا أحفظه) فقال: فإذا رأيتموه فبايعوه، ولو حبوا على الثلج فأنه خلفية الله المهدي﴾[1]، واتە: (پاشان ئاڵا ڕەشەکان لە دیوی ڕۆژهەڵاتەوە دێن، شەڕ و کوشتارێکتان دەکەن کە هیچ کۆمەڵێك پێشتر شەڕ و کوشتاری وایان نەکردووە(پاشان شتێکی فەرموو لەبیرم نەماوە) پاشان فەرمووی: خۆتان بگەیەننە ئەو لەشکرە ئەگەر بەسەر بەفریشدا خۆتان خشاندووە چونکە ئەوە خەلیفە مەهدییە کە لەلایەن خواوە دەست نیشان کراوە).

وە لە ڕێگەیەکی ترەوە کە هەر (ثوبان) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿إذا رأيتُم الرايات السود قد أقبلَت من خُراسان، فأتوها ولو حبوا على الثلج، فأن فيها خليفة الله المهدي﴾[2]، واتە: (هەر کاتێك ئاڵا ڕەشەکانتان بینی لە خۆراسانەوە هاتن ئەوا خۆتانی بگەیەننێ ئەگەر بەسەر بەفریشدا خۆتان خشاندووە، چونکە خەلیفە مەهدییان لەگەڵ دایە).

---

[1] رواه ابن ماجه والحاكم، وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير هذا (إسناد قوي صحيح)، النهاية الفتن والملاحم (١/٢٩).بەڵام البانی پێی وایە بڕگەی (خليفة الله) زیادە لە فەرموودەکەدا.

خۆراسانیش ناوچەیەکی بەرفراوانە کە بەشێك لەسەروی ڕۆژهەڵاتی ئێران و نیوەی سەرووی ئەفغانستان و بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی باشوری یەکێتی سۆڤیەتی جاران دەگرێتەوە، وە بەناوبانگترین ئەو شارانەش کە دەکەوێتە ئەو هەرێمەوە (نیسابور، هراة، مرو، بلخ، تالقان، نسا، أبیورت، سرخس، ...).

هەروەها (أبو هریرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذا وقعت الملاحم، بعث الله بعثاً من الموالي هم أكرم العرب فَرَسَاً وأجودُهُ سِلاحاً، يُؤيِّد الله بهم الدّين﴾[1]، واتە: (هەرکات کە جەنگە گەورەکان بەرپابوو خوای گەورە کۆمەڵێك دەنێرێت لەو موسڵمانانەی کە عەرەب نین، لە خانەدان ترین و ڕێزدارترینی عەرەب سوار چاکتر و چەکیان نایاب ترە، خوای گەورە ئەم دینەیان پێ سەردەخات).

لەم فەرموودانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی مەهدیدا سوپایەکی ئیسلامی بەهێز و بەتوانا لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا دادەمەزرێت بەتایبەت لە خۆراسان کە ناوچەیەکی شاخاوی بەرفراوانی سەختە و بەفری زۆری لێدەبارێت، وەلەکاتی ئاشکرابوونی مەهدیدا ئەو سوپایە بەرەو ئەم ناوچانە دەکشێن و دەبنە پشتیوان بۆ مەهدی و ئاڵا ڕەشەکانیان تەسلیم بەو دەکەن، وە هەروەك لە فەرموودەکانیشدا دەردەکەوێت کۆمەڵێکن لە شەڕو جیهاد کردندا وێنەو نموونەیان نییە.

وە ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیە کە ئەمڕۆ لە کاتێکدا هەموو کوفری جیهانی یەك دەست و یەك هەڵوێستن لە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوە و سەرکوت کردنی ڕابوونی ئیسلامیدا و سەرکردە و لایەنە ئیسلامیەکان لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقە دراون و تەنگیان پێ هەڵچنراوە، تا بەچاری ناچاریی بەشی زۆریان ڕوویان کردۆتە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و چیا بلند و سەرکەشەکانی ئەفغانستان و چیچان و کشمیر بووەیە باشترین قەڵاو پشتیوان بۆ تامەزرۆیانی جیهاد و ئارەزوومەندانی خەبات و شۆڕش لە پێناو گێڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی و چەسپاندنی حاکمیەت و شەرعی خوا لەسەر زەویدا، بەڕادەیەك کە دەتوانین بڵێین ترسێکی گەورەی خستۆتە دڵی دوژمنانی ئیسلامەوە و بە بۆمبێکی تەوقیتکراوی دادەنێن کە لە هەر فرسەتێکدا بۆی هەیە بتەقێتەوەو بەرەو ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامی لێشاو بهێنێت.

---

[1] صحيح سنن ابن ماجه للألباني (٢/٣٩٠) رقم (٤٠٩٠)، وقال (حسن) تخريج فضائل الشام ٢٨، الصحيحة(٢٧٧٧).

وه (ابن كثير)یش دهربارهی پشتیوانی ئهو كۆمهڵه بۆ مههدی ئاخرزهمان دهڵێت: ﴿ويُؤيدُ بناس من أهلِ المشرق يَنصرونهُ، ويُقيمونَ ساطانه، ويشيّدون أركانهُ، وتكون راياتهم سودٌ أيضا، وهو زي عليه الوقار لأنَّ راية رسول الله(ﷺ) كانت سوداء يقال لها العُقاب﴾[1]

واته: (مههدی بهكهسانێك له خهڵكی رۆژههڵات پشتیوانی دهكرێت و سهری دهخهن، وه ئهو كۆمهڵه دهسهڵاتی بۆ دادهمهزرێنن و كۆڵهكهكانی بۆ بتهودهكهن و دهچهسپێنن، وه ههروهها ئاڵاكانیشیان رهش دهبێت، كهئهویش پۆشاكێكه ههیبهتی پێوه دیاره، چونكه ئاڵاكهی پێغهمبهریش(ﷺ) رهش بوو پێی دهوترا(العقاب) واته (شاهۆ)).

## چوارهم/ مردنی پادشایهك پێش هاتنی ئیمام مههدی:

(أم سلمه) رهزای خوای لێبێت دهگێڕێتهوه كه پێغهمبهر(ﷺ) فهرموویهتی: ﴿يكون إختلاف عند موت خليفة، فيخرُجُ رجل من أهل المدينةِ هارباً الى مكة، فيأتي ناسٌ من أهل مكة فيُخرجونهُ وهو كارهٌ، فيُبايعونهُ بين الرّكنِ والمقام، فيُبعث إليه بعث من الشام فيُخسف بهم بالبيداء بين مكة والمدينة....﴾[2]، واته: (ناكۆكی و ئاژاوهیهك روودهدات لهكاتی مردنی پاشایهكدا، لهو كاتهدا پیاوێك له خهڵكی (مهدینه) ههڵدێت بهرهو (مهكه)، كهسانێكیش له خهڵكی (مهكه) دێن بۆلای و بهنابهدڵی خۆی دهیهێننه دهرهوه و بهیعهتی دهدهنێ لهنێوان (ركن) و (مقام)دا پاشان لهشكرێكی له وڵاتی شامهوه رهوانهدهكرێته سهر، لهبیابانی نێوان مهكه و مهدینهدا لهشكرهكه رۆ دهچێت).

لهم فهرموودهیهوه بۆمان دهردهكهوێت كه له پێش ئاشكرابوونی (محمدی مهدی) دا پادشایهك دهمرێت (وهك پێشتر روونمان كردهوه مهبهست به خهلیفه پادشایه نهك خهلیفهی موسڵمانان چونكه له پێش هاتنی مههدیدا خهلافهتی ئیسلامی نامێنێت) وه لهكاتی مردنهكهیدا ئاژاوه و ناكۆكیهكی زۆر دروست دهبێت كه پێ دهچێت (مههدی)یش تارادهیهك تهرهف و لایهن بێت لهو ناكۆكیهدا بۆیه له خۆی دهترسێت و له مهدینهوه ههڵدێت بهرهو مهكه، وه له فهرموودهكهشدا وادهردهكهوێت كه ئهو پادشایه (پادشای سعودیه) بێت چونكه ناكۆكی و كێشهكه له مهكه و مهدینه روودهدات.

## پێنجهم/ رۆچوونی لهشكرێك له بیابانی نێوان مهكه و مهدینهدا:

---

[1] النهاية/ الفتن والملاحم (١/ ٢٠-٣٠).

[2] رواه أحمد وابو داود والحاكم، قال الشوكاني: وفي الصحيح أيضا طرف منه، وأخرجه الطبراني أيضا ورجاله رجال الصحيح.

هەروەك لە فەرموودەكانی پێشوودا هاتبوو لە كاتی ئاشكرابوونی مەهدی و بەیعەت پێدانیدا، لەشكرێك لە وولاتی شامەوە هێرشی بۆدەبەن وە لە بیابانی نێوان مەكە و مەدینەدا لەشكرەكە بەتەواوی ڕۆدەچێت بەناخی زەویدا، وە ئەم ڕووداوە لەچەندین فەرموودەی صەحیحدا ئاماژەی بۆكراوە لەوانە: عائیشەی دایكی موسڵمانان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: ﴿عبث رسول الله(ﷺ) في منامه، فقُلنا: يارسول الله صَنَعَت شيئا في منامك لم تَكن تَفعلُهُ، فقال: (العجب أن ناسا من أمتي يؤمون البيت لرجل من قُريش قد لجأ بالبيت، حتى إذا كانوا بالبيداء خُسف بهم). فقلنا: يارسول الله إن الطريق قد يجمع الناس، قال: (نعم، فيهم المستَبصِرُ والمجبور وإبن السبيل يهلكون مَهلكاً واحداً ويصدرون مصادرون مصادر شتى يبعثهم الله على نياتهم)﴾[1]، واتە: (جارێكیان پێغەمبەر(ﷺ) لەكاتی نوستندا دەست و لەشی دەجووڵایەوە ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا لەكاتی نوستندا شتێكت كرد پێشتر كاری وات نەكردووە، ئەویش فەرمووی: جێی سەرسوڕمانە كەسانێك لە ئومەتەكەم ڕوویان كردۆتە ماڵی بەیت بۆ پیاوێكی قوڕەیشی كە پەنای بردۆتە بەر كەعبە، هەتا كاتێك كەگەیشتنە بیابانەكە ڕۆچوون بە زەویدا، ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگە جاری وا هەیە خەڵكی جۆراو جۆر كۆدەكاتەوە، فەرمووی بەڵێ تیایاندایە بە چاوڕۆشنی هاتووەو تیایاندیە بەزۆر هێنراوە و تیاشیاندیە ڕێبوارە، هەموویان بەیەك تیاچوون تیادەچن وە هەر یەكێكیان بەڕێیەكی جیاواز دەڕوات و خوا هەریەكەیان لەسەر نیەتی خۆی زیندو دەكاتەوە).

(أم سەلەمە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يعوذ عائذ بالبيت، فَيُبعث إليه بعثٌ، فإذا كانوا ببيداء من الأرض خُسف بهم﴾[2]، واتە: (كەسێك پەنا دەگرێت بەم ماڵی بەیتە سوپایەك ڕەوانە دەكرێتە سەری كاتێك كەدەگەنە زەویەكی بیابان ڕۆدەچن بەزەویدا).

كەواتە گەورە ترین نیشانەی دەركەوتن و ناسینەوەی مەهدی ڕۆچوونی ئەو لەشكرەیە لەبیابانی حیجازدا، وە پێ‌دەچێت خەڵكی لەسەرەتادا دڵنیانەبن لەوەی كە ئەو پیاوەی پشتی داوەبە كەعبەوە و پەنای بۆ ماڵی بەیت بردوە (محمدی مهدی) بێت بەڵام دوای ڕۆچوونی ئەو سوپایە بەناخی زەویدا كە بە مەبەستی لە ناوبردنی مەهدی ڕوو لە حیجاز دەكەن ئیتر هیچ گومانێك لەلای ئیماندارانی ئەو سەردەمە نامێنێت كە ئەمە ئەو پیاوەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی بەهاتنی داوە لەئاخر زەماندا و خەلافەتی ئیسلامی لە سەر دەستیدا دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی كەئاشكرا دەبێت ناوی

---

[1] صحيح مسلم (٤/٢٢١٠) رقم (٢٨٨٤).

[2] صحيح مسلم (٤/٢٢٠٨) رقم (٢٨٨٢).

(محمد)ەو باوکیشی ناوی (عبداللە)یە، چونکە ڕووداوی ڕۆچوونی ئەو سوپایە لە بیابانی حیجازدا پێشتر هەرگیز ڕوونەداوەو تەنها لەسەردەمی ئەودا ڕوودەدات.

## شەشەم/ دەرکەوتنی نیشانەیەك لە ئاسماندا:

سەید محمد بەرزنجی لەکتێبی (الاشاعة لأشراط الساعة)دا دەڵێت (یەکێکی تر لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی مەهدی دەرکەوتنی ئەستێرەیەکە لە ئاسماندا کلکێکی بەدواوەیە دەدرەوشێتەوە)[1] هەر لە بابەت ئەو ئەستێرەیەشەوە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا (اثر)ێکی (صحیح)دا لە (ابن عباس)ی دەگێڕێتەوە، دەڵێت (ابن جریر) لە (عبداللە بن أبي ملیکة)دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ﴿غَدَوتُ علی ابن عباس ذات یومٍ فقال: ما نمتُ اللیلة حتی أصبحتُ، قلتُ: لمَ؟ قال: قالوا طلع الکوکبُ ذو الذنب فخشیت ان یکون الدخان قد طرق، فما نمت حتی أصبَحتُ﴾[2]، واتە: (ڕۆژێکیان سەر لە بەیانی سەردانی (ابن عباس)موسڵمانان کرد، ووتی: ئەمە شەو تا بەیانی نەخەوتووم، ووتم بۆ؟ ووتی: ووتیان ئەستێرە کلك دارەکە دەرکەوتووە، منیش ترسام دووکەڵکە سەری هەڵدابێت، ئیتر تا بەیانی خەوم لێ نەکەوت).

هەروەها ئیمام (أبو بکری بیهقی) لە (عبداللە ی کەڕی عەباس)ەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ﴿لا یخرج المهدي حتی تطلع من الشمس آیة﴾[3]، واتە: (مەهدی نایەت هەتا لەگەڵ خۆردا نیشانەیەك هەڵدێت).

ئەمەو ئەستێرەی کلك دار زۆر جار لە ئاسماندا دەرکەوتووە بەتایبەتی ئەوەی کە پێی دەوترێت کلك دار (هالي) کە زاناکان دەڵێن هەموو (٧٦) ساڵ جارێك دەردەکەوێت، بەڵام پێ دەچێت ئەوکلك دارەی لە پێش هاتنی مەهدیدا دەردەکەوێت کلك دارێکی تر بێت هەروەها لە ساڵی (١٩٩٧)ی زاینی دا کلك دارێك لە ئاسماندا دەرکەوت زۆر گەش و درەوشاوە بوو وە زیاتر لەدوومانگ بە ئاسمانەوە مایەوە زاناکان پێیان دەووت کلك داری (بوب-هیل) وەدەڵێن هەموو سێ ساڵ جارێك دەردەکەوێت، ئێمەش دەڵێین تۆ بڵێی ئەوو کلك دارە بێت کە لە پێش مەهدی ئاخر زەماندا دەردەکەوێت، خوای گەورە خۆی دەزانێت.

## حەوتەم/ چەند نیشانەیەکی تر:

---

[1] الاشاعة ١٧٦

[2] تفسیر ابن کثیر (١٣٩/٤).

[3] أخرجه عبدالرزاق رقم (٢٠٧٧٥) ونعیم بن حماد في (الفتن) واسناده صحیح ورجاله ثقات، التهذیب (٢٤٣/١٠).

ئەمەو جگە لەو نیشانەش هەندێك ڕیوایەت باس لە كۆمەڵێك نیشانەی تریش دەكەن كە لەپێش هاتنی مەهدیدا ڕوودەدەن، بەڵام ئەو ڕیوایەتانە ناتوانرێت پشتیان پێ ببەسترێت و جێی متمانە نین، چونكە هەندێكیان (ضعیف)نیشانەكانی و هەندێكیان (مقطوع) یان (موقوف)ن. بۆنموونە (سید محمد صدیق حسن القنوجی) لە كتێبی (الأذاعة) و (سید محمد البرزنجی) لە كتێبی (الأشاعة) و (نعیم بن حماد) لە كتێبی (الفتن) و (ئیمامی سوطي) لە (الحاوي)دا باس لە هەندێك نیشانەی تر دەكەن كە لە پێش هاتنی مەهدی دا دەردەكەون وەك سەرهەڵدانی سێ كەس كە بە (أبقع) و (أصهب) و (عرج الكندی) ناو دەبرێن و هەریەكەیان خاوەنی سوپایەكەو لە پێش هاتنی مەهدیدا شەڕ لەگەڵ سوفیانی دەكەن و سوفیانی هەموویان دەبەزێنێت[1]

هەروەها كوشتنی پیاو چاكێك كە بە(النفس الزكیه) ناو دەبرێت لە شاری مەكە لە پێش هاتنی مەهدیدا[2]

هەروەها خۆرگیران و مانگ گیرانێك كە لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوودەدەن لەو ساڵەدا كەمەهدی تێدا ئاشكرا دەبێت[3]

هەروەها ڕۆچوونی گوندێگ لە نزیك شاری (دمشق) كە پێی دەوترێت (حرستا)[4] كە ئێستا وەك پرسیارم كردووە زانیومە بەهۆی گەورە بوون و بەرفراوانی شاری (دمشق) بووە بە گەڕەكێك لە شارەكەو هەر بە (حرستا) ناودەبرێت و چەندین دام و دەزگای سەربازی حكومەتی سوریاشی تێدایە.

هەروەها كۆمەڵێك ڕیوایەت هاتوون كە باس لە زرمەو دەنگێكی گەورە دەكەن كە لە شەوی پانزەی ڕەمەزانی ڕێكەوتی جومعەی ئەو ساڵەدا ڕوودەدات كە (محمدی مهدی) تێدا ئاشكرا دەبێت ئەو ڕیوایەتانەش لە چەندین ڕێگەوە گێڕاونەتەوە. بۆ نموونە لە (أبو هریرە) بە (مرفوع)ی و بە(موقوف)ی گێڕدراوەتەوە. هەروەها لە (أبو هریرە) و (عبدالله كوڕی عمر) و (أبی أمامه)شەوە بە (مرفوع)ی گێڕدراونەتەوە پاشانیش لە (مكحول)و (شەهری كوڕی حوشب)یش بە (مرسل)ی (كعب)و چەندین تابعی تریش گێڕدراوەنەتەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین كە سەنەدی هیچ كام لەو

---

[1] رواه نعیم ابن حماد في الفتن عن الحكم عن جراح عن أرطاة. بسند حسن.

[2] أخرجه ابن أبي شيبة عن مجاهد ورفعه للرسول الله ﷺ من غير ذكر أسم الصابي و اسناده الى مجاهد) صحيح ورجاله كلهم ثقات.

[3] رواه الدارقطني في سننة عن الإمام محمد بن علي الباقر. وسنده ضعيف.

[4] أخرجه ابن عساكر عن خالد بن معدان، ونعيم بن حماد في الفتن، يقول ابن حبان: ورجاله ثقات.

ڕیوایەتانە لە پلەی (ضعیف) سەرناکەوێت و ناتوانین تەواو بڵێین جێی ماتمانەن، هەرچەندە زۆریی ڕێگای گێڕانەوەی ڕیوایەتەکان تا ڕادەیەك یەکتر بەهێز دەکەن و حوکمی (ضعف)ەکە لاوازدەکات هەروەك زانایانی (علم الحديث) دەفەرموون.

لەمو فەرموودانەش: (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ﴿تكون هدة في شهر الرمضان توقظ النائم، و تفزع اليقظان، ثم تظهر عصابة في شوال ثم معمعة في ذي الحجة، ثم تهتك المحارم في محرم، ثم يكون موت في صفرن ثم يتنازع القبائل في ربيع، ثم العجب كل العجب بين جماد ورجب، ثم ناقة مقتبة خير من دسكرة تقل مائة ألف﴾[1]، واتە: (زرمەیەك لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوودەدات، خەوتوو خەبەر دەکاتەوەو بەخەبەریش ڕادەچڵەکێنێت، پاشان کۆمەڵێك دەردەکەون لە مانگی (شوال)دا، پاشان تێك پژان و شەڕێکی گەرم لە مانگی (ذي الحجة)دا، پاشان هەتکی ناموس و پیرۆزییەکان دەکرێت لە مانگی (محرم)دا پاشان مردنێکی زۆردەبێت لە مانگی (صفر)دا، پاشان خێڵ و لایەنەکان تێك بەردەبن لە مانگی (ربیع)دا، ڕووداوی سەرسوڕهێنەر لە نێوان مانگی (جمادی) و (رجب)دا ڕوودەدات، پاشان ووشترێکی ئامادە لەکۆشکێك کەجێی سەد هەزار کەسی تێدا بێتەوە باشترە).

هەروەها (عبدالله ی کوڕی مسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (اذا كانت سيحة في رمضان، فإنه يكون معمعة في شوال، وتميز القبائل في ذي القعدة، تسفك الدماء في ذي الحجة، والمحرم وما المحرم؟ يقولها ثلاثا–هيهات هيهات، يقتل الناس فيها هرجا هرجا، قال: قلنا وما الصيحة يا رسول الله؟ قال: هدة في النصف من رمضان ليلة الجمعة، فتكون هدة توقظ النائم، وتقعد القائم، وتخرج العواتق من خدورهن، في ليلة جمعة، في سنة كثيرة الزلازل، فإذا صليتم الفجر من يوم الجمعة فأدخلوا بيوتكم، وأغلقوا أبوابكم، وسدوا كواكم، ودثروا أنفسكم، وسدوا آذانكم فإذا حسستم بالصيحة فخروا لله سجدا، وقولوا سبحان القدوس، سبحان القدوس ربنا القدوس، فإنه من فعل ذلك نجا، ومن لم يفعل ذلك هلك﴾[2]، واتە: (ئەگەر دەنگێکی گەورە هات لە مانگی ڕەمەزاندا، ئەوا شەڕو کوشتارێکی گەرم دەبێت لە مانگی (شوال)دا، وە خێڵ و لایەنەکان لە مانگی (ذي القعدة)دا دەچن بەیەکدا، وە خوێنێکی زۆر لە مانگی (ذي الحجة)دا دەڕژێت، ئینجا (محرم) بەڵام چ (محرم) سێ جار دووبارە کردەوە: نەخێر نەخێر، خەڵکی تیایدا بە لێشاو دەکوژرێن. دەڵێت: ووتمان ئەی پێغەمبەر خوا ئەو دەنگە گەورەیە چییە؟ فەرمووی: زرمەیەکەلەنیوەی مانگی

---

[1] أخرجه ابن عساكر عن خالد بن معدان، ونعيم بن حماد في الفتن، يقول ابن حبان: ورجاله ثقات.

[2] ضعيف، أورده نعيم بن حماد في الفتن رقم (٦١٩) والسيوطي في اللالي (٢/٢٠٧) واللفظ عن نعيم بن حماد.

ڕەمەزانـدا لــە شـەوێکی جومعـەدا، زرمەیـەك دەبێـت خـەوتوو خەبەردەکاتـەوەو ئـەوەی بەپێوەیـە دایدەنیشێنێت و نافرەتی پۆشتە و پەرداخ لە ماڵی خۆیان دەهێنێتە دەر، لە شـەوێکی جومعـەدا: لــە ساڵێك کە بوومەلەرزەی زۆر تێدا ڕوودەدات، ئەو ڕۆژی جومعەیە کە نوێژی بـەیانیتان تێـدا کـرد، بچنە ماڵەکانی خۆتانەوە، دەرگاکانتان داخەن و هەرچی کون و کەلێن لە ماڵەکانتاندا هەیە بیگـرن و قەپاتی بکەن، وەخۆتان داپۆشن و توند گوێی خۆتان بگرن، لەگەڵ هەسـتـان بەزرمـەو دەنگەکـە کرد، یەکسەر بچنە سوجدەو بڵێن (سبحان القدوس سبحان القدوس، ربنا القدوس) چـونکە هـەر کەس وابکات ڕزگاری دەبێت و هەر کەسیش وانەکات تیادەچێت).

هەروەها (عبدالله ی کوڕی عەمر) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: ﴿يحج الناس معن ويعرفون معن علي غير إمام، فإذا هم نزولٌ بمنى، إذ أخذهم كالكلب، فثارت القبائل بعضها الى بعض، فاقتلوا حتى تسيل العقبة من دمائهم، فيفزعون الى خيرهم فيأتونه، وهو ملصق وجهه الى الكعبة يبكي، كأني أنظـر الى دموعه، فيقولون: هلم فلنبايعك، فيقول: ويحكم كم مـن عهـدٍ قـد نقـضتموه، وكـم مـن دم قـد سفكتموه، فيبايع كرها، فإن أدركتموه فبايعوه فإنه المهدي﴾[1]، واتە: (خەڵکی پێکەوە دەچنە حەج و پێکەوە دەچنە سەر کێوی عەرەفـە بـەبێ ئـەوەی پێـشەواو ئیمامیـان هـەبێت، وە لـە کاتێکـدا کـە دێنەخوارەوە بۆ (منی)، هەروەك چۆن ئەو کەسەی قەپی لێگرتووەو توشی هاری بووە، ئـاواش ئـەو خەڵکانە هـاردەبن و بەیەکـدا دەچـن و کوشـتارێکی وەهـا لــە یـەکتر دەکـەن هـەتا وای لێـدێت جۆگەلەخوێن لە (العقبة)دا هەڵدەستێت، پاشان ڕوودەکەنـە باشـترین و چـاکترین کەسـیان و دێـن بۆلای، ئەویش ئەو کاتە دەموچاوی نـاوە بـە کەعبـەوە و دەگـری هـەر دەڵـێی ئائێـستا سـەیری فرمێسکەکانی دەکەم و لەبەر چاومن، پێی دەڵێن: هادەی هەستە با بەیعەتت بدەینێ، ئەویش دەڵێت ئاخ لە ئێوە چەند پەیمان و بەڵێنتان هەڵوەشاندەوە و چەندتان خوێنی ناحەق ڕشت، پاشان بە نابەدڵی خۆی بەیعەتی پێ دەدرێت، ئەگەر کەوتنە ئەوکاتەوە و پێی گەیشتن ئێوەش بەیعەتی بدەنێ، چـونکە ئەوە مەهدیە).

بەڕاستی وەسفی ئەو زرمەیەی کە لە ڕیوایەتەکەی (ابن مسعود)دا هاتووە و ئەو ڕێگە چـارانەی کە موسڵمانان پێویستە بیگرێتە بەر بۆ خۆپاراستن لێی، هەردەڵێی باسـی تەقینـەوەی بـۆمبی ئـەتۆمی دەکات، هەروەها ئەو کوشت و کوشتارەی کە لە نێوان حاجیەکاندا لەو ساڵەدا ڕوودەدات تائێستا لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی ڕابردوودا دووجار ڕوویداوە و جارێکیان لە سـاڵی (١٩٨٧ز)دا زیـاتر

---

[1] ضعيف أخرجه الحاكم في المستدرك(٥٠٣/٤) وابو عمر الداني في سننه (٥٦٠/٥) ونعيم ابـن حمـاد في الفـتن رقـم (٦١٤-٦١٥).

لە هەزار حاجی کوژران وساڵی (١٩٩٢ز)یش نزیکەی سێ سەد حاجی کوژران، وە بەپێی فەرموودەکانیش لەو ساڵەدا کە (محمدی مهدی) تێدا ئاشکرا دەبێت هەمان کارەسات بەگەورەترو دڵ تەزێنتر دووبارە دەبێتەوە، بەڵام هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێ کرد ئەم ڕیوایەتانە هەمووی لەپلەی (ضعیف)دان و ناتوانرێت تەواو پشتیان پێ ببەسترێت.

## ئەو جەنگ و ڕووداوانەی کە لەسەردەمی ئیمام مەهدیدا ڕوودەدەن:

پاش ئەوەی کە (محمدی مهدی) لە ڕۆژێکی پڕ لە ناکۆکی و فیتنە و ئاژاوەدا ناچاردەبێت لەترسی گیانی خۆی بە نهێنی لە شاری مەدینەوە بەرەو شاری مەکە هەڵبێت، وە پاش ئەوەی لەشاری مەکەش ئەو ساڵە لەکاتی حەجدا حاجیەکان دەستیان دەچێتە خوێنی یەکتر و لە ئاستی (عقبة)دا خوێنیان وەك جۆگەلە هەڵدەستێت، مەهدیش لە بێتاقەتی خۆی و لە خەفەتی ئەوبارودۆخەی کە موسڵمانان تێکەوتوون، ڕوومەتی دەنێت بە کەعبەوەو بەکوڵ دەگری و لەخوا دەپاڕێتەوەو فرمێسك بەچاوەکانیدا دێتە خوارەوە، ئالەو کاتەدا کۆمەڵێك موسڵمانی ئیماندار و زانا و ژیر و ووردبین ڕووی تێدەکەن و هانای بۆ دەبەن و داوای لێدەکەن کە ببێتە ئەمیریان و بەیعەتی پێبدەن، بە هیوای ئەوەی لەسەردەستیدا موسڵمانان لەو بارە ناهەموارەی کە تێی کەوتوون ڕزگاریان بێت، جالێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کەئەو خەڵکە بەجۆرێك لە جۆرەکان مەهدیان ناسیوەو لێیان پەرمووە و بەشیاویان زانیوە کە ئەو ئەرکە بخەنە ئەستۆی، واتە مەهدی کەسێکی نەناسراو و نادیار نەبووە لەناو خەڵکەکەدا بەڵکو دەستی لەڕووداو و گۆڕانکاریە سیاسیەکاندا هەبووە، ئەگەرنا بۆچی بەنهێنی لە مەدینەوە هەڵدێت بۆ مەکە، وە ئەگەر پێشتر لەلای خەڵکی ناسراو جێی متمانە نەبێت، چۆن لەو کاتی تەنگانەیەدا لە دەوری کۆدەبنەوەو بەیعەتی دەدەنێ، بەڵام پێم وانیە نە خۆیو نە خەڵکەکەش لەو کاتەدا لەو ڕاستیە ئاگادار بن کە ئەمە مەهدیی ئاخر زەمانە، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿یصلحه الله في اللیلة﴾[1]، واتە: (خوای گەورە لەشەوێکدا بۆ ئەو کارەی دەسازێنێو دەیکات بە شیاوی هەڵگرتنی ئەو کارە قورسو ئەرکە گرانە).

پاش ئەوەی کە بەنابەدڵی خۆی بەیعەتی دەدەنێو خەڵکانێك لە دەوری کۆدەبنەوە، هەڵدەستێت بە ئەنجام دانی ڕاپەڕینێك لە شاری (مەکە)داو دەست بەسەر شارەکەدا دەگرێت، دیارە

[1] صحيح رواه ابن ماجه وأحمد وفي الصحيحة للألباني رقم (٢٣٧١).

دەست بەسەرا گرتنی شاری (مەکە)ش لەلایەن کۆمەڵێکی ئیسلامیەوە دەنگدانەوەی خۆی دەبێت لە جیهانداو کارێکیشە لەلایەن کوفری جیهانیەوە بە هیچ شێوەیەك قبوڵ ناکرێت و بێدەنگ نابن لەسەری، وەپاش ئەوەی کە کوفری جیهانی دڵنیا دەبن کە دەسەڵات دارانی سعودیە بەهۆی ناکۆکی سیاسی ناوخۆیان لەسەر دەسەڵات (بەتایبەتی پاش مردنی پادشاکەیان وەك لە ڕیوایەتەکەی أم سلمەدا هاتووە) توانای سەرکوت کردن و دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی ناو (مکە)یان نیە، بۆیە ئیشارەتی سەوز دەدرێت بەو پادشا ستەمکارەی کە لە ڕیوایەتەکاندا بە سوفیانی ناوی هاتووەو لەوکاتەدا بەتوانا ترین دەسەڵاتداری ناوچەکە دەبێت و پێشتر شەڕی کردووەو لە شەڕەکانیدا سەرکەوتوو بووە، ڕێگەی پێدەدرێت کە لەشکرکێشی بکات بۆ ناو خاکی (سعودیە) بۆلەناوبردنی مەهدی و شوێن کەوتوەکانی، پاشان لەشکرەکەی سوفیانی ڕوو دەکاتە خاکی حیجازو لە پێشدا پەلاماری شاری مەدینە دەدات و شارەکە وێران و خاپوور دەکات و خوێنێکی زۆری تێدا دەڕژێت، (معاذی کوڕی جبل) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿عمران بیت المقدس خراب یثرب، وخراب یثرب خروج الملحمة.....﴾[1]، واتە: (ئاوەدانکردنەوەو دروست کردنی بیت المقدس کاول بوون و وێران بوونی شاری مەدینەی بەدوادا دێت، وێران بوونی مەدینەش جەنگە گەورەکەی بەدوادا دێت). هەروەها (أبو هريرە)ش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: ﴿تکون بالمدینة وقعة تغرق فیها أحجار الزیت، ما الحرّة عندها إلا کضربة سوط فینتحي عن المدینة قدر بریدین. ثم یبایع الی المهدي﴾[2]، واتە: (لە مەدینەدا شەڕێك ڕوودەدات لە ناوچەی (بەردەکانی زەیت)- شوێنێکە لە مەدینە- لە خوێندا دادەپۆشرێت ناوچەی (حرە)ش کە شوێنێکی ترە لە مەدینە- لەئاستیدا هەر وەك شوێنی لێدانی قامچی لێ دێت، پاشان شەڕەکە بەبڕی ڕێگای دووجار حەوانەوەی پۆستەچی-کە پێوانەیەکی ئەوزەمانەیە- لە شاری مەدینە دوور دەکەوێتەوە پاشان بەیعەت دەدرێت بەمەهدی).

ئەمەو لەو فەرموودەیەدا کە (معاذ) دەیگێڕێتەوە ڕاستیەکی ترمان بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەویش ئەوەیە کە لەپێش هاتنی مەهیدا شاری (بیت المقدس)یش کاول دکرێت و دواتر دروست دەکرێتەوە و ئاوەدان دەکرێتەوە، وەدیارە ئەو وێران کردنەی شاری (قدس)یش هەر لەسەر دەستی جولەکەدا ڕوودەدات، وە ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر هەست بەو نیازو مەرامە گڵاوەی جولەکە دەکرێت سەبارەت بە کاول کردنی ئەو شارەو ڕووخاندنی مزگەوتی پیرۆزی (أقصی) کە قیبلەی یەکەمی

---

[1] رواه احمد في المسند (٥/٢٣٢و ٢٤٥) وابو داود رقم (٤٢٩٤) وهو حديث صحيح.

[2] رواه نعيم ابن حماد رقم (٨٨٦) وأورده السيوطي في الحاوي (٢/٧١).

موسـڵمانان و سـێیەمی حەرەمـە پیرۆزەکانـە، ئـەویش بەمەبەسـتی ئـەوەی لـە جێگـەی مزگەوتەکە(هەیکەلە) کۆنەکەی خۆیان دروست بکەنەوە کە پێیان وایە مزگەوتەکە لە شوێنی ئەودا دروست کراوە، وە بۆ ئەو مەبەستەش ئەمڕۆ لە چەندین لاوە (نفق) و تونێلیان لە ژێر زەوی یەوە لێ داوە بەرەو خاکی ژێر مزگەوتەکەدا بەناوی گەڕان بەدوای شوێنی هەیکەلەکەدا کە ئەمەش ئەو مزگەوتە پیرۆزەی دووجاری خەتەری دارمان کردووە، وە لـە کـاتی ئـەم نوسـینەشمدا ڕاپـەڕینێکی گەورە لەلایەن جەماوەری موسڵمانی ئەو شارەوە بەرپا بووە دژ بە هەوڵێکی (ئاریـل شـارۆن) کـە یەکێکە لەسەرکردە توندڕەوەکانی جوولەکە بۆ ئەوەی بە پاسەوانێتی زیاتر لە سێ هـەزار سـەربازی چەکداری جوولەکە پێ‌ی گڵاوی بخاتە ناو حەرەمی مزگەوتەوە، بەڵام ئـەو جـەماوەرە موسـڵمانەو نوێژخوێنانی مزگەوتەکـە بـە بـەرد و دار خـۆی و پاسـەوانەکانیان ڕاونـاو نەیانهێـشت بـە مەرامـە گڵاوەکەی خۆی بگات، وە ڕاپەڕینیش هەر بەردەوامەو ڕۆژانە دەیـان شـەهید و سـەدان برینـداری لێدەکەوێتەوە، ئەمانە هەموو سەرەتان بۆ هاتنەدی فەرموودەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) کـە دەفـەرموێت: شارەکە دروست دەکرێتەوە و ئاوەدان دەکرێتەوە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەپێشتر ڕووخاوە و کـاول کـراوە بۆیـە سـەرلەنوێ دروسـت دەکرێتـەوە و ئـاوەدان دەکرێتـەوە، وە بـەدوای ئـەو ئاوەدانکردنەوەیەی (بيت المقدس)یشدا ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی تر ڕوودەدات کە ئێستا باسمان کـرد کە ئەویش کاول بوونی شاری مەدینەی پێغەمبەرە(ﷺ).

پاش ئەوەی کە ئەو لەشکرەی سوفیانی ئەو کاول کاری و کوشت و کوشتارە ئەنجام دەدات لە شاری مەدینەدا، دوای ئەوە لە شاری مەدینە دەردەچێت و بەرەو شاری مەکە بەڕێ دەکەوێت، بەڵام دیارە تۆڵەی خوای گەورە بەڕێوەیەو ئەو کەعبەیەی کە خوای گەورە لەلەشکری ئەبرەهەی پاراست و لە دەجالیشی دەپارێزێ، بەهەمان شێوە لە ستەمکارێکی وەك سوفیانیشی دەپارێزێت، هـەر بۆیـە لەشکرەکە کە دەگەنە بیابانی نێوان مەکە و مەدینە بە جارێك ڕۆدەچن بەناخی زەویدا و کەسیان لێ دەرناچێت تاتنها ئەوە نەبێت کە هەواڵی ڕۆچوونەکەیان دەگەیەنێت.

هەروەها لەڕووداوەکانی پێش هـاتنی مەهدیـدا باسمـان کـرد دیـارە ڕۆچـوونی ئـەو سـوپایەش بەوشێوەیەی کە پێغەمبـەر(ﷺ) هەواڵی پێداوە لە هەموو جیهاندا دەبیسـترێت و دەبێتـە بەڵگەیـەکی حاشا هەڵنەگر کە ئەو پیاوەی لە (مكه) بەیعەتی پێدراوە بەڕاستی مەهدی ئاخرزەمانە، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە لای هەموو خەڵکی ئاشکرا دەبێت کە ناوی (محمد)ەو باوکیشی نـاوی (عبـدالله)یـە وە هەموو مەرجەکانی تریش کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردوون تێدایە، ئیتر خەڵکی پۆل پـۆل لـەدەوری کۆدەبنەوەو بەیعەتی پێدەدەن، ئەویش لەشکرێکی تۆکمەو بەتوانایان لێ دروست دەکات و تەواوی

خاکی حیجاز دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و بەوەشەوە ناوەستێت بەڵکوفرسەتەکەدەقۆزێتەوە و بوار نادات کات بەفیڕۆ بڕوات هەتا دوژمنەکانی لە کوفری جیهانی فریای خۆیان بکەون و ڕێگری لێ بکەن، هەر بۆیە بە هاوکاری ئەو لەشکرە ئیسلامیە ئاڵاڕەشەی لە ڕۆژهەڵاتەوە دێن و بەیعەتی پێدەدەن، لەماوەیەکی کەمدا دەست دەگرێت بەسەر هەموو ئەوناوچانەی کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی سوفیانیدا بوون، بەمەش بەشێکی زۆری وڵاتی شام و عێراق و حیجازی بۆ یەکلا دەبێتەوە و دەوڵەتی خەلافەتی تێدا ڕادەگەیەنێت، لەوانەیە کەسێك لێرەدا پرسیار بکات و بڵێت ئەی لەو کاتەدا دەوڵەتە زلهێزەکانی وەك ئەمریکا و ئەورووپا لە کوێن و چۆن ڕێگە بەدروست بوونی ئەم دەوڵەتە ئیسلامیە دەدەن؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەشدا دەڵێین: لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وا دەردەکەوێت کەلەو کاتەدا جیهانی کوفر سەرقاڵی جەنگێکی گەورە بن لە نێوان خۆیاندا بۆیە لەسەرەتادا سەریان ناپەرژێت هێزو توانایان ئاراستەی ئەم لێشاوە ئیسلامیە بکەن، بەڵکو زیاتر لەوەش لە فەرموودەکاندا وا دەردەکەوێت کە وڵاتانی ڕۆژئاوا بەناچاری هاوپەیمانیەك لەگەڵ ئەم هێزە ئیسلامیە لە دایك بووەدا دروست بکەن وەك تەکتیکێکی کاتی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بەرەیەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا لەگەڵیدا دەجەنگن، هەروەك (ذي مخرم) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿ستصالحون الروم صلحا آمناً و تغزون أنتم وهم عدوا من ورائهم فتسلمون وتغنمون ثم تنزلون بمرجٍ ذي تلول فيقومُ فيرفعُ الصَّليب ويقولُ: غَلَبَ الصَّليب، فيقومُ اليهِ رجلٌ من المسلمين فَيَقتُلُهُ، فتغدير الروم وتكون الملاحم فَيَجتمعونَ لَكم في ثمانينَ غايةً مع كل غاية إثنا عشر ألفاً﴾

واتە: (لەگەڵ ڕۆمدا پەیمانێکی ئاشتی دەبەستن، ئێوە و ئەوان دەجەنگن لەگەڵ دوژمنێك کەلە پشت ئەوانەوەیە، پاشان سەردەکەون و دەسکەوتێکی باشتان دەبێت، پاشان لەمێرگێکدا دادەبەزن کە گرد و تەپۆڵکەی زۆرە، لەوێدا پیاوێك لە ڕۆمەکان هەڵدەستێت و خاچەکەی خۆیان بەرزدەکاتەوە و دەڵێت خاچەکەی ئێمە سەرکەوت، پیاوێکیش لە موسڵمانەکان هەڵدەستێت و دەیکوژێت، ئیتر ڕۆمەکان غەدردەکەن و پەیمانی ئاشتیەکە دەشکێنن و جەنگە گەورەکان دەست پێدەکات، پاشان ڕۆمەکان کۆدەبنەوە بۆتان بە هەشتا ئاڵاوە، هەر ئاڵایەك دوانزە هەزار کەسی لەگەڵدایە).

ئەم پەیمانی ئاشتیەی نێوان دەوڵەتانی ڕۆژئاوا و لەشکری ئیسلامیش وەك پێشتر ووتمان لە کاتێکدا دێت کە (محمدی مهدی) چەند شەڕێکی سەرکەوتووی تێدا ئەنجام دەدات و دەسەڵاتی

---

حديث صحيح رواه أحمد وابو داود وابن ماجه وابن حبان وصححه الألباني في صحيحه لأحاديث المشكاة برقم (٥٤٢٤).

بەسەر تەواوی ناوچەکەدا دەچەسپێنێت، هەروەك (نافعى کوڕی عتبە) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿تغزونَ الجزيرة العرب فيفتحها الله ثم فارس فيفتَحُها الله ثم تغزون الروم فيفتحها الله ثم تغزون الدجال فيفتحه الله﴾[1]، واتە: (شەڕی دورگەی عەرەب دەکەن خوا ئازادی دەکات لەسەر دەستاندا، شەڕی فارس دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات لە سەر دەستاندا، پاشان شەڕی دەجال دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات لە سەر دەستاندا).

کەواتە مەهدی پێش ئەوەی شەڕ لەگەڵ ڕۆم و دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا بکات شەڕ لەگەڵ تەواوی دورگەی عەرەب و وولاّتی فارسدا دەکات و لەو شەڕانەشدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت و دەسەلاّتی خۆی لە تەواوی ناوچەکەدا دەچەسپێنێت، بەلاّم پاش ئەوەی شەڕی ڕۆمەکان و دوژمنەکانیان کۆتایی پێدێت و سەردەکەون کە لەو شەڕەدا موسڵمانەکان و ڕۆمەکان هاوکاری یەکتر دەبن دژی ئەو دوژمنە، ئیتر ڕۆمەکان و دەوڵەتانی ڕۆژئاوا دەست بەتاڵ دەبن بۆ شەڕی دەوڵەتەکەی مەهدی، هەر بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا سەرلەنوێ خۆیان کۆدەکەنەوە و لە فرسەتێك دەگەڕێن کە بیکەن بە بیان و بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ئاشتیەکەو هێرش کردنە سەر لەشکری ئیسلامی لەناوچەکەدا، تا لە کۆتاییدا ڕووداوی کوشتنی ئەو پیاوە خاچ پەرستەی کە خاچەکەی بەرزدەکاتەوە لەلایەن کەسێکی موسڵمانەوە دەکەن بەبیانوو و ئاگربەست لەگەڵ موسڵمانەکاندا دەشکێنن و دەست دەکەن بە لەشکرکێشی و لە ئاکامدا ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیە ڕوودەدات کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا جەنگی وا ڕووی نەداوە و پێغەمبەریش(ﷺ) لە فەرموودەکانیدا بە (الملحمة الکبری) ناوی دەبات واتە (جەنگە گەورەکە).

## جەنگی (الملحه الكبرى):

پاش ئەوەی کە (محمدی مهدی) دڵنیا دەبێت کەڕۆەکان نیازی غەدریان هەیە و سەرجەمی دەوڵەتەکانی ڕۆژئاوا کۆبوونەتەوە و غەیری شەڕکردن هیچ ڕێگەچارەیەکی تر نەماوە، ئەمیش سەرجەم لەشکری ئیسلامی کۆدەکاتەوە و لە شاری مەدینەوە بەرەو سوریا بەڕێ دەکەوێت و لەوێ شاری (الغوطة)ی نزیك (دیمشق)ی پایتەخت دەکاتە خێوەتگای سوپاکەی هەروەك (ابو الدرداء) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿إن فُسطاط المسلمين يوم الملحمة بالغوطةِ الى جانب مدينةٍ يُقالُ لَها دِمَشقُ من خَير مَدائِنِ الشام﴾[2]، واتە: (بنکەو خێوەتگای

[1] رواه مسلم (٤/٢٢٢٥) حديث رقم (٢٩٠٠) و أحمد و ابن ماجه.

[2] رواه احمد وأبو داود والحاكم وصححه.

موسـڵمانان لـەرۆژی جەنگـە گەورەکـەدا لـە (غوطـة) دەبێـت لـە تەنیـشت شـارێکەوە کـەپێی دەوترێت(دیمشق) کە یەکێکە لە چاکترین شارەکانی وولاَتی شام).

وولاّتانی ڕۆژئاواش لە بەرامبەردا لەشکرێکی بێ شومار کۆدەکەنەوە کە پێکهاتووە لـە هەشـتا ئالاّو هەر ئالاّیەکیش دوانزە هەزار سەربازی لەگەڵدایە هەروەك پێشتر لە ڕیوایەتەکـەی (ذي مخـرم) ڕەزای خوای لێبێت باسمان کرد، ئەم لەشکرە گەورەیەش لە ناوچەی (أعماق) و (دابق)دا دادەبەزن کە دوو شوێنن لە سوریا لە نزیك شاری حەلەب، وە پاش ئەوەی کە هەردوو سوپا بەرامبەر یـەکتر دەوەستن گفتوگۆ (مفاوضات)ێك ڕوودەدات لە نێوان هەردوو لادا، ڕۆمەکان داوا لەموسڵمانەکان دەکەن ئەوکەسانەیان تەسلیم بکەن کە دەست درێژیان کردۆتـە سـەریان و موسـڵمانەکانیش ڕازی نابن و گفتوگۆکە شکست دەهێنێت و لە کۆتایدا شەڕ دەسـت پـێ دەکـات. (أبـو هریـرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى ينـزل الـروم بالأعمـاق أو بدابقٍ فَيَخرُجُ اليهم جَيشٌ من المدينةِ من خيارِ أهلِ الأرض يَومَئِذٍ فإذا تصافّوا قالَت الرّومُ خَلّـوا بيننـا وبين الذين سَبَوا منّا نُقاتِلهم فيقول المسلمون لا واللهِ لا نُخَلّي بينكم وبين اخواننا فيقـاتلونهم فينهـزم ثُلُـثٌ لايتـوب الله علـيهم أبَـداً ويُقتَـلُ ثُلُـثُهم أفـضَلُ الـشهداء عنـد الله ويفـتـح الثُلُـثُ لا يُفتَـون أبَداً،....﴾[1]، واتـە: (قیامـەت هەڵناسـێت هـەتا ڕۆم لـە (أعمـاق) یـان (دابـق) دانەبـەزن، پاشـان لەشکرێکیان بۆ دەردەچێت لە شاری مەدینەوە، لە باشترین و چاکترین خەڵکی زەوین لەو ڕۆژەدا، کاتێك هەردوولا بەرامبەر یەك ڕیزدەبن، ڕۆمەکان دەڵێن: دەسـت مەهێننـە ڕێمـان بـا ئەوکەسـانەی کەدەست درێژیان کردۆتـە سـەرمان و ئێـوە داڵـدەتان داون بیـانکوژین، موسـڵمانەکانیش دەڵـێن نەبەخوا هەرگیز ناهێڵین دەست درێژی بکەنە سەر ئەوبرایانەی ئێمە، پاشان شەڕیان لەگەڵ دەکـەن. سێ یەکی لەشکری موسڵمانەکان لەو ڕۆژەدا هەڵدێن، هەتا هەتایە خـوا لێـیان خۆشـنابێت و سـێ یەکی تریان دەکوژرێن باشترین شەهیدن لەلای خـوای گـەورە، وە سـێ یەکیـشیان خـوای گـەورە سـەریان دەخـات، هـەرگیز جـارێکی تـر توشـی فیتنـە نابنـەوە.....). کەواتـە وولاتـانی ڕۆژئـاوا وەکوسیاسەت و ڕەفتاری ئێستاشیان کە هەمووومان دەیبیـنین لـەو ڕۆژەشـدا ئـەو جەنگـە گەورەیـە بەبیانووی تەسلیمکردنی چەند کەسێکەوە هەڵدەگیرسێنن کە لەلای ئەوان بە ئیرهـابی و تیرۆرسـت ناسراون، بەلاّم ئەوڕۆژە ئەمڕۆنییە کە هەر موسڵمانێك ئەمریکا و ئەورروپا بەدڵیان نەبێت وولاّتەکەی خۆی دەیدات بەدەستەوە و تەسلیمیانی دەکات، بەڵکو ئەوڕۆژە لەشکری ئیسلامی بەسەرکردایەتی

---

[1] رواه مسلم في كتاب الفِتن، رقم الحديث (٢٨٩٧).

(محمدی مهدی) بەرگری لە تاك تاك موسڵمانان دەكات ئەگەر لەو پێناوەشدا جەنگێكی جیهانی هەڵبگیرسێنێت، سەبارەت بە چۆنیەتی شەڕەكەش (عبدالله ی كوڕی مسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿.... وتكون يومٌ عند ذاكم القتال رَدَّةٌ شَديدَةٌ فيشترط المسلمون شُرطَةً للموتِ لا تَرجِعُ الاّ غالبَةً فَيَقتَتِلونَ حَتّى يَحجُزَ بَينَهُم اللّيلُ فَيَفيءُ هؤُلاءِ وهؤلاءِ كلّ غير غالبٍ وتفنى الشُرطة ثم يشترِطَ المسلمون شُرطَةً للمَوتِ لا تَرجِعُ الاّ غالبَةً فَيَقتَتِلونَ حَتّى يَحجُزَ بَينَهُمُ اللّيلُ فَيَفيءُ هؤلاءِ وهؤلاءِ كُلٌّ غيرُ غالِبٍ وتَفنى الشوطَ ثُمَّ يَشتَرطُ المسلمونَ شُرطَةً للمَوتِ لاتَرجِعُ الاّ غالِبَةً فَيَقتَتِلونَ حَتّى يُمسُوا فَيَفيءُ هؤلاء وهؤلاءِ كُلٌّ غيرُ غالِبٍ وتفنى الشرطةُ فَاِذا كانَ يَومُ الرّابِعِ نَهَدَ اَلَيهم بَقيةُ أهلِ الإسلام فَيَجعَلِ الله الدَّبرَةَ عليهم فَيَقتُلونَ مَقتَلَةً اِمّا قالَ لا يُرى مِثلُها وامّا قالَ لَم يُرَ مِثلُها حتى إن الطائِرَ لَيَمُرُّ بجنباتهم فما يُخَلِّفُهُم حتى يَخِرَ مَيتاً فَيَعادُ بَنو الأب كانوا مائة فلا يجدونهُ بقِيَ منهم إلا الرجل الواحد فَبِأَيِّ غَنيمةٍ يُفرَحُ أو أَيُّ ميراث يُقاسَمُ...﴾[1]، واته: (.... لە كاتی ئەو شەڕەدا هەڵگەڕانەوەیەكی توند دەبێت و خەڵكێكی زۆر (مرتد) دەبنەوە، پاشان موسڵمانەكان كۆمەڵێكیان پەیمانی مردن دەدەن كەتاسەرنەكەون نەگەڕێنەوە، پاشان شەڕدەكەن هەتا شەو لێكیان جیادەكاتەوە، پاشان ئەمانیش و ئەوانیش دەكشێنەوە، هیچیان سەرنەكەوتوون و ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو هەموو لەناودەچن، پاشان موسڵمانەكان كۆمەڵێكیان پەیمانی مردن دەدەنەوە كە تا سەرنەكەون نەگەڕێنەوە، دیسان شەڕدەكەن تا شەو لێكیان جیادەكاتەوە، ئەمانیش و ئەوانیش دەكشێنەوە بەبێ ئەوەی هیچیان سەركەون، ئەوانەی بەڵێنی مردنیشیان دابوو هەموو لەناودەچن، پاشان موسڵمانەكان كۆمەڵێكیان بەڵێنی مردن دەدەنەوە كە تا سەرنەكەون نەگەڕێنەوە، پاشان دەست دەكەنەوە بەشەڕ هەتا ئێوارە دادێت ئەمانیش و ئەوانیش دەكشێنەوە بەبێ ئەوەی كەسیان سەركەون، وە ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو هەموو لەناودەچن، پاشان كەڕۆژی چوارەم هات، ئەوەی كە ماوە لە ئەهلی ئیسلام بۆیان ڕادەپەڕن و هەڵمەتیان بۆ دەبەن و خوای گەورەش شكستیان پێ دەهێنێت، بەجۆرێك كوشتارێكیان لێدەكەن -یان ووتی: هەرگیز نابینرێت- یان ووتی هەرگیز نەبینراوە بە جۆرێك كە باڵندە لەنزیكیانەوە تێدەپەڕێت بەجێیان ناهێڵێت بەمردووی دەكەوێتە خوارەوە، ئەنجا ئەوەی یەك باوك سەد كەس بوون، سەیردەكات كەسیان نەماوە تەنها یەك پیاو نەبێت، ئیتر چ دەست كەوتێك دڵ پێی خۆش بێت؟ یان چ میراتیەك دابەش بكرێت؟...).

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، رقم الحديث (٢٨٩٩).

بەڵێ بەڕاستی سەر لەنوێ سەرخستنەوەی ئیسلام و ڕووبەڕووبوونەوەی کوفری جیهانی باجی خۆی دەوێت، نە موسڵمانان دەتوانن بە ئاسانی شکۆمەندی و سەربەرزی ڕابردوویان بگێڕنەوە و نەسەرانی کوفریش بە ئاسانی دەست لە دەسەڵات و جەبەروتی ئەمڕۆیان هەڵدەگرن، بەڕاستی موسڵمانان دەبێ بزانن کە ئەو شەڕە یەکلاکەرەوەیان لەپێشە، دەبێ دڵنیابن کە جەنگی جیهانیی ئەمجارە لە نێوان کوفر و ئیسلامدایە، ئەگەر ئەم ڕاستیەش لە دڵی موسڵمانانی ئەمڕۆدا هێشتا نەگەشتبێتە پلەی (یقین)، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەڵێین کە ئەوە ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە لەلایەن داڕێژەران و نەخشە کێشەرانی سیاسەتی دەوڵەتە زلهێزەکانی کوفری جیهانیی بۆ نموونە (ولیام غایکار) کە لە کۆتایی ساڵەکانی پەنجاکاندا کتێبی (احجار علی رقعة الشطرنج)ی نوسیوە پاش ئەوەی کە بە بەڵگەوە دەیسەلمێنێت کە هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم بەدەستی سەرمایەدارانی جولەکەو پلان دانەرانی زایۆ نیزمی جیهانی هەڵگیرسا، دێتە سەر باسی جەنگی جیهانی سێیەم و دەڵێت (نصل الى الحرب العالمية الثالثة المقبلة و هذه رسم المخطط لها ان تنشب بنتيجة النزاع الذي سوف يثيره روؤس المؤامرة الصهيونية العالمية بين الصهيونية السياسية و العالم الأسلامي)[1]، واتە: (دێینە سەر سێیەمی جیهانیی داهاتوو ئەم جەنگەشیان وا نەخشەی بۆ کێشراوە کە لە ئاکامی ئەو ململانێیەدا ڕوو بدات کە سەرانی پیلان گێڕی زایۆنیزمی جیهانیی لەنێوان زایۆنیزمیەتی سیاسی و جیهانی ئیسلامی دا بەرپای دەکەن).

کەواتە سیاسەت مەدارێکی ڕۆژئاوایی وەك (ولیام غای کار) هەر لە ساڵانی پەنجاکانەوە دەرکی بەو نەخشەو پلانە کردووە کە بە جۆرێك داڕێژراوە جەنگی جیهانیی سێیەم لە نێوان جیهانی ئیسلامی و بەرەی ڕۆژئاوادا ڕوو بدات. وە لە درێژەی کتێبەکەیدا زیاتر تیشك دەخاتە سەرئەو نەخشەو پیلانەو دەڵێت: ئەو جەنگە وا نەخشەی بۆ کێشراوە کە هەردوو جیهانی ئیسلامیی و جیهانی مەسیحی تێوە بگلێنرێت و بە یەکدا بدرێن، بە جۆرێك کە هەردوو لایان تیابچن و یەکتری بڕوێننەوەو لە کۆتاییشدا دەوڵەتێکی جولەکەی جیهانیی دروست بکەن کەپایتەختەکەی (قدس) بێت و ئەو پادشا چاوەڕوان کراوەش حوکمی بکات کە باوەڕیان وایە لە(تەورات)دا مژدەی پێدراوە.

ئەو جەنگە جیهانی یە چاوەڕوان کراوەش ئەمڕۆ تەواوی جولەکەو گاورەکان وەك بیرو باوەڕێکی ئایینی قەناعەتیان پێیەتی‌و لە کتێبەکانی خۆیاندا بە شەڕی (هرمجدون) ناوی دەبەن، پێشیان

---

[1] احجار على رقعة الشطرنج وليام غاي كار ص٢٠

وایە کە گۆڕەپانی شەڕەکەش لە (فلسطین و سوریاو لوبنان)دا دەبێت. لەم چەند ساڵەی دوایشدا دەیان کتێبیان لەو بارەیەوە نووسیوە.

بۆ نموونە ژنە نووسەری ئەمریکی (جریس هالسل) لە کتێبی (النبوۃ والسیاسة)دا دەڵێت: (اننا نؤمن کمسیحیین ان تأریخ الإنسانیة سوف ینتهي بمعرکة تدعی (هرمجدون)، و ان هذه المعرکة سوف تتوج بعودة المسیح الذي سیحکم بعودته علی جمیع الأحیاء و الأموات علی حدٍّ سواء)[1]، واتە: (ئێمە وەکو دیانەکان باوەڕمان وایە کە مێژووی مرۆڤایەتی بە جەنگێك کۆتایی دێت کە پێی دەوترێت (هرمجدون)، ئەم شەڕەش بە گەڕانەوەی (مسیح)ی چاوەڕوانکراو کۆتایی دێت، کەلەگەڕانەوەیەکدا حوکمی هەموو زیندوو و مردووەکان وەك یەك دەکات).

دیانەکان ئەو بیرو باوەڕەشیان لەو (انجیل)ەوە وەرگرتووە کە ئەمڕۆ لەبەر دەستیان دایە هەروەك لە (سفر الرؤیا/ ١٦-١٦)دا هاتووە دەڵێت: (وجمعت الأرواح الشیطانیة جیوش العالم کلها في مکان یسمی (هرمجدون))[2]، واتە: (ڕۆحە شەیتانیەکان لەشکرەکانی جیهانیان هەر هەموو لەشوێنێکدا کۆکردەوە کە پێی دەوترێت (هرمجدون). ئەم قەناعەتەش نەك تەنها لە بیرو باوەڕی خەڵکی سادەو پیاوە ئاینیەکانی گاورو جولەکەکاندا بوونی هەیە، بەڵکو لە مێشکی دەسەڵاتدارو سیاسەتمەدارەکانیشدا هەمان قەناعەت هەیە، ئەوەتا خاوەنی (البعد الدیني في السیاسة الأمریکیة) دەڵێت: (ان سبعة من رؤساء أمریکا یؤمنون بمعرکة (هرمجدون))[3]، واتە: (حەوت لە سەرکردەکانی ئەمریکا باوەڕیان بە شەڕی (هرمجدون) هەیە. هەر لەوبارەیەشەوە(رونالد ریغان)ی سەرۆکی پێشوی ئەمریکا دەڵێت: (ان هذا الجیل بالتدید هو الجیل الذي سیري (هرمجدون))[4]، واتە: (خەڵکی ئەم جیلەی ئێستا ئەو خەڵکە کە شەڕی (هرمجدون) دەبینن).

بەڵێ ئەم ڕاستیانە هەمووی بەڵگەن لەسەر نزیك بوونەوە و هاتنە دی فەرموودەو بەڵێنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەڕوودانی ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیە کە هەرگیز مرۆڤایەتی کارەساتی وای بەخۆوە نەبینیوە، جەنگێك دەبێت کە هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت تەنانەت باڵندەش بەئاسمانی شەڕەکەوە قوتار نابێت و دەکەوێتە خوارەوە کەئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو هەموو چەکەکیمیاوی و ئەتۆمیەی کەلەو شەڕەدا بەکار دەهێنرێت. ئەم هەموو فەرموودانەش نەك وەك

[1] النبوۃ والسیاسة جریس هالسل ص١٩

[2] الإنجیل ص٣٨٨.

[3] الوعد الحق والوعد المفتری ص٣١.

[4] النبؤ و السیاسة ص٦٦

هەندێك كەسی ناحاڵی لێیان تێدەگات کە گوایە خوڵکێی سارد دەکاتەوە و موسڵمانان نائومێد دەکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئومێدی زیاتر بە موسڵمانانی چەوساوە و ژێر دەستەی ئەم سەردەمە دەدات و مژدەی ئاسۆیەکی گەش بە گوێیاندا دەچرپێنێت کە موسڵمانان تیایدا یەك دڵ و یەك دەست و یەك ڕیز کۆدەبنەوەو ڕووبەڕووی کوفری جیهانیی دەبنەوەو بۆ جارێکی تریش حوکم شەریعەتی خوا لەسەر زەوی دەچەسپێننەوە، ئەو کەسانەی وادەزانن کەهەر کات مەهدی هات لەسفرەوە دەست پێدەکات و لەسفرەوە خەڵکی بەرەو ئیسلام بانگهێشت دەکات، ئەوانە بەهەڵەدا چوون، بەڵکو لەپێش هاتنی مەهدیدا ڕابونێکی ئیسلامی بەهێز سەرانسەری جیهان دەگرێتەوەو قۆناغ بە قۆناغ بەرەو پێشەوە دەڕوات و (محمدی مهدی)یش لە کاتی هاتنیدا تەنها ئەرکی کۆکردنەوەی جەمسەرەکانی ئەو ڕابوونەو ڕابەرایەتی کردنیان لە ئەستۆ دەگرێت. لەشکرە ئیسلامیە ئاڵا ڕەشەکەی ڕۆژهەڵاتیش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕاستیە، کەواتە پێش هاتنی مەهدی هەوڵ و کۆششێکی زۆرو زەمینە سازییەکی باش دەکرێت بۆ گەیشتن بەو ڕۆژەی کە موسڵمانان بتوانن تیایدا خەلافەت بگێڕنەوە، ئەو ئەو زەمینە سازیەش ئەمڕۆ ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکەو، با چی دی کەمان پشتێنی لێ نەکەینەوەو بە بیانوو و بەهانەی بێ بەڵگە خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین.

## دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕۆڵی جوولەکە لەو جەنگەدا:

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت (ئەی باشە ئەو قەوارەیەی کە ئەمڕۆ بە دەوڵەتی ئیسرائیل ناو دەبرێت لە پاش ئەو جەنگە گەورەیەی لە نێوان لەشکری ئیسلامی و هاوپەیمانێتی ئەوروپادا ڕوودەدات چی بەسەر دێت بەتایبەت کە لەو جەنگەدا هێزەکانی ئەوروپا دەشکێن و ئیسرائیلیش بێ پشت و پەنا دەمێنێتەوە؟).

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەڵێین خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إسرائيل في الكتاب لَتُفسِدُنَّ في الأرض مَرَّتين ولَتَعْلُنَّ عُلُوا كبيرا (٤) فإذا جاء وَعدُ أُولاهما بَعَثنا علَيكم عِباداً لَنا أُولِي بأسٍ شديد فجالسوا خِلال الديار وكان وعدا مَفعولاً(٥) ثم رددنا لكم الكرة عليهم وأمددناكم بأموال وبنين وجعلناكم أكثر نَفيرا(٦) إن أحسنتم أحسنتم لأنفسكم وإن أسأتم فلها فإذا جاء وعدُ الآخِرة لِيَسوءوا وُجُهكم ولِيَدخُلُوا المسجد كما دَخَلوه أول مرة وَلِيتبروا ما عَلَوا تَتْبيراً﴾[1]، واتە: (نوسیومانە بۆ نەوەی اسرائیل لە کتێبەکەیاندا واتە (تەورات) کە ئێوە دوو جار لەسەر زەوی فەسادو خراپەکاریەکی زۆر دەنێنەوەو سەرەڕۆیی و لوت بەرزیەکی گەورە دەکەن،

---

[1] الأسراء (٤-٧).

لەجاری یەکەمی ئەو بەڵێنەدا، کۆمەڵێك بەندەی خۆمانمان ناردنەسەر کە خاوەن زەبرێکی توند بوون، ئەوانیش ماڵ و ئاوایی تانیان خاپور کرد و بەڵێنی خوا هاتەجێ. لە پاش ئەوە بۆ جارێکی تر بوارمان دانێ دەسەڵات بگرنەوە دەست و ماڵ و نەوەی زۆرمان پێ بەخشین لە جاران زیاتر، ئەگەر چاکتان کرد ئەوا بۆ خۆتان چاکە ئەگەر خراپیشتان کرد ئەوا هەر لەسەر خۆتان دەکەوێت، هەرکاتێکیش کەوادەی بەڵێنەکەی دووەمان هات وەك جاری یەکەم کۆمەڵێك بەندەی خۆمانتان بۆ دەنێرین کە ڕووتان ڕەش و ڕیسوابکەن و بەهەمان شێوە جاری یەکەم بچنەوە ناو مزگەوتەکەی (قدس)و هەموو لوت بەرزی و خراپەکارییەکی ئێوەی تێدا ڕیشەکێش بکەن).

بەڵێ لە قەدەری جولەکەدا خوای گەورە نوسیویەتی کە دووجار بواریان بۆ دەرەخسێت لەخاکی (فلسطين)دا دەسەڵات بگرنە دەست و مزگەوتی (بيت المقدس)یش بکەوێتە دەستیان، جاری یەکەم لەدوای وەفاتی سلیمان پێغەمبەر بوو سەلامی خوای لێبێت کە هەرچی خوا پێی ناخۆشە لەماوەی دەسەڵاتیاندا کردیان بەجۆرێك کە گاڵتەیان بەشەریعەتی خوا دەکرد و دەیان پێغەمبەری نێردراوی خاوایان سەربڕی، تا خوای گەورە ڕق و قینی خۆی ڕشت بەسەریانداو لەشکری (نبوخذ نصر)ی لەسەدەی (٥)ی پێش زایندا ناردە سەریان و تەخت و تاراجی لە بن دەرهێنان و زیاتر لە (٥٠٠)پێنج سەد هەزار کەسی لێ کوشتن، ئەوەشی کەماوە بەکۆت و زنجیرکراوی ڕەوانەی شاری (بابل) کرد، بەجۆرێك بۆ ماوەی دوو سەدە خۆیان و نەوەکانیان لەو شاردا دەست بەسەر بوون، وە لەو کاتەوە هەتا ئەم سەدەیە جولەکە پەرتەوازەو ئاوارەی وڵاتان بوون، تا لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا بەشی دووەمی ئەم قەدەرە خواییە هاتەدی و بۆ جاری دووەم لەخاکی (فلسطين) و (بيت المقدس)دا دەسەلاتیان گرتەوە دەست، بەڵام هەر تەمێ نەبوون، ئەم جارەش زۆر زیاتر لە جاری یەکەم دەستیان داوەتە فەساد و خراپەکاری، بەجۆرێك کە فەسادی جولەکە لە هەموو کونج و قوژبنێکی ئەم دنیایەدا ڕەنگ دانەوەی هەیە و ڕق و کینەی پەرتەوازەیی و ئاوارەیی و سەرگەردانی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بەرامبەر هەموو خەڵکی جیهان لەخۆگرتووە.

ئەم جارەیان جولەکە لەسەر پلانی ووردو نهێنی و نەخشەی دارێژراو کاردەکەن، مەبەست و ئامانجیشیان هەروەك خۆیان دەڵێن گێڕانەوەی حوکمی (داود)و بنیات نانەوەی هەیکەلەکەی سولەیمانە لە شوێنی ئێستای (بيت المقدس)دا پاش ڕووخاندنی مزگەوتەکە، پاشانیش لەوێوە وەدەوڵەتێکی جیهانیی دابمەزرێنن کە حوکمی هەموو جیهان بکات و سەرجەم خەڵکی جیهان کەجولەکە نین ببنە نۆکەر و خزمەتکاری جولەکە و تۆڵەی دوو هەزار ساڵی ڕابردوویان لێ بکەنەوە.

لەو پێناوەشدا لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا گەورە سەرمایەدارانی جوولەکەو پیاوانی بەرزی ئایینیان لە سەرانسەری جیهاندا چەند کۆنگرەیەکیان ئەنجامدا بەمەبەستی نەخشەدانان بۆ گەیشتن بەم ئاواتە، کە دواترینیان لەساڵی ١٨٩٧ لە شاری بازل لە سویسرا ئەنجام درا لە ژێر چاودێری (تیودور هرتزل) کە ناسراوە بەباوکی جوولەکە، پوختەی ئەو نەخشەو پلانەش کە لەلایەن سەرانی جوولەکەی جیهانیەوە لەم کۆنگرانەدا دارێژرا ناوبرا(بروتوکولات حکماء صهیون)و گرنگترینی خاڵەکانیش ئەمانەن:

١- دەست بەسەرداگرتنی تەواوی سەرچاوەکانی پارەو زێڕ و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لەجیهاندا، کە بە هۆی پارەوە دەتوانن هەر فیتنەو ئاشوبێك لە هەر شوێن و کاتێکدا خۆیان بیانەوێت دروستی بکەن و ئەو لایەنەشی تێدا سەر بخەن کە خۆیان مەبەستیانە. وە لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیشەوە دەتوانن قەناعەتی خەڵکی بگۆڕن و ڕای گشتی جەماوەریش بەئارەزووی خۆیان هەڵسوڕێنن.

٢- [1] داماڵینی خەڵکی لە ئاین (چ ئیسلام و چ مەسیحیەت) و ڕووخاندنی حکومەتە دینیەکان، چونکە ئاین گەورەترین بەربەستە لەبەر بە ئەنجام گەیشتنی پیلانەکانی ئەواندا، ئەویش لەڕێگەی:

أ- دارشتنی چەند بیرۆکەیەکی نوێ لە بوارە جیا جیاکانی ژیاندا لەلایەن چەند زانایەکی خۆیانەوە کە ئەو بیرۆکانە دژ بە دین بن و ئاین لە ژیان دابڕن، وە ئەمانیش لە ڕێگای هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە خەڵکیان قەناعەت پێ بەکەن[2] بۆ نموونە:

بیرۆکەی شوعیەت لەلایەن (کارل مارکس و انجلس) کە هەردووکیان جوولەکەن.

بیرۆکەی گێڕانەوەی بنچینەی مرۆڤ بۆ مەیمون لەلایەن (چارلس داروین) کە ئەویش جوولەکەیە.

بیرۆکەی ڕەهای جنسی لەلایەن (سیجموند فرۆید) کە ئەویش جوولەکەیە.

بیرۆکەی (عبثیة و وجودیة) لەلایەن (جان پۆل سارتر) کە ئەویش جوولەکەیە.

بیرۆکەی دروست بوونی کۆمەڵگاکان لەلایەن (دوکاریم) کە ئەویش جوولەکەیە.

بیرۆکەی الحادیەت لە فەلسەفەدا لەلایەن (فردریك نیتشە) کە ئەویش جوولەکەیە.

وە دەیان بیرۆکەی تر کە بوونە مایەی وەلانانی ئاین لە فکر و ڕەفتار و ژیانی خەڵکدا.

---

[1] بروتوکولات حکماء صهیون محمد خلیفة التونسي بروتوکول١٢

[2] بروتوکولات حکماء صهیون محمد خلفیة التونسي.

ب- هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم کە بەشێوەیەك نەخشەی بۆ دارێـژرابوو کـە ئاکامەکـەی بەرووخاندنی هەردوو دەوڵەتە ئاینیەکەی جیهانی ئەو کاتە کۆتایی پـێ بێـت(واتـە دەوڵـەتی خەلافەتی عوسمانی ڕەمزی ئیسلام و دەوڵەتی قەیسەری ڕووسیا ڕەمزی مەسیحیەت) تا کـەس نەمێنێت بەرگری لە ئاین بکات و ببێتە بەربەرست لە بەردەم بـە ئـەنجام گەیـشتنی پلانـەکانی جوولەکەدا[1]

وە لە شوێنی ئەواندا دوو دەوڵەتی تریان دروست کرد لەسەر بناغەی بێباوەڕی و دوژمنایـەتی کردنی ئاشکرای ئاین، یەکەمیان: دیکتاتۆریەتی شویعەت بوو لە ڕووسیادا لەسەر دەسـتی (لیـنین و تروتسکی) کە هەردووکیان جوولەکە بوون، ئەوی تریشیان دیکتاتۆریەتی عملانی تورکیا بوو لەسەر دەستی (کمال اتاتورك)ی بەکرێ گیراوی جوولەکە. بەم دوو ڕێگەیە توانیان کە الحاد و عملانیەت و بێدینی بکەنە دروشم و کاڵای جیهان لە سەدەی بیستەمدا.

٣- هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم کە بەشێوەیەك نەخشەی بۆ دارێژرابوو کە ئاکامەکەی بـە دروست کردنی دەوڵـەتێکی جوولەکە لە (فلسطین)دا کۆتایی پێبێت کە هەروەك لـە سـاڵی ١٩٤٨دا ئەو دەوڵەتە ڕاگەیەندرا[2]

ئەمەو لەڕێگەی ئەم دوو جەنگەوە سەرمایەدارانی دوولەکە توانیان بەشی زۆری سەرچـاوەکانی پارەو ئابووری جیهان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان.

٤- کارکردن بۆ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی سێیەم کە وەك لە پێـشتر لـە (الملحمـة الکـبری)دا باسمان کرد بەشێوەیەك نەخشەی بۆ دارێژراوە کە هەردوو جیهانی ئیسلامیی و مەسیحیی تێـدا بدرێت بە یەکدا و هەردوو لایـان بەیـەکتر لەناوبـەرن و مرۆڤایـەتی دووچـاری نەهامـەتی و ڤەیرانێکی وەها بکەن کە دەسلاّتی هیچ شتێکی نەمێنێت و ڕازی بێ بە هەر کەس کە بتوانێت کۆتایی ئەو جەنگ و ماڵ کاولـیە بهێنێت ئەگەر ئەو کەسە خوودی شەیتان خۆشی بێت[3]

٥- پاش کۆتایی ئەو جەنگە دێنە سەر جێبەجێ کردنی خاڵی کۆتایی نەخشەو پلانەکەیان کەئەویش هاتنی ئـەو ڕزگارکەرەیـە کـە پێویـست وایـە لەسـەر دەسـتیدا کۆتـایی بەهـەموو جـەنگ و ناکۆکیـەکانی جیهـان بهێنرێـت و دەوڵـەتێکی جیهـانی دابمـەزرێنێت لەسـەر شـێوازی نەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمڕۆ کەبتوانێت حوکمی هەموو جیهان بکات، ئەو ڕزگارکەرەش وەك

---

[1] احجار علی رقعة الشطرنج ولیام غاي کار ل٢٠.

[2] احجار علی رقعة الشطرنج ولیم غاي کار.

[3] یوم الدین هـ. ستیفس ل٥٥.

له پرۆتۆکۆلەکەیاندا باسی دەکەن[1]، دەبێ پاشای هەموو جیهان بێت و هەموو جیهان بە خوای بزانێت و بۆ ئەم مەبەستەش گەورەترین درۆ و بوختان لە مێژوودا هەڵدەبەستن کەگوایە ئەم ڕزگارکەرە (حەزرەتی مەسیح) خۆیەتی و جارێکی تر دابەزیوەتە سەر زەوی بۆئەوەی خوایەتی لەسەر زەوی دا بکات و بەندەکان و شوێن کەوتووەکانی و جیهان بەگشتی ڕزگار بکات لەو تەنگ و چەڵەمەیەی کە تێی کەوتوون و خۆشی و کامەرانیی بگێڕێتەوە بۆ سەر زەوی، ئەو ڕزگارکەرەش بۆ ئەوەی کە خەڵکی بە تەواوی قەناعەتی پێبکەن کە (مەسیحی ڕزگارکەر) خۆیەتی و خوای ڕاستیانە دەبێت توانایەکی بێ سنووری هەبێت و وەك (مەسیحی) یەکەم جار سەلامی خوای لێبێت بتوانێت چەند کارێکی وەك (معجزة) ئەنجام بدات کە لە توانای خەڵکی ئاسایی دا نەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەرچی زانست و زانیاری پێشکەوتوو هەیە تەنانەت سیحریش دەخەنە خزمەتیەوە تا بتوانێت چاوبەست لە خەڵك بکات و قەناعەتیان پێ بێنێت. بەڵێ ئەو ڕزگارکەرەی کە جوولەکەنەخشەی بۆ هاتنی کێشاوە ئەو مەسیحەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەڵێت (مەسیحی دەجال).

بەڵێ ئەوەی کە باسمان کرد نە خەونەو نە خەیاڵ و نە لەخۆشمانەوە هەڵمان بەستووە، بەڵکونەخشەو پلانێکی شەیتانییە کە سەرانی جوولەکە دایان ڕشتووە و بە درێژایی سەدەی ڕابردوو خاڵ بە خاڵ و قۆناغ بە قۆناغ جێبەجێیان کردووە تا گەیشتۆتە قۆناغەکانی کۆتایی، ڕووداوەکانی ئەم سەدەی ڕابردووەش باشترین بەڵگەن لەسەر بوونی ئەو نەخشەو پلانەی کە لە (پرۆتۆکۆلات)دا بەرنامە ڕێژی بۆکراوە و هەرکەسێکیش مەبەستێتی زانیاری زاتر لەو بارەوە بزانێت با بگەڕێتەوە بۆئەو دەیان و سەدان کتێبانەی لەو بارەیەوە نووسراون لەلایەن کەسانی ڕۆشن فکر و ڕوناك بیری جیهانیەوە کە هەر لە قۆناغەکانی یەکەمەوە دەرکیان بەم مەرامە گڵاوەی سەرانی جوولەکەی جیهانی کردووە و هەوڵیان داوە خەڵکی لێ ئاگادار بکەنەوە.

لەو کتێبانەش:

١- الخطر المحيط بالإسلام ....................الجنرال التركي جواد رفعت اتيلخان.

٢- الخطر اليهودي(بروتوكولات حكماء صهيون) ...........محمد خليفة التونسي.

٣- التلمود تأريخه وتعاليمه ..............................ظفر الإسلام خان.

٤- أحجار على رقعة الشطرنج ...........................وليام غاي كار.

[1] ات حكماء صهيون محمد خليفة. بروتوكول ١٨-٢٤

٥- اليهودي العالمي ..........................هنري فورد.

٦- من يجرؤ على الكلام ..........................بول فيندلي.

٧- حكومة العالم الخفية ..........................شيريب سبيرليرو فينتش.

٨- المفسدون في الأرض ..........................س-ناجي.

٩- حقيقة الماسونية ..........................محمد علي الزعبي.

١٠- مذكرات السلطان عبدالحميد ..........................محمد حرب عبدالحميد.

١١- اليهود والسياسة الأمريكية ..........................؟؟؟..........ستيفن د.إيزاكس.

بەلاّم بابێینەوە سەر وەلاّمی پرسیارەکەی یەکەم جار و بزانین ئەو دەولّەتەی کەئەمڕۆ پێی دەوترێت ئیسرائیل چی بەسەر دێت؟

لە وەلاّمدا دەلّێین: هەروەك خوای گەورە لە ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی (الإسراء)دا بەلّێنیدابوو ئەوا بۆ جاری دووەم جولەکە لەخاکی (فلسطين)دا دەسەلاّتیان گرتۆتەوە دەست و دەست درێژی دەکەنە سەر مزگەوتی (بيت المقدس)و هەولّی ڕووخانی دەدەن و هەموو جیهانیشیان غەرقی فەساد و خراپەکاری کردووە، بەلاّم هەر لەو ئایەتەشدا بەلّێنی داوە کە ئەم جارەش بەدەردی جاری پێشوویان بەرێت بەلّکو خراپتریش، وە پێغەمبەریش(ﷺ) هەمان مژدەی داوە، ئەوەتا (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿لا تقُومُ الساعة حتى يُقاتِل المُسلمونَ الهُود فَيَقْتُلُهُمْ المُسلمون حتى يَختَبِيء اليَهوديُ من وَراء الحَجَر والشَّجَر فَيَقولُ الحجر والشَّجر يا مُسلم يا عبدالله هذا يَهوديٌّ خَلْفي فتعال فاقْتُلْهُ إلا الغرقد فإنه من شجر اليَهود﴾[1]، واتە: (قیامەت هەلّناسێت هەتا موسلّمانان شەڕ لەگەلّ جوولەکەدا دەکەن، موسلّمانەکان زالّدەبن بەسەریاندا و دەیان کوژن، هەتا وای لێ دێت جوولەکە لە بن بەرد و داردا خۆی دەشارێتەوە، خوای گەورە بەردەکە یان دارەکە قسەو دەلّێت ئەی موسلّمان ئەی بەندەی خوا ئەمە جوولەکەیە لە پشت منەوە وەرە بیکوژە، تەنها داری توترك نەبێت قسەناکات چونکەلەداری جوولەکەیە).

بەلاّم هاتنەدی ئەم مژدەیەی پێغەمبەر(ﷺ) لەدوای کوشتنی دەجال لەسەر دەستی (عیسى)دا صەلات و سەلامی خوای لەسەربێت وەك دواتر باسی دەکەین نەك لەدوای جەنگە جیهانیە گەورەکە، وەلەدوای ڕوودانی جەنگەکە هەتا هاتنی دەجال لە فەرموودەکاندا هیچ باسی جوولەکە نەکراوە، بۆیە پێمان وایە کەسەرانی جوولەکە کە داڕێژەری پیلانی ئەم جەنگەن هەولّ بدەن بەشێوەیەك لە

[1] صحيح مسلم (٢٢٣٩/٤) رقم (٢٩٢٣).

شێوەکان جوولەکەکانی ئیسرائیل لە ئاگری ئەو جەنگە دوور بگرن تا ئەو کاتەی هەموو لەدەوری دەجال کۆدەبنەوە، وە ئەگەر خەڵکانێکیان لەو جەنگەدا تیابچێت یاخود ئیسرائیل بەر گورزی موسڵمانان بکەوێت ئەوا دڵنیابن وەك جەنگی جیهانی دووەم لەرێگای هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە مەسەلەکە هەزار ئەوەندەی قەبارەی خۆی گەورە دەکەن تابتوانن لەو رێگەیەوە زیاتر عەتف و ولاتانی ئەوروپاو جیهان بەرەو خۆیان ڕاکێشن و خۆیان بە غەدرلێکراو و بەستەزمان و تیاچووی ئەو نێوەندە لەقەڵەم بدەن. هەروەها پێشمان وایە کەلەدوای سەرکەوتنی موسڵمانان لەوجەنگەدا ئیسرائیل وەك دەوڵەت نامێنێت، چونکە مەعقول نیە لەشکری ئیسلامی بەرەو (اسطنبول)بکەوێتە ڕێ بۆ ڕزگارکردنی، بەڵام نەدات بەبوونی قەوارەی ئیسرائیل لە بن هەنگڵیدا، بەتایبەتی کە گۆڕەپانی شەڕەکەش سوریا و فەلەستین و لوبنانە، بەڵام ئایا بۆچی کوشتاری گەورەی موسڵمانان بۆ جوولەکە دوا دەکەوێت هەتا دوای کوشتنی دەجال؟ ئەمەیان لە ئاستیدا دەوەستین و هیچ نالێین چونکە لە فەرموودە پیرۆزەکاندا هیچ ئاماژەیەکی بۆ نەکراوە.

## ئازادکردنی (قسطنطينية ):

مەبەست لە شاری (قسطنطنية) شاری (اسطنبول)ـە کە بۆماوەی دوو هەزار ساڵ پایتەختی دەسەڵاتی ڕۆم و مەسیحییەکان بوو کە یەکەم جار لەسەر دەستی سەرکردەی ئیسلامی لاودا ئازادکرا بەناوی (محمد الفاتح) لە ساڵی ٨٥٧ی کۆچیدا و دوای ئەوە ئەو شارە بۆ ماوەی زیاتر لەچوار سەدە پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی بوو کە عوسمانیەکان دەیان برد بوڕێوە، تا دواتر لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم خەلافەتی ئیسلامی ڕووخا (سلطان عبدالحميد)ی دووەم کە ئاخیر خەلیفەی دەوڵەتی عوسمانی بوو وەلانراو جڵەوی دەسەڵات کەوتە دەستی (كمال اتاتورك) کە پیاوێکی عەلمانی دژ بە ئیسلام بوو، لە ماوەی دەسەڵاتیدا هەوڵی دا بە هەموو شێوەیەك ئیسلام لە تورکیادا ڕیشە کێش بکات و ناسنامەی ئیسلامی ئەو وولاتە بگۆڕێت، بۆ ئەو مەبەستەش ڕژێمێکی عەلمانی داپڵۆسێنەری تێدا دامەزراند و پایتەختەکەشی لە (اسطنبول)ـەوە گواستەوە بۆ (أنقرة)، وە لەورۆژەشەوە هەتا ئێستا (استنبول) لە ژێر دەسەڵاتی عەلمانیەت و کوفر دایە، وە هەر واش دەمێنێتەوە هەتا لە سەردەستی سوپاکەی (محمدی مهدی)دا ئازاد دەکرێت. ئازادکرنی ئەو شارەش لە چاش ئەوە دادێت کە موسڵمانەکان لە جەنگە گەورەکەدا سەردەکەون و هێز و دەسەڵاتی ڕۆم و دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان لەبن هەڵدەکۆڵن و ئیتر هیچ ڕێگرو بەربەستێك نامێنێت لەبەردەمیاندا، وە پێ دەچێت کە پاشماوەی لەشکرە شکاوەکەی ڕۆمەکان بەرەو (اسطنبول) پاشەکشێ بکەن و هەڵبێن، وە بە دڵنیایشەوە دەتوانین بڵێین کە لەشکری عەلمانی تورکیاش لە جەنگە گەورەکەدا

هاوپەیمانی ڕۆمەکان بووە دژی موسڵمانەکان، هەر بۆیە لەگەڵ سەرکەوتنی موسڵمانەکان لەجەنگە گەورەکەدا بەبێ وەستان لەشکری ئیسلامی ڕوودەکاتە (اسطنبول) هەروەك لەفەرموودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە کە (أبو هريرە) دەیگێڕێتەوە لەدوای سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگە گەورەکەدا دەفەرموێت: ﴿فَيَفتَتِحون قُسطَنطينيةَ، فبينما هـم يَقتَسِمونَ الغنـئم قـد عَلَقـوا سُيُوفَهُم بالزيتون، إذ صاح فيهم الشيطان: إن المَسيح قد خَلَفَكـم في أهليكم فَيَخرُجـون وذلـك باطـل، فـإذا جاءوا الشام خَرَجَ....﴾[1]، واتە: (پاش ئەوەی شاری قسطنطينية ئازاد دەکەن، وە لە کاتێکدا کە سەرگەرمی دابەش کردنی دەسکەوتی شەڕەکەن و چەك و شمشێرەکانیان بە دارزەیتونەکاندا هەڵواسیوە، لەو کاتەدا شەیتان لە ناویان هاوار دەکات و دەڵێت: مەسیحی دەجال لە دواتانەوە پەلاماری ماڵ و منداڵی داون، ئەوانیش بە پەلە دەگەڕێنەوەو هەواڵەکەش درۆیە، پاشان کە دەگەنە شام ئینجا (دجال) دەردەچێت........).

ئەمەو سەبارەت بە چۆنیەتی ئازادکردنی شارەکەش هەر (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿سمعتم بمدينة جانب منها في البر وجانب منها في البحر؟ قالوا: نعم يا رسول الله، قال: لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون ألفا من بني إسحق، فإذا جاءوها نزلوا، فَلَم يقاتلوا بسلاحٍ، ولم يرموا بسهم، قالوا لا إله إلا الله والله أكبر، فيسقطُ أحد جانبيها، قال: ثور لا أعلمه إلا قال الذي في البحر، ثم يقولوا لا إله إلا الله والله أكبر، فيسقط جانبها الآخر، ثم يقولوا الثالثة لا إله إلا الله والله أكبر، فيخرجُ لهم، فيدخلوها، فَيَغنَموا، فَبينما هم يَقتَسمون المغانم إذ جاءهم الصَّريخ فقال: إن الدَّجَّال قد خرج،، فيتركون كل شيء ويرجعون﴾[1]، واتە: (شارێکتان بیستووە بەشێکی لە ووشکایدایەو بەشێکی لە ئاودایە؟ ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: قیامەت هەڵناسێت هەتا هەفتا هەزار لە نەوەکانی اسحاق هێرشی بۆ دەکەن، کاتێك کە دەیگەنێ، دادەبەزن، نەبەچەك شەڕیان لەگەڵ دەکەن و نە تیریشیان تێدەگرن، هەر ئەوەندە دەڵێن (لا الـه الا الله و الله أكبر) لایەکی دەڕووخێت، (ثور) کە یەکێکە لەوانەی فەرموودەکە دەگێڕنەوە دەڵێت: وابزانم ووتی ئەو بەشەی کە لە دەریادایە، پاشان بۆ دووەم جار دەڵێن لا اله الا الله و الله اكبر، لایەکەی تریشی دەڕووخێت، پاشان بۆ جاری سێیەم دەڵێن لا اله الا الله والله اكبر، ئەمجارە بۆیان بۆیان دەکرێتەوەو دەچنە ناوی و دەسکەوتێکی زۆریان دەبێت، وە لە کاتێکدا کە سەرگەرمی دەبەش کردنی

---

[1] رواه مسلم (٢٢٢١/٤) رقم (٢٨٩٧).

[1] رواه مسلم (٢٢٣٨/٤) رقم (٢٩٢٠).

دەستکەوتەکانن، دەنگێك لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە کە (دەجال) هەستاوە، ئیترهەموو شتێك بە جێدەهێڵن و دەگەڕێنەوە).

لەم فەرموودە پیرۆزەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو کەسانەی (اسطنبول) ئازاد دەکەن کۆمەڵە موسڵمانێکن، لە نەوەی (اسحاق)ن، نەوەی (اسحاق)یش وەك زاناکان دەڵێن مەبەست پێی ڕۆمەکان خۆیانن، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆمەڵێکی زۆریش لە ڕۆمەکان لەوسەردەمەدا موسوڵمان دەبن و لە ڕیزی لەشکری ئیسلامی دا دەجەنگن و (اسطنبول)یش لەسەر دەستی ئەواندا ئازاد دەکرێت. هەروەك ئیمامی (النووي) لە شەرحی (مسلم)دا باسی دەکات. وە ڕەئیشی وایە کە ئەو کۆمەڵەی یەکەم جار ڕۆمەکان لە پێش دەستپێکردنی جەنگە گەورەکەدا دوایان دەکرد کە موسڵمانەکان تەسلیمیان بکەن هەر لەو ڕۆمانە بن کە پێشتر موسڵمان بوون و چوونەتە ڕیزی لەشکری ئیسلامی یەوە. وەك لە فەرموودەکەشەوە بۆماندەردەکەوێت کە ڕۆمەکان لە دوای جەنگە گەورەکە بە ڕادەیەك ورەیان دەڕوخێ و هێزی ئەژنۆیان دەشکێت کە توانای هیچ بەرەنگاریەکیان نامێنێت لەبەردەم لەشکری ئیسلامیدا هەر بۆیە لەگەڵ بیستنی دەنگی لا الە الا الله و الله اکبر دەروازەی شاری ئەستەمبوڵ لەبەردەم هێزە دەکرێتەوەو بەبێ شەڕو کوشتار دەست بەسەر شارەکەدا دادەگرن.

## چەند فەرموودەیەك کە پەیوەندیان بە مەهدی و ڕووداوەکانی سەردەمیەوە هەیە :

**یەکەم:** (عوف ی کوڕی مالك) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿اعدُد ستا بين يدي الساعة، موتي، ثم فتح بيت المقدس، ثم موتان يأخذ فيكم كقُعَاص الغَنَم، ثم استفاضة المال حتى يعطي الرجل مائة فيظل ساخِطا، ثم فِتنة لا يبقى بيت من العرب إلا دخلته، ثم هدنة تكون بينكم وبين بني الأصفر فيغدرون فيأتونكم تحت ثمانين غاية تحت كل غاية اثنا عشر ألفا﴾[1]، واتە: (شەش ڕووداو بژمێرە پێش هاتنی قیامەت: مردنی من، پاشان ئازاکردنی (بيت المقدس) پاشان دوو مردن کەوەك قڕانی مەڕ لەناوتان دەبات، پاشان زۆربوونی پارە بە جۆرێك کە پیاو سەد دیناری دەدرێتێ هێشتا بۆڵەی دێت، پاشان فیتنەیەك دێت هیچ ماڵەعەرەبێك نامێنێت کە تێی نەچێت، پاشان ئاگربەستێك لەنێوان ئێوەو ڕۆمەزەردەکاندا دەبێت، دواتر غەدرتان لێ دەکەن و لەژێر هەشتا ئاڵادا دێن بۆتان، هەر ئاڵایەك دوانزە هەزاری لەگەڵدایە).

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، و رواه أحمد والطبراني عن معاذ بن جبل.

**دووەم:** (حذيفة اليماني) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿تكون النبوة فيكم ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يَرفعها، ثم تكون خلافة على منهاج النبوة، فتكون ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء الله أن يرفعها، ثم تكون ملكا عاضا، فيكون ما شاء الله أن يكون، ثم يرفعها إذا يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون ملكا جبرية، فتكون ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون خلافة على منهاج النبوة، ثم سكت﴾[٢]، واته: (پێغەمبەرایەتی لە ناوتاندا دەبێت تا ئەو کاتەی کە خوا دەیەوێت، پاشان هەرکات ویستی هەڵیبگرێت هەڵیدەگرێت، پاشان دەبێتە خەلافەت لە سەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەرایەتی، دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی کە خوا دەیەوێت، پاشان دەبێتە پاشایەتییەکی میراتگریی تا ئەوەندەی خوا دەیەوێت، پاشان کەویستی هەڵیبگرێت هەیدەگرێت، پاشان دەبێتە دەسەڵاتێکی زۆرداریی، ئەویش دەمێنێتەوە تا ئەوەندەی کە خوا دەیەوێت، پاشان کەویستی هەڵیبگرێت هەڵیدەگرێت، پاشان دەبێتەوە خەلافەت لە سەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەرایەتی، پاشان بێدەنگ بوو).

**سێیەم:** (معاذ ی کوڕی جبل) دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿عمران بيت المقدس خراب يثرب وخراب يثرب خروج الملحمة و خروج الملحمة فتح قسطنطينية وفتح القسطنطينية خروج الدجال﴾[١]، واته: (ئاوەدانکردنەوەی بیت المقدس کاول بوون و وێران بوونی مەدینەی بەدوادا دێت، وێران بوونی مەدینەش جەنگە گەورەکەی بە دوادا دێت، دەرچوونی جەنگە گەورەکەش ئازادکردنی (قسطنطنية)ی بەدوادا دێت، ئازادکردنی (قسطنطنية)ش دەرچوونی دەجالی بەدوادا دێت).

بەپێی ئەم فەرموودەیە دیارە (بيت المقدس) دەڕووخێنێت، بۆیە دواتر ئاوەدان دەکرێتەوە، وە بەدوای سەرلەنوێ دروست کردنەوەسیدا وێران بوونی شاری مەدینە دێت کە لە زەمانی مەهدیدا ڕوودەدات وەك پێشتر باسمانکرد.

**چوارەم:** (عبدالله ی کوڕی مسعود) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يلي رجل من أهل بيتي يواطيء اسمه اسمي، لو لم يبق من الدنيا إلا يوم لطول الله ذلك اليوم حتى يلي﴾[٢]، واته: (پیاوێك

[٢] رواه أحمد في مسنده و صححه الحافظ العراقي و وافقه الألباني.

[١] رواه أحمد في المسند (٥/٢٣٢و٢٤٥) و ابو داود رقم (٤٢٩٤) و هو حديث صحيح.

[٢] حديث حسن رواه الترمذي رقم (٢٢٣٢) و رواه ابو داود رقم (٤٢٨٢).

لە ئال و بەیتی من دەسەڵات دەگرێتە دەست، ناوی وەك ناوی من وایە، ئەگەر تەنها ڕۆژێك لەتەمەنی دونیا مابێت، خوا ئەو ڕۆژە درێژ دەکاتەوە هەتا ئەو پیاوە دەسەڵات دەگرێتە دەست).

**پێنجەم:** (ئەبو سەعیدی خدری) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿أبشركم بالمهدي يبعث في أمتي اختلاف من الناس وزلازل فيملأ الأرض قسطا وعدلا كما ملئت جورا و ظلما يرضى عنه ساكن السماء وساكن الأرض يقسم المال صحاحا. فقال: له رجل ما صحاحا؟ قال: بالسوية بين الناس، ويملأ الله قلوب أمة محمد(ﷺ) غنى ويسعهم عدله حتى يأمر مناديا فينادي فيقول: من له في مال حاجة؟ فما يقوم من الناس إلا رجل فيقول: ائت البلدان يعني الخازن فقل له إن المهدي يأمرك أن تعطيني مالا، فيقول له احث، حتى إذا جعله في حجره وأبرزه ندم فيقول: كنت أجشع أمة محمد، فيرده، فيقال له: إنا لا نأخذ شيئا أعطيناه.. فيكون كذلك سبع سنين أو تسع سنين ثم لا خير في العيش بعده﴾[1]، واتە: (مژدەتان دەدەمێ بە مەهدی، پیاوێکە لە قورەیش لە ئال و بەیتی من، لە کاتی ناکۆکی نێوان خەڵك و زۆربوونی بومەلەرزەدا خوا دەینێرێت، زەوی پڕدەکات لە ڕاستی و دادوەری، وەك چۆن پڕبوو لە زوڵم و ستەم، دانیشتوانی ئاسمان و دانیشتوانی زەوی لێی ڕازی دەبن، پارە بەرێکی بەش دەکات، پیاوێك ووتی چۆن بەرێکی؟ فەرمووی: بە یەکسانی لەنێوان خەڵکدا، وە خوای گەورە دڵی ئومەتی محمدﷺ پڕدەکات لە دەوڵەمەندی، وەدادوەریەکەی هەموویان دەگرێتەوە، هەتا بانگ دەرێك بانگ دەکات و دەڵێت: کێ پێویستی بەپارە هەیە؟ هیچ کەس لەو خەڵکە هەڵناسێت تەنها پیاوێك نەبێت، دەڵێت من، ئەویش پێی دەڵێت بچۆ بۆلای خەزنەدار پێی بڵێ: مەهدی فەرمانی داوە پارەم بدەیتێ، ئەویش پێی دەڵێت هەڵی ڕێژە، هەتا کاتێك کە دەیکاتە کۆشیەوە پەشیمان دەبێتەوە، دەڵێت من پیسکە ترین کەسی ئومەتی محمد بووم، پارەکە دەگێڕێتەوە، ئەوانیش پێی دەڵێن: ئێمە شتێك کە بەخشیبێتمان وەری ناگرینەوە، بەوشێوەیە حەوت ساڵ یان نۆ ساڵ دەمێنێتەوە، لە پاش ئەوە خێر لە ژیاندا نامێنێت).

**شەشەم:** (جابری کوڕی عبدالله) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يكون في آخر أمتي خليفة يحثي المال حثيا ولا يعده عدا﴾[1]، واتە: (لە کۆتایی ئومەتەکەمدا خەلیفەیەك دەبێت، پارە بە هەڵڕشتن هەڵدەڕێژێت و بە ژماردن نای ژمێرێت).

---

[1] حديث حسن رواه أحمد في المسند ورجاله رجال صحيح.

[1] رواه الحاكم في المستدرك (٥٥٣/٤ و ٥٥٤) وصححه ووافقه الذهبي.

**حەوتەم:** ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿تكون في آخر الزمان فتنة يحصل الناس فيها كما يُحصل الذهب في المعدن، فلا تَسبوا أهل الشام، ولكن سبوا شرارهم، فإن فيهم الأبدال، يوشك ان يرسل على اهل الشام سيب من السماء فيفرق جماعتهم، حتى لو قاتلهم الثعالب غلبتهم، فعند ذلك يخرج خارج من أهل بيتي في ثلاث رايات، المكثر يقول لهم: خمسة عشر ألفا، والمقلل يقول: اثنا عشر، إمارتهم أَمِتْ أَمِتْ، يلقون سبع رايات، تحت كل راية رجل يطلب الملك، فيقتلهم الله جميعا، ويردُّ الله الى المسلمين أُلفتهم ونعيمهم، وقاصيهم و دانيهم﴾[٢]، واتە: (لە ئاخر زەماندا فیتنەیەك دەبێت، خەڵكی تیا دەپاڵێورێت، هەروەك چۆن ئاڵتون لە كانزای تر دەپاڵێورێت، بۆیە جوێن مەدەن بە خەڵكی شام، بەڵكو جوێن بدەن بە خراپەكارەكانیان، چونكە پیاوی زۆر چاكیان تێدایە، هێندەی نەماوە خەڵكی شام خوا لێشاوێكیان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێت كۆمەڵیی و یەك ڕیزیەكەیان نغرۆ بكات، بە جۆرێك ئەگەر ڕێویش شەڕیان لەگەڵ بكات، لێیان بەرێتەوەو زاڵبێ بەسەریاندا، تا لەو كاتەش پیاوێك لە ئال و بەیتی من دەردەچێت بەسێ ئاڵاوە، ئەوەی بەزۆریان بزانێت ئەڵێت پانزەهەزار كەسن، ئەوەشی بەكەمیان بزانێت دوانزە هەزار كەسن، بەوە دەناسرێنەوە كە دروشمەكەیان بكوژ بكوژە، ڕووبەڕووی حەوت ئاڵا (واتە حەوت لەشكر) دەبنەوە كە لەژێر هەر ئاڵایەكیاندا پیاوێكی تیایە داوای دەسەلات و پاشایەتی بۆ خۆی دەكات، خوای گەورە هەموویان لەسەر دەستی دا دەكوژێت و لەناویان دەبات، وە خوای گەورە خۆشی و تەبایی بۆ موسڵمانان دەگێڕێتەوە، دوور و نزیكیان).

**هەشتەم:** (عبدالرحمن كوری سمرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿أبشروا، أبشروا، إنما مثل أُمتي مثل الغيث، لا يدرى آخره خير ام أوله، أو كحديقة أطعم فيها فوجٌ عاما، ثم أطعم فيها فوج عاما، لعل آخرها فوجا أن يكون أعرضها عرضا، وأعمقها عمقا، وأحسنها حسناً، كيف تهلك أمة أنا اوله، والمهدي وسطها، وعيسى بن مريم آخرها، ولكن بين ذلك فيج أعوج، ليس مني ولا أنا منهمُ﴾[١]، واتە: (مژدەتان لێبێت، مژدەتان لێبێت، ئومەتەكەی من نموونەی وەكو نموونەی بارانی بەلێزەمە وایە، نازانرێت كۆتاییەكەی خێرە یان ئەوەڵەكەی، یان وەكو كێڵگەیەك وایە، كۆمەڵێك ساڵێك لێی دەخۆن، پاشان ساڵێكی تر كۆمەڵێكی تر لێی دەخۆن، بەڵكو دوا كۆمەڵیان لە پانیدا لە هەموویان پانتر بن و لە قەڵەویدا لە هەموویان قەوڵەو تربن و

---

[٢] رواه الحاكم في المستدرك (٥٥٣/٤و٥٥٤) وصححه ووافقه الذهبي.

[١] رواه ابو نعيم في الحلية (٢٣١/٢) وهو حديث صحيح.

لەچاکیدا لە هەموویان چاکترین، چۆن ئومەتێك دەفەوتێت من لەوەڵەکەی بم، و مەهدی ناوەڕاستەکەی بێت و (عیسی ی کوڕی مەریەم)یش کۆتاییەکەی بێت، بەڵام لەو نێوەندەدا کۆمەڵانێکی خواروخێچ هەن، ئەئەوان لەمن و ئەمنیش لە ئەوانم).

# هاتنـــــــی دەجـــــــال

پاش ئەوەی کە موسـڵمانان لەجـەنگی (الملحمـة الكـبرى)دا سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێـنن و دواتریش شاری (اسطنبول) ئازاد دەکەن، ئا لەو کاتەدا هەواڵی سەرهەڵدان و هـاتنی (دەجـال) وەك ئاگر بەناو پوشی ووشکدا بە هەموو جیهاندا بڵاو دەبێتەوەو دەبێتە باس و خواسی سەر زاری هەموو خەڵکی.

لەبەر ڕۆشنایی دەیان و سەدان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە باس لە ڕووداوەکـانی ئـەم قۆناغە دەکات، دیارە موسڵمانانیش لەو سـەردەمەدا ڕۆژ بـە ڕۆژ و ڕووداو بـەڕوودا و دەزانـن چ ڕوودەدات و چیان لەپێشە، هەر بۆیە لەگەڵ ڕزگارکردنی شاری (اسـطنبول) کاتێـك کـە هـەواڵی بیـستنی دەرچـوونی دەجـال دەبیـستن بـە شـێوازێك شـپرزە دەبـن و دەشـڵەژێن کـە هەرچـی دەستکەوتیشیان هەبووە هەمووی بەجێ دەهێڵن و بەپەلە بەرەو شـام دەگەڕێنـەوە، هـەروەك پێـشتر لەفەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ کە ئیمام میلم لە (أبو هريرە)ـەوە ڕیوایـەتی کردبـوو باسمـان کـرد. چونکە ئەوان لەو فەرموودە پیرۆزانەوە ئەوەیان بۆ ڕوون بۆتەوە کە هاتنی دەجال لەو کاتەدا دەبێت، وە دەشزانن کە دەجال چ فیتنەیەکی گەورەیەو ڕووبەڕووبوونەوەشی لە توانای ئەوانـدا نیـەو، تاکـە قەڵاو پەناگەی لەشکری ئیسلامیش بۆ خۆ پاراستن لە فیتنەی دەجال وولاتی شامە، بۆیە بەپەلـە و بێ دواکەوتن بۆ شام دەگەڕێتەوە.

بەڵێ (دەجال) ئەو فیتنە گەورەیەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەرحەقیدا دەفەرموێت: ﴿ما بين خلـق آدم الى قيام الساعة خلق أكبر من الدَّجَّال﴾[1]، واتە: (لە دروست کردنی ئادەم هەتا هەستانی قیامەت هیچ فیتنەیەك نیە لە دەجال گەورەتر بێت).

سوە (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێـت دەڵێـت کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿ثـلاث اذا خرجن لم ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل، الدَّجَّال والدّابّة وطلـوع الـشمس مـن مغربهـا﴾[2]، واتە: (سێ شت هەن هەر کاتێ دەرچوون، ئەوەی پێشتر باوەڕی نەهێنابێت، لـە دوای ئـەوان بـاوەڕ هێنان سوودی پێ ناگەیەنێت: دەجال و دابەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە).

هەروەها (ابی امامە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ﴿يأيهـا الناس! انها لم تكن فتنة في الأرض منذ ذرعة الله ذرية آدم أعظم فتنة من الدَّجَّال وان الله لم يبعث نبيـا

---

[1] رواه مسلم رقم (٢٩٤٦) عن عمران بن الحصين.

[2] رواه مسلم رقم (١٥٨) و رواه الترمذي وصححه رقم (٣٠٧٤).

الا حذر أُمتهُ الدَّجَّال، وأنا آخر الأنبياء وأنتم آخر أُمم وهو خارج فيكم لا محالة﴾[1]، واته: (ئەی خەڵكینە، هەتا ئێستا هیچ فیتنەیەك نەبووە لەسەر ڕووی زەویدا، لەو ڕۆژەی كە خوای گەورە نەوەی ئادەمی لەسەر زەوی بڵاوە پێكردووە لە فیتنەی دەجال گەورەتر بێت، وە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە كە ئوومەتەكەی لە دەجال ئاگادار نەكرد بێت، منیش كۆتایی پێغەمبەرانم و ئێوەش كۆتایی ئومەتانن، وەبە دڵنیاییەوە لە ناو ئێوەدا دەدەچێت).

جا فیتنەیەك هێندە گەورە بێت كە هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت ئومەتەكانی لێئاگادار كردبێتەوە، و ئێمەش دڵنیابین كە چار ناچارە و هەر لەناو ئێمەدا دەردەچێت، بۆیە پێویستە هەموو موسڵمانێك زانیاری تەواوی دەربارەی ئەو فیتنە گەورەیە هەبێت، تا لەكاتی هاتنی دا پێ‌ی هەڵنەخەڵەتێت و بزانێت چۆن خۆی لێ‌ دەپارێزێت.

## مانای هەردوو ووشەی (المسیح) و (الدجال):

ووشەی (مسیح) لە زمانەوانیدا لەسەر وەزنی (فعیل) لە (مسح)ـەوە هاتووە واتە (سڕین)و (دەست پێدا هێنان)، وە یەكێك لە داتاشراوەكانیشی (ساح)بەمانای گەڕان و سیاحەت دێت[2]

وەزانایان دەڵێن: (عیسی) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت پێی دەوترێت (مسیح) لەبەرئەوەی دەستی هێنا بە هەر نەخۆشێكدا چاك دەبووەوە، یان لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا زۆرسیاحەت و گەڕانی دەكردو لە شوێنێكدا جێگیر نەدەبوو.

وە دەڵێن دەجالیش هەر بە مەسیح ناو دەبرێت لەبەرئەوەی چاوی ڕاستی سڕاوەتەوەو ڕووناكی تێدا نەماوە، یان لەبەرئەوەی لەماوەی چل ڕۆژدا هەموو زەوی دەگەڕێت[3]

ووشەی (دەجال)یش لەزمانەوانیدا لەسەر وەزنی (فعال)لە(دجل)ـەوە هاتووە بەمانای داپۆشین و تێچكەڵ كردن[4] وە (دجال) بۆیە پێی دەوترێت دەجال چونكە بە فێڵ درۆ حەق و ڕاستی لەخەڵكی دادەپۆشێت و ڕاست و چەوتیان لێ‌ تێكەڵ دەكات[5]

---

[1] صحيح الجامع الصغير (٢٧٣/٦) و رقمه (٧٧٥٢) واسناده صحيح.

[2] التذكرة للقرطبي٦٧٩.

[3] فتح الباري ج٢ كتاب (الآذان) باب (الدعاء قبل السلام).

[4] لسان العرب (٢٣٦/١١-٢٣٧).

[5] لسان العرب (٢٣٦/١١-٢٣٧).

وە پێغەمبەریش(ﷺ) هەردوو (مەسیح)ـەکەی بەوە لەیەك جیاکردۆتەوە کە بە (عیسی) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت دەڵێت (مەسیحی هیدایەت) وە بەدەجالیش دەڵێت (مەسیحی گومرایی)[1]

وە لەڕاستیدا ووشەی (مسیح) لەبنچینەدا شۆڕەتی (پێغەمبەر عیسی)یە صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت، بەڵام دەجال چونکە لەکاتی هاتنیدا خۆی وا بەخەڵك دەناسێنێت کە گوایە مەسیحی چاوەڕوان کراوەو هاتۆتە سەرزەوی، بۆیە بەمیش دەوترێت (مەسیح)، بەڵام مەسیحی دۆرو گومرایی، نەك (مەسیحە) ڕاستیەکە کە (عیسی)یە صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت.

## شێوە و ڕووخساری دەجال:

دەجال پیاوێکە لە نەوەی ئادەم، فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) کۆمەڵێکی زۆر لە سیفاتی شێوەو ڕوخساری باس کراوە، بۆ ئەوەی خەڵك باش بیناسنەوە هەرکات پەیدابوو موسڵمانان پێی هەڵنەخەڵەتێن و بەفیتنەکەی گومرا نەبن، وە ئەو سیفات و نیشانەش هێندە ڕوون و ئاشکران کەئەگەر کەسێکی نەزان و گومڕا کە خوا بەتەواوی سەری لێ شێواندبێت دەرکی پێنەکات، دەناهەموو موسڵمانێك دەیناسێتەوە کە دەجالە، گرنگترین سیفاتەکانی شێوەو ڕووخساریشی ئەوەیە کەپیاوێکی گەنجە، سورە، کورتەباڵایە، سنگە پێی لێك نزیکن و پاژنەکانی لەیەك دوورن، قژی لولە، ناوچاوانی پان و گەورەیە، ملی ئەستور و پانە، چاوی ڕاستی سڕاوەتەوە لە شوێنی خۆیدا، واتا نەدەرپەڕیوەتە دەرەوە نەچووە بەقوڵدا، بەڵکو دەڵێی دەنکی ترێیەو ڕووناکی تێدا نیە و چاوی چەپیشی گۆشتێکی زیادەی ئەستور بە پێڵوەکەیەوەیە لە ناوچەوانی نوسراوە (ك. ف. ر)، هەموو موسڵمانێکی خوێندەوار و نەخوێندەوار دەتوانێت بیخوێنێتەوە، وە نەزۆکەو منداڵیشی نابێت.

## ئەمەش چەند فەرموودەیەکە کە باس لە شێوەو ڕوخساری دەجال دەکات:

١- (عبادەی کوڕی صامت) دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ان مسیح الدَّجَّال رجل قصیر أفحج، جعد أعور مطموس العین لیس بناتئة ولا حجراء، فإن ألبس علیکم فأعلم أن ربکم لیس بأعور﴾[2]، واتە: (مەسیحی دەجال پیاوێکی کورتە، سنگە پێکانی لێك نزیکن و پاژنە پێکانی لێك دوورن، قژی لولە، کوێرە، چاوی سڕاوەتەوەو نە دەرپەڕیوەو نە چووە بە قوڵدا، ئەگەر هەر لێتان تێکچوو ئەوا بزانن کە خواکەتان کوێر نیە).

---

[1] فتح الباري ج١٣ كتاب الفتن باب (ذكر الدجال).

[2] سنن ابي داود (٤٤٣/١١-عون المعبود) وصحيح الجامع الصغير (٣١٧/٢) والحديث صحيح.

٢- (عبدالله كوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿بينما أنا نائم أطوف بالبيت،.... (فذكر أنه رأى عيسى بن مريم عليه سلام، ثم رأى الدَّجَّال فوصفه فقال): فإذا رجل جسيم أحمر جعد الرأس، أعور العين، كأن عينه عنبة طافية، قالوا: هذا الدَّجَّال، أقرب الناس به شبها ابن قطن، رجل من خزاعة﴾[١]، واتە: (لەکاتێکدا کە من نوستبووم تەوافم دەکرد بەدەوری بەیتدا.....باس دەکات کە (عیسی ی کوڕی مەریەم)ی دیوە صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت، پاشان دەجالی دیوەو وەصفی دەکات و دەفەرموێت: سەیردەکەم پیاوێکی کەتەیە، سورە قژی سەری لولە، چاوی کوێرە، دەڵێی ترێیەو ڕووناکی تێدا نیە، وەتیان: ئەوە دەجالە، شێوەی لە هەموو کەس زیاتر لە (إبن قطن)دەچێت، کە پیاوێك بوو لە خێڵی خزاعە، و ناوی(عبدالعزی ی کوڕی قطن کوڕی عومەری خوزاعی)یەو هەر لەسەردەمی جاهیلیدا مردووە).

٣- (نواسی کوڕی سمعان) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) وەصفی دەجالی بۆ کردین فەرمووی: ﴿إنه شاب قطط عينه طافئة كأني اشبهه بعبد العزى بن قطن﴾[٢]، واتە: (دەجال لاوێکە قژی زۆر لولە، چاوی کوچاوەیە، پێم وایە شێوەکەی لە (عبدالعزی ی کوڕی قطن)دەچێت).

٤- (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿وأما مسيح الضلالة فإنه أعور العين أجلى الجبهة عريض النحر فيه دفأ﴾[٣]، واتە: (بەڵام مەسیحی گومڕایی، ئەوە چاوی کوێرە، ناوچاوانی پان و دیارە، ملی ئەستور و پانە، چەمانەوەیەکی کەمی تێدایە).

٥- حذيفة ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ﴿الدَّجَّال أعور العين اليسرى جفال الشعر﴾[٤]، واتە: (دەجال چاوی چەپی کوێرە، قژی زۆر و بژە).

٦- وە لە فەرموودەکەی (انس)یشدا ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿بين عينه مكتوب كافر﴾[٥]، واتە: (لە نێو چاوانیدا نوسراوە کافر).

---

[١] صحيح البخاري (١٣/٩٠- مع الفتح) وصحيح مسلم (٢/٢٣٧-مع شرح النووي).

[٢] صحيح مسلم (١٨/٦٥-مع شرح النووي).

[٣] مسند إمام أحمد (١٥/ ٢٨-٣٠) تحقيق وشرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح، وحسنه ابن كثير.

[٤] صحيح مسلم (١٨/٦٠-٦١مع الشرح النووي).

[٥] صحيح البخاري (١٣/٩١-مع الفتح) وصحيح مسلم (١٨/٥٩مع الشرح النووي).

وه له ڕیوایەتێکی تردا ﴿ثم تهجاها (ك ف ر) يقرؤه كل مسلم﴾[1]، واته: (پاشان به حونجه ووتی (ك ف ر)، هەموو موسڵمانێك دەیخوێنێتەوه).

وه له ڕیوایەتێکی تردا لە(حذيفة)ەوه: ﴿يقرؤه كل مؤمن كاتب و غير كاتب﴾[2]، واته: (هەموو ئیمانداریكی خوێندەوار و نەخوێندەوار دەیخوێنێتەوه).

ئیمامی (نووي)یش دەربارەی ئەو نوسینه دەڵێت (ئەوەی کەڕاستەو زاناکان لەسەری کۆکن ئەوەیه که ئەو نوسینه نوسینێکی ڕاستیەو خوای گەورە کردوویەتی به نیشانەو بەڵگە لەسەر دۆر و کوفری دەجال، وه خوای گەورە بۆ هەموو موسڵمانێکی خوێندەوار و نەخوێندەواری ئاشکرادەکات و له کەسانی گومڕاو سەرلێشێواویشی دەشارێتەوەو هیچ ڕێگرێکیش لەوەدا نیه).

٧- سەبارەت بەوەش که دەجال نەزۆکەو منداڵی نابێت له فەرموودەکەی (ابی سعیدی خودری) لەگەڵ (ابن صیاد)دا هاتووه (ابن صیاد) پێی دەڵێت: ﴿أَلَستَ سَمِعتَ رسول الله(ﷺ) يقول:انه لا يولَدُ له، قُلتُ: بَلى﴾[3]، واته: (ئەی تۆ گوێت له پێغەمبەرﷺ نەبووه که دەفەرموێت: دەجال منداڵی نابێت؟ ئەویش دەڵێت ووتم:بەڵێ).

٨- پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی ئەو چاوەی دەجال دەکات که کوێر نیەو پێ ی دەبینێت، دەفەرموێت: ﴿الدّجّال عينه خَضراء كالزُّجاجةِ﴾[4]، واته: (دەجال چاوی سەوزە وەك شوشه).

لەکۆی ئەم فەرموودانەشەوە (قاضي عياض) وای بۆ دەچێت، که دەجال هەردوو چاوەکەی عەیبداره، بەڵام چاوی ڕاستی بەتەواوی کوێرە و سڕاوەتەوە، وه چاوی چەپی هەرچەنده ساغەو دەبینێت بەڵام پارچە گۆشتێکی زیادەی ئەستوری پێوەیه که ئەویشی عەیبدار و ناشیرین کردووه. وه هەردوو ئیمامی (نووي) و (قرطبي)یش هەمان ڕایان هەیه[5]

## شوێنی هاتن و دەرچوونی دەجال:

سەبارەتی به شوێنی هاتنی دەجال (ابو بکری صدیق) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) باسی بۆ کردووین و فەرمووی: ﴿الدّجّال يخرج مِن أرضٍ بِالَمشرِق يُقالُ له

---

[1] صحيح مسلم (٥٩/١٨) مع الشرح النووي.

[2] صحيح (٦١/١٨- مع شرح النووي).

[3] صحيح مسلم (٥٠/١٨) مع شرح النووي.

[4] رواه احمد وأبو نعيم باسناد صحيح، وجاءت في سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم (١٨٦٣)

[5] شرح النووي لمسلم (٢٣٥/٢) والتذكرة للقرطبي ل٦٦٣

خُراسان﴾[1]، واته: (دەجال لە خاكێك دەردەچێت كە لە ڕۆژهەڵاتە، پێی دەوترێت خراسان).وە (انس)یش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يخرج الدّجّال من يهوديّة أصبهان، معه سبعون ألفاً من اليهود﴾[2]، واته: (دەجال لە گەڕەكی جوولەكانی شاری أصفهان دەردەچێت و حەفتا هەزار جوولەكەی لەگەڵدایە).

وە (نواسی كوڕی سمعان) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إنهُ خارج خلّةً بين الشام والعراق فعاث يميناً وعاث شمالاً يا عبادالله فاثبتوا﴾[3]، واته: (دەجال لە ڕێیەكی نێوان شام و عێراق دەردەچێت، بەڕاست و چەپدا خراپەكاری دەكات، ئەی ئەی بەندەكانی خوا خۆتان ڕاگرن).

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەكەوێت كە سەرەتای سەرهەڵدانی لە خاكی خراسانەوە دەبێت و پاشان دێتە گەڕەكی جوولەكانی شاری أصفهان و لەوێش هەتا هەزار جوولەكە شوێنی دەكەون و دواجاریش لە شوێنێكی سنوری نێوان عێراق و شام[4] خۆی ئاشكرا دەكات و لافی خوایەتی لێدەدات و بەڕاست و چەپدا فەساد و خراپەكاری بڵاودەكاتەوە.

## فیتنەی دەجال:

وەك پێشتر باسمان كرد دەجال گەورەترین فیتنەیە كە بەرۆكی مرۆڤایەتی دەگرێت لە ئادەمەوە تا هەستانی قیامەت، ئەویش بەهۆی ئەوەی كە توانای ئەنجامدانی هەندێ كاری وای هەیە كەلەتوانای هیچ مرۆڤێكدا نیە لەو سەردەمەدا، وە ئەو توانایەشی بۆ ئەوە بەكاردەهێنێت كەخەڵكی قەناعەت پێبكات كە خوایە، وە خەڵكێكی زۆریش فریوی پێدەخۆن و شوێنی دەكەون، تەنانەت پیاوی وای پێ هەڵدەخەڵەتێت كە خۆی زۆر بە ئیماندار دەزانێت، ئەوەتا (عمرانی كوڕی حصین) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من سمع بالدجال فَلْيَنأ عنه فوالله فانَّ الرَّجُلَ يأتيه وهو يَحسِبُ أنَّه مؤمنٌ فَيَتَّبِعَهُ مّا يبعَثُ به من الشُّبهات﴾[5]، واته: (هەركەسێ كە بیستی دەجال هاتووە باخۆی لێ لادات، سوێند بەخوا پیاو دێت بۆلای كە خۆی زۆر بە ئیماندار دەزانێت، كەچی شوێنی دەكەوێت، بەهۆی ئەو كارە گومانارویانەی كە ئەنجامی دەدات، و سەری پێ لەخەڵك دەشێوێنێت).

---

[1] جامع الترمذي (٦/٤٩٥– مع تحفة الأحوذي) قال الألباني: (صحيح). والصحيح الجامع الصغير رقم (٣٣٩٨).

[2] الفتح الرباني ترتيب مسند أحمد (٧٣/٢٤) قال ابن حجر (صحيح). وفتح الباري (٣٢٨/١٣).

[3] صحيح مسلم رقم (٢٩٣٧).

[4] سنوری نێوان عێراق و شام بەشێك لە كوردستانی عێراقیش دەگرێتەوە، خوای گەورە پەنامان بدات.

[5] رواه أبو داود بإسناد صحيح، وفي جامع الأصول رقم (٧٨٤٦).

بۆ نموونه (حذيفة) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿انَّ الدَّجّالَ يَخرُجُ وانَّ مَعَهُ ماءاً وناراً فأمّا الذي يراه الناسُ ماءاً فنارٌ تُحرِقُ وأمّا الذي يراه الناس ناراً فماءٌ بارد عذب، فمن ادرك ذلك منكم فليقع في الذي يراه نارا، فإنه ماء عذب طيب﴾[1]، واتە: (دەجال کاتێك دەردەچێت، ئاو و ئاگری لەگەڵدایە، جا ئەوی کە خەڵك بە ئاوی دەبینین، لەڕاستیدا ئاگرێکی سوتێنەرە، وە ئەوەشی کە خەڵك بە ئاگری دەبینن، لە ڕاستیدا ئاوێکی سارد و سازگارە، جا هەر کەسێکتان گەیشتە ئەوە، با خۆی بخاتە ئەوەی کە بە ئاگری دەبینێت، چونکە ئەگرەکە ئاوێکی سازگارو پاکە).

هەروەها (نواسی کوڕی سمعان) دەگێڕێتەوە کە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە خێرایی ڕۆیشتنی دەجال لەسەر زەوی چۆنە؟ ئەویش فەرموویەتی: ﴿كالغيث استدبرته الريح فيأتي على القوم فيدعوهم فيؤمنون به ويستجيبون له فيأمر السماء فتمطر والأرض فتنبت فتروح عليهم سارحتهم أطول ماكانت ذراً واسبغه ضروعا وأمده خواصر ثم يأتي القوم فيدعوهم فيردون عليه قوله فينصرف عنهم فيصبحون ممحلين ليس بأيدهم شيء من اموالهم ويمر بالخربة فيقول لها أخرجي كنوزك فتتبعه كنوزها كيعاسيب النحل ثم يدعو رجلا ممتلئا شبابا فيضربه بالسيف فيقطعه جزلتين رمية الغرض ثم يدعوه فيقبل ويتهلل وجهه يضحك﴾[2]، واتە: (خێراییەکەی لەسەر زەوی وەك هەور وایە کە ڕەشەبا پاڵی پێوەبنێت، پاشان دەچێتە لای کۆمەڵێك بانگەوازیان دەکات بۆ لای خۆی، ئەوانیش باوەڕی پێدەهێنن و دەچن بەدەمیەوە، ئەویش فەرمان بەئاسمان دەکات و باران دەبارێت، وە فەرمان بەزەوی دەکات و ئەویش سەوز دەبێت و، مەڕ و ماڵاتیشیان دەگەڕێتەوە و لەهەموو کات زیاتر پشتیان پان و بەرزەو گوانیشیان لە هەموو کات زیاتر پڕشیرترەو ناوقەدیشیان لە هەموو کات پانترە لە تێریدا، پاشان بەلای کۆمەڵێکی تردا دەڕووات، بانگەوازی ئەوانیش دەکات بۆلای خۆی، بەڵام بانگەوازەکەی ڕەت دەکەنەوەو باوەڕی پێ ناهێنن، ئەویش بەجێیان دەهێڵن، لەدوای ئەو خاك و زەویەکەیان سوێرو پڕ خوێ دەبێت، و هەرچی ماڵیان هەیە بەدەستیانەوە نامێنێت، وە بەلای کەلاوەی ڕوخاودا تێدەپەڕێت، پێی دەڵێت: کەنزو زێڕەکەت بهێنە دەرەوە، ئیتر هەرچی کەنزو زێڕی تێدایە وەکو مێش هەنگ شوێنی دەکەون، پاشان پیاوێکی گەنج و تێك سمڕاو بانگ دەکات، شمشێرێکی لێ دەدات و دەیکات بەدوو کەرتەوە هەرکەرتێکیان بەئەندازەی تیر هاوێشتنێك لەیەکتر دوور دەخاتەوە، پاشان بانگی دەکات، کابرابەساغی دێتەوەو پێ دەکەنێت).

---

[1] رواه مسلم رقم (٢٩٣٥).

[2] صحيح مسلم (١٨/٦٥-٦٦مع شرح النووي).

وە هەر سەبارەت بەو پیاوە کە دەجال دەیکوژێت و دەیکات بە دوو کەرتەوە، (ابو سعیدی خدری) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) باسێچکی دووررو درێژی لەسەر دەجال بۆکردین، تیایدا فەرمووی: ﴿يأتي الدّجّالُ وهو محرم عليه أن يدخل نقاب المدينة فيترل البعض السباخ التي تلي المدينةِ، فيخرج اليهِ يومئذٍ رجلٌ هو خير الناس أو من خير الناس فيقول أشهدُ أنّكَ الدّجّالُ الذي حدّثنا عنكَ رسول الله(ﷺ) حديثهُ، فيقولُ الدجالُ: أرَأيتَ أن قَتلتُ هذا ثمَّ أحيَيْتُهُ هل تشكونَ في الأمر فيقولونَ لا فيقتلوهُ ثم يُحييهِ فيقولُ حين يُحييه واللهِ ما كنتُ قطٌّ اشدَّ بصيرةً منّي اليومَ فيقولُ الدجالُ أقتُلُهُ فلا أسلّطُ عليه)[1]، واتە: (دەجال دێت–وەلێی حەرام کراوە کە بچێتە ناو شاری مەدینەوە–، لە هەندێك چۆڵوانی دەرەوەی شاری مەدینەدا دادەبەزێت، پیاوێك لە شاری مەدینە بۆی دێتە دەرەوە لەو ڕۆژەدا باشترین کەسە، یان لە باشترین کەسانی ئەو ڕۆژەیە، بەدەجال دەڵێت: شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو دەجالەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی باسکردوین، دەجالیش بەخەڵکەکەی چواردەوری دەڵێت: ئەگەر بینیتان ئەم پیاوەم کوشت و پاشان زیندوم کردەوە، ئیتر کەستان گومانی لەمن دەمێنێت؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر، پاشان پیاوەکە دەکوژێت و زیندوی دەکاتەوەو، ئەویش پێی دەڵێت: سوێند بەخوا هیچ کات هێندەی ئەمڕۆ بەرچاو ڕۆشن نەبووم کە تۆ دەجالی درۆزنیت، پاشان دەجال دەیەوێت کە پیاوەکە بکوژێت، بەڵام خوای گەورە زاڵی ناکات بەسەریدا).

وە یەکێکی تریش لە فیتنە گەورەکانی دەجال ئەوەیە کە (ابو امامەی باهلی) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی ﴿و انَّ من فِتنَتِهِ أن يقولَ لأعرابيّ أرَأيتَ ان بعثتُ لكَ أباكَ وأُمّكَ أتَشهد انّي رَبُّكَ فيقولُ نعم فيتمثّلُ له شَيطانان في صورة أبيهِ وأُمِّهِ فَيَقولان يا بُنَيَّ اتّبعهُ فإنّهُ رَبُّكَ)[2]، واتە: (وە یەکێکی تر لە فیتنەکانی دەجال ئەوەیە کە پیاوی دەشتەکی دەڵێت: ئەگەر بینیت باکت و دایکت بۆ زیندوو بکەمەوە، باوەڕم پێ دەهێنیت کەمن خوای تۆم؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، ئیتر دوو شەیتان خۆیان دەخەنە شێوەی باوك و دایکیەوە و پێی دەڵێن: کوڕم شوێنی بکەوە ئەوە خوای تۆیە).

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە فیتنەی دەجال تا چ ڕادەیەك گەورەو ترسناکە، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیەشمان لەیاد نەچێت کە هیچ شتێك بەبێ ئیرادەو ئارەزووی خوا نابێت، ئەو فیتنانەش کە لەسەر دەستی دەجال ڕوودەدات هەمووی تاقیکردنەوەی خوایە بۆبەندەکانی و، مرۆڤی

---

[1] رواه البخاري (فتح الباري (١٣/١٠١)) و رواه مسلم رقم (٢٩٣٨) واللفظ البخاري.

[2] صحيح الجامع الصغير رقم (٧٧٥٢).

ئیماندار دەبێت خوای ڕاستی خۆی بناسێت و بە جادووگەرێکی وەك دەجال فریو نەخوات و هەڵنەخەڵەتێت.

## شوێنکەوتوانی دەجال:

وەك پێشتر باسمانکرد دەجال ئەو پاشایەیە کە جوولەکە چاوەڕێی هاتنی دەکەن و پێیان وایە لەسەر دەستیدا حوکمی هەموو جیهان دەکەن و دەیان ساڵیشە زەمینە بۆ هاتنی سازدەکەن، بۆیە شتێکی سەرسوڕهێنەر نابێت کە بەشی زۆری شوێنکەوتوانی جوولەکە بن، هەروەك (أنس ی کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿يتبع الدَّجّال من يهود أصبهان سَبعون ألفاً عليهم الطيالِسةُ﴾[1]، واتە: (حەفتا هەزار لە جوولەکەکانی ئەصفەهان شوێن دەجال دەکەونپۆشاکی سەوزیان لەبەردایە).

لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها لە جوولەکەکانی ئەصفهان حەفتا هەزار شوێن دەجال دەکەون، ئەمە جگە لە هەزاران جوولەکەی جیهان، وە سەبارەت بە شاری ئەصفهانیش پێویستە ئەو ڕاستیە بزانین کە ئەمڕۆ لە هیچ شارێکی موسڵمانن‌شینی جیهاندا هێندەی شاری ئەصفهان جوولەکەی تێدا نیشتەجێ نیە، بەڕادەیەك کە چەندین گەڕەکی تایبەت بە خۆیان هەیە لەو شارەدا هەر بۆیەش دەجال دەیکاتە بنکەی دەرچوونی خۆی.

(طیلسان)یش پۆشاکێکە وەکو عەبا دەدرێت بە شانداو لەشی مرۆڤ دادەپۆشێت و بەزۆری ڕەنگی سەوزەو زیاتر زانایانی ئاین لەبەری دەکەن. هەروەها بێجگە لە جوولەکەش، دەجال هەر لەسەرەتای هاتنیەوە لەخاکی (خراسان) کۆمەڵە خەڵکانێکی تریشی لەگەڵ دایە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿الدَّجَّال خارج من قبل المشرق من أرض يقال لها خراسان، معه أقوام، كأن وجوههم المجان المطرقة﴾[1]، واتە: (دەجال لەڕووی ڕۆژهەڵاتەوە دێت لە خاکێك کە پێی دەوترێت خراسان، چەند کۆمەڵە قەومێکی لەگەڵدایە دەموچاویان دەڵێی قەڵغانە). کە مەبەستیش بەو دەموچاو قەڵغانیانە خەڵکی وڵاتانی مەنغۆلیاو چین و قەفقاسیاو ئەو ناوچانەیە کە کۆن پێیان دەوترا (تورك).

بەڵێ خەڵکی ئەو ناوچانەو جوولەکەکانی ئەصفهان دەست و دایەرەی دەجال دەبن و هەرلەسەرەتاوە کاری دەجال دەچەسپێنن، بەڵام دواتر لە هەموو وڵاتانی جیهان و لە هەموو زمان و

---

[1] صحيح مسلم (١٨/٨٥-٨٦ مع شرح النووي).

[1] رواه الترمذي و أحمد والحاكم عن أبي بكر وصححه الحاكم وأقره الذهبي، وصححه أحمد شاكر في تعليقه على المسند (١/١٥٩-١٦٩) و الألباني في الصحيحة (٤/١٢٢ رقم ١٥٩١).

ڕەگــەزەکان خــەڵکانێکی زۆر شــوێن دەجــاڵ دەکــەون و بــاوەڕی پــێ دەکــەن، بــەڵام لەمانــەش پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە بەوە دەکــات کــە بەتایبــەت ئــافرەت زۆر شــوێنی دەکــەوێت و زوو بــاوەڕی پــێدەهێنن، هــەروەك (عبــدالله ی کــوڕی عومــەر) ڕەزای خــوای لێبێــت دەڵێــت: پێغەمبــەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ينزل الدجال في هذه السَّبخَةِ بِمَرَّقناةَ فيكون أكثر من يخرج اليه النساءُ حتّى ان الرجُلَ ليرجع الى حميمه والى أمِهِ وابنته وأختهِ وعمتهِ فيثيقها رباطا مخافةَ أن تخرُجَ اليه﴾[1]، واتە: (دەجال دێت لە کەلاوە چۆڵەکەی لای (مرقنات)ی نزیك شاری مەدینە دادەبەزێت، بەشی زۆری ئــەو خەڵکــەی کە دەچنە دەرەوە بۆ لای و شوێنی دەکەون ئافرەتن، بە جۆرێك کە پیاو دەگەڕێتەوە بۆلای خێزانــی و کچی و خوشکی و پوری، توند دەیان بەستێتەوە، لەمەترسی ئەوەی نەچنە دەرەوە بۆ لای دەجال).

دیارە هۆی ئەوەش دەگێڕێتەوە بۆ ئەو هەموو سحرو جادو و کارە سەرسوڕهێنەرانەی کەدەجال ئەنجامی دەدات و ئاشکراشە کە ئافرەت زووتر باوەڕ بەوشتانە دەکات و چاوبەستی لــێ دەکرێــت، بۆیە زیاتر شوێنکەوتووەکانی دەجال ئافرەت دەبن.

## ئەو نیشانانەی کە پێش هاتنی دەجال دەردەکەون:

(حفصـة)ی دایکی موسڵمانان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویــەتی: ﴿انما يخرجُ الدّجّالُ من غضبةٍ يغضبها﴾[2]، واتە: (دەرچوونی دەجال بەهۆی توڕەبوونێکەوە دەبێت کە تــوڕە دەبێت).

بــەڵام دەجــال لــە پــێش دەرچــوون و خــۆ ئاشــکراکردنی دا چــەند کارەســات و ڕووداوێــك ڕوودەدەن کەگرنگترینیان ئەمانەن:

١- هەموو ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی کەپێشتر لە باسی (محمدی مهدی)دا ئاماژەمان پێکرد هەتا ڕزگارکردنی شاری ئەستەمبوڵ. هەر هەمووی دەکرێت کە بڵێین نیشانەن بۆ هــاتنی دەجــال، هەروەك لەو فەرموودەیەدا هاتبوو کە (معاذی کوڕی جبل) ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتــەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ﴿عمران بيت المقـدس خـراب يثـرب وخـراب يثـرب خروج الملحمة وخروج الملحمة فتح قسطنطينية وفتح القسطنطينية خروج الـدجال﴾[3]، واتــە: (ئاوەدانکردنەوەی (بيت المقدس) وێران بوونی شاری مەدینەی بەدوادا دێــت، وێــران بــوونی شــاری مەدینــەش جەنگــە گەورەکــەی بــەدوادا دێــت، وە دەرچــوونی جەنگــە گەورەکــەش

[1] مسند أحمد (٧/١٩٠) رقم (٥٣٥٣) تحقيق احمد شاكر وقال اسناده صحيح.
[2] صحيح رواه احمد وأبو داود وصححه الألباني في المشكاة برقم (٤٢٤).
[3] رواه احمد في المسند (٢٤٥/٥، ٢٣٢) وابو داود رقم (٤٢٩٤) وهو صحيح.

ئازادکردنی ئەستەمبوڵی بەدوادا دێت، وە ئازادکردنی ئەستەمبوڵیش دەرچوونی دەجالی بەدوادا دێت). کەواتە ڕاستەوخۆ لەدوای ئازادکردنی ئەستەمبوڵ دەجال دەردەچێت و ئاشکرا دەبێت.

**٢- سێ ساڵ گرانی و قات و قڕی لە پێش هاتنی دەجالدا:**

((أبو هريرە) امامە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿... وإن قبل خروج الدجال ثلاث سنوات شداد يصيب الناس فيها جوع شديد يأمر الله السماء في السنة الأولى أن تحبس ثلث مطرها ويأمرُ الأرض فتحبس ثلث نباتها ثم يأمر السماء في الثانية فتحبس ثلثي مطرها ويأمر الأرض فتحبس ثلثي نباتها ثم يأمر الله السماء في السنة الثالثة فتحبس مطرها كله فلا تقطر قطرةً ويأمر الأرض فتحبس نباتها كله فلا تنبتُ خضراء فلا تبقى ذات ظلف الا هلكت الاّ ما شاء الله.. قيل: فما يعيش الناسُ في ذلك الزمان؟ قال: التهليل والتكبير والتسبيح والتحميد ويجرى ذلك عليهم مجرى الطعام﴾[1]، واتە: (..... وە لە پێش هاتنی دەجالدا سێ ساڵ نەهامەتی دووچاری خەڵك دەبێت کە برسێتیەکی زۆری تێدایە، ساڵی یەکەم خوای گەورە فەرمان بە ئاسمان دەکات کە سێیەکی بارانی ڕابگرێت و فەرمان بەزەویش دەکات کە سێیەکی ڕووەکی بگرێتەوە، پاشان لەساڵی دووەمدا فەرمان بە ئاسمان دەکات دوولەسەر سێی بارانی دەگرێتەوەو فەرمانیش بەزەوی دەکات دوولەسەر سێی ڕووەکی دەگرێتەوە، پاشان پاشان فەرمان بە ئاسمان دەکات لە ساڵی سێیەمدا هەموو بارانی دەگرێتەوە یەك دڵۆپ لێ نابارێت، وە فەرمان بە زەویش دەکات، هەموو ڕووەکی دەگرێتەوەو هیچ سەوزاییەکی لێ ناڕووێت، ئیتر هەرچی ئاژەڵی سمدارە هەمووی لەناودەچێت مەگەر ئەوەی کە خوا نەیەوێت لەناو بچێت، ووتیان: ئەی خەڵکی لەو زەمانەدا بەچی دەژین؟ فەرمووی: ووتنی(لا اله الا الله والله اكبر لله الحمد) وەکو خۆراك پێی دەژین و شوێنی خۆراکیان بۆدەگرێتەوە).

لە فەرموودەکەوە پێدەچێت کە ئەو گرانی و بێ بارانیە لەو سەردەمەدا هەموو سەرزەوی بگرێتەوە، یاخود لانی کەم وڵات و خاکی موسڵمانان بە تەواوی بگرێتەوە.

٣- (فاطمة ی کچی قەیس) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان بە جەماعەت لەڕیزی ژناندا نوێژی دەکرد لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەمزگەوت، کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژەکەی بووەوە لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و پێ دەکەنی و فەرمووی: ﴿لِيَلْزَم كُلُّ

[1] صحيح رواه ابن ماجة وابن خزيمة والحاكم وصححه الألباني في صحيحه الجامع (٦/٢٧٧) في الصحيحة برقم (٢٤٥٧).

إنسَانٍ مُصَلاهُ﴾، واته: (با هەر یەکەتان لـە شـوێنی خـۆی دانیـشێت و هەڵنەسـێت). پاشـان فەرمووی: ﴿أتدرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُم؟﴾ واته: (دەزانن بۆچی کۆم کردونەتەوە؟) ووتیـان: خـواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: ﴿إني والله ما جمعتكم لرغبة ولا لرهبة ولكن جمعتكم لأن تميما الداري كان رجلا نصرانيا فجـاء فبـايع وأسـلم وحـدثني حـديثا وافـق الـذي كنـت أحدثكم عن مسيح الدجال حدثني أنه ركب في سفينة بحرية مع ثلاثين رجلا مـن لخـم وجـذام فلعب بهم الموج شهرا في البحر ثم أرفئوا الى جزيرة في البحر حتى مغرب الشمس فجلسوا في أقرب السفينة فدخلوا الجزيرة فلقيتهم دابة أهلب كثير الشعر لا يدرون ما قبلة مـن دبـره مـن كثرة الشعر فقالوا ويلك ما أنت فقالت أنا الجساسة قالوا وما الجساسة قالت أيها القوم الطلقوا الى هذا الرجل في الدير فإنه الى خبركم بالأشواق قال لما سمت لنا رجـلا فرقنـا منهـا أن تكـون شيطانة قال فانطلقنا سراعا حتى دخلنا الدير فإذا فيه أعظم إنسان رأيناه قط خلقا وأشده وثاقا مجموعة يداه الى عنقه ما بين ركبتيه الى كعبيه بالحديد قلنا ويلك ما أنت قـال قـد قـدرتم علـى خبري فأخبروني ما أنتم قالوا نحن أناس من العرب ركبنا في سفينة بحرية فـصادفنا البحـر حـين اغتلم فلعب بنا الموج شهرا ثم أرفأنا الى جزيرتك هذه فجلسنا في أقربها فدخلنا الجزيرة فلقيتنا دابة أهلب كثير الشعر لا يدري ما قبله من دبره من كثرة الشعر فقلنا ويلك ما أنت فقالت أنا الجساسة قلنا وما الجساسة قالت عمدوا الى هذا الرجـل في الـدير فإنـه الى خـبركم بالأشـواق فأقبلنا اليك سراعا وفزعنا منها ولم نامن أن تكون شيطانة فقال أخبروني عن نخل بيـسان قلنا عن أي شأنها تستخبر قال أسألكم عن نخلها هل يثمر قلنا له نعم قال أما إنه يوشك أن لا تثمر قال أخبروني عن بحيرة الطبرية قلنا عن أي شأنها تستخبر قال هل فيها ماء قالوا هي كثيرة الماء قال أما إن ماءها يوشك أن يذهب قال أخبروني عن عين زغر قالوا عن أي شأنها تستخبر قال هـل في العين يزرع أهلها بماء العين قلنا له نعم هي كثيرة الماء وأهلها يزرعون من مائها قال أخبروني عن نبـي الأميين ما فعل قالوا قد خرج من مكة ونزل يثرب قال أقاتلـه العـرب قلنـا نعـم قـال كيف صنع بهم فأخبرناه أنه قد ظهر على من يليه من العرب و أطاعوه قال لهم قد كـان ذلـك قلنا نعم قال اما ان ذاك خير لهم أن يطيعوه وإني مخبركم عني إني أنا المـسيح وإنـي أوشـك أن يؤذن لي في الخروج فأخرج فأسير في الأرض فلا أدع قرية إلا هبطتها في أربعين ليلة غـير مكـة وطيبة فهما محرمتان على كلتاهما كلما أردت أن أدخل واحدة أو واحدا منهما استقبلني ملـك بيده السيف صلتا يصدني عنها وإن على كل نقب منها ملائكة يحرسونها... قالت: قال رسول الله(ﷺ) وطعن بمخصرته في المنبر هذه طيبة هذه طيبة يعني المدينة ألا هل كنت حدثتكم ذلـك

فقال الناس نعم فإنه أعجبني حديث تميم أنه وافق الذي كنت أحدثكم عنه وعن المدينة ومكة ألا إنه في بحر الشام أو بحر اليمن لا بل من قبل المشرق ما هو من قبل المشرق ما هو من قبل المشرق ما هو وأومأ بيده الى المشرق) قالت: فحفظت هذا من رسول الله ﷺ[1]، واته: (سوێند بەخوا نە بۆ خۆشی و نەبۆ ترس کۆم نەکردونەتەوە، بەڵام بۆیە کۆمکردنەوە، چونکە(تمیم الداری) پیاوێکی دیان بوو، هات و بەیعەتی پێدام و موسڵمان بوو، سوە قسەیەکی بۆگێڕامەوە، لەگەڵ ئەوەی کەمن بۆم باس کردبوو دەربارەی مەسیحی دەجال وەك یەك وابوون، بۆی باس کردم کە سواری پاپۆڕی دەریایێکی بووە لەگەڵ (٣٠) پیاو لە خێڵی (لخم) و (جزام)، پاشان بۆماوەی مانگێك شەپۆلی دەریا هێناونی و بردوونی، پاشان لەنزیك دوورگەیەکەوە لە دەریادا لەنگەری پێ گرتوون، هەتا خۆرئاوابوون، ئینجا بە بەلەم لەپاپۆرەکەدا دابەزیون و چوونەتە دورگەکە، دەعبایەکی توکنی قژ زۆر بەرەو پیریان هاتووە، پێش و پاشی لەبەر موو زۆری لێك جیانەدەکرایەوە ووتمان نەگبەت تۆ چیت؟ ووتی من (جساسەم) واتە (هەواڵ بەر) ووتمان: جساسە چییە؟ ووتی: خەڵکینە ئێوە جارێك برۆن بۆلای ئەو پیاوە لەو دەیرەدا چونکە زۆر تامەزرۆی هەواڵتانە. ووتی: کە ناوی پیاوی برد زۆر ترساین کە ئەم شتە شەیتان بێت. ووتی: ئێمەش بەپەلە رۆیشتن تا چوینە ناو دەیرەکە کەسەیر دەکەین گەورەترین زەلام کە تا ئێستا بینیبێتمان لە قەبارەدا وە بەتوندترین شێوە کۆت و زنجیر کرابوو، هەردوو دەستی بەسراوو بە ملییەوە، لە هەردوو ئەژنۆیەوە هەتاهەردوو پاژنەپێی ئاسن بوو، ووتمان: ماڵ وێران تۆ کێی؟ ووتی: ئەوا ئێوە من دەبینن، بەلام پێم بلێن ئێوە کێن؟ ووتیان: ئێمە خەڵکێکی عەرەبین، سواری پاپۆرێکی دەریایی بووین، تووشی هەڵچوونی شەپۆلی دەریا بووین، یەك مانگ شەپۆل یاری پێکردین، هەتا لەم دورگەیەی تۆ پاپۆرەکەمان لەنگەری گرت، ئێمەش سواری بەلەم بووین و هاتینە دورگەکە، دەعبایەکی توکنی قژ دریژمان بینی، لەبەر مووی زۆر پێش و پاشیمان بۆ جیا نەدەکرایەوە پێمان ووت: نەگبەت تۆ کێی؟ ووتی: من (جساسە)م، ووتمان(جساسە) چییە؟ ووتی: جاری برۆن بۆلای ئەو پیاوەی لەو دەیرەدایە چونکە زۆر تامەزرۆی هەولی ئێوەیە، ئێمەش بەپەلە هاتین بۆ لای تۆ ترساین ئەو دەعبایە شەیتان بێت، ووتی: هەولی دارخورماکانی (بیسان)موسڵمانان پێ بلێن؟ ووتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ ووتی پرسیاری دارخورماکانیتان لێ دەکەم، ئایا بەر دەگرێت؟

[1] صحیح مسلم (١٨/٧٨-٨٣مع شرح النووي).

پێمــان ووت: بــەڵێ، ووتــی: هێنــدەی نــەماوە بەرنــەگرێت، ووتــی هــەواڵی دەریاچــەی (طبرية)موسڵمانان پێ بڵێن؟ ووتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ ووتی: ئایا ئاوی تێدایــە؟ ووتمان: ئــاوی زۆرە، ووتــی: ئاوەکــەی هێنــدەی نــەماوە بــڕواو نــەمێنێت. ووتــی: هــەواڵی کانیاوەکەی (زغر)م پێ بڵێن؟ ووتیان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ ووتی: ئایــا کانیاوەکــە ئاوی تێدایەو ئایا خەڵکەکەشی بە ئاوەکەی کشتوکاڵ دەکەن؟ ووتمان: بــەڵێ ئــاوی زۆرە و خەڵکەکەشی کشتوکاڵی پێ دەکەن، ووتی: هەواڵی پێغەمبەری نەخوێنــدەوارەکانم پــێ بڵــێن چی کرد؟ ووتمان لــە (مەکە)وە دەرچووەو لــە(یثرب) واتە (مەدینــە) نیــشتەجێ بــووە. ووتــی: عەرەبەکانی شــەڕیان لــەگەڵ نەکرد؟ ووتمان: با، ووتی: ئەی چــی لــیّ کــردن؟ ئێمــەش پێمــان ووت: زاڵ بوو بەسەر هەموو عەرەبەکانی چــواردەوریدا و ئــەوانیش گوێڕایــەڵ و ملکەچــی بوون. پێی ووتین: جا ئەوە بوو، ووتمان: بەڵێ. ووتی: ئەگەر بەقسەی مــن بکــەن و شــوێنی بکەون خێری خۆیانی تێدایە. منیش وا پێتان دەڵێم من کێم: من (مەسیح)م، وەهێندەم نــەماوە کە ڕێم پێ بدرێت دەرچم، کە دەریش چووم دەگەڕێم بەسەر زەویدا، لــەماوەی چــل شــەودا هیچ گوندو ئاوایەك نامێنێت تێی نەچم، جگە لە (مەکە)و (طیبة) نەبێت، هەردوو کیــانم لــێ قەدەغەکراوە، لــەگەڵ ویستم بچمە یەکێکیانەوە، فریشتەیەك بەرەو ڕووك دێت شمشێرێکی لــە ڕوومدا بەرزکردۆتەوە نلهێڵێت تێــی بــچم، وە لــەســەر هــەر ڕێگەیــەکی فریــشتەیەکی لیــە پاسەوانی دەکەن).

پاشان (فاطمــة ی کــچی قــەیس) ووتــی: ئینجــا پێغەمبــەر(ﷺ) بەدارەکــەی دەســتی کێــشای بەمینبەرەکەداو فەرمووی (ئائەمە طیبةیە، ئائەمە طیبةیە، ئائەمە، طیبةیە) واتە شاری مەدینە ئایــا منــیش هەمان قســەم بۆ نەکردن؟ خەڵکەکەش ووتیان: بەڵێ، ئەویش فەرمووی منیش قسەکەی تەمیمم بەدڵ بوو کەوەك قسەکەی من وابوو کە بۆمکردن دەربارەی دەجال و کەمــە و مەدینــە، ئەوەدەجالــە لــە دەریای شامە یان لــە دەریای یەمەن، نەخێر بەڵکو والــەڕووی ڕۆژهەڵات، ئەو والــەڕووی ڕۆژهەڵات، ئەو والــەڕووی ڕۆژهەڵات، (وە بەدەستی پیرۆزیشی ئیــشارەتی بــەرەو ڕۆژهــەڵات کــرد). (فاطمــة) دەڵێت: ئەم فەرموودەیەم ئاوا لــە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لــەبەر کردووە.

لــەم فەرموودە پیرۆزەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە دەجال خــۆی پرســیاری چــەند نیــشانەیەکی کردووە کەلــە پێش هاتن و دەرچوونیدا دەردەکەوێت، ئەویش ووشك بوونی دەریاچەی (طبريــة)یــە کە دەکەوێتە نێوان سوریاو فەلــەستین و ئەردەنەوە، وە هــەتا ئێــستا هەواڵــەکان بــاس لــەوە دەکــەن کەئیــسرائیل سەرگەرمی دروستکردنی چەند بەنداوێکە لــەسەر ئەو ڕووبارانەی کە دەڕژێنە دەریاچەی

طریەوە بەمەبەستی گرتنەوەی ئاوەکەی و ووشك کردنی دەریاچەکە تا سوریاو ئەردەنی لێ بێبەش بکات و بیکاتە کارتێکی فشار لەسەریان، هەروەها بەرنەگرتنی دارخورماکانی (بیسان) کە دەجال کردویەتی بەنیشانەی هاتنی خۆی، ئەویش دەکەوێتە نێوان سنووری (ئەردەن)و (فلسطین)ەوە، وە (یاقوت الحموی)چەند سەدەیەك لەمەوبەر باس لەوە دەکات کە چەند جارێك بەلای ئەو شوێنە تێپەڕ بووە جگە لە دوور دارخورمای سیس و ووشك بوو هیچی لێ نەماوە[1]

وەکانیاوی (زغر)یش وەك (یاقوت الحموی) باسی دەکات دەکەوێتە دورایی سێ ڕۆژەڕێ لەشاری(قدس)ـەوە بەرەو باشور بۆ دیوی خاکی حیجاز.[2] وە ئەمڕۆ دەکەوێتە نێوان سنوری ئەردەن و فەلەستینەوە، دیارە ئەو شوێنانەی کە دەجال پرسیاری کردوون ئەمڕۆ هەموویان دەکەونە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی جولەکەوە و هەر ئەوانیش هەڵدەستن بە ووشك کردنی ئەو شوێنانەلەپێش هاتنی دەجالدا، کە ئەمەش کارێکی بێ نهێنی نیە کە لەناو ئەو هەموو شوێنەی دومیادا دەجال پرسیاری چەند شوێنێك دەکات کە ئەمڕۆ کەوتۆتە ژێر سنووری دەسەڵاتی ئیسرائیلەوە، دیارە هەر لە کۆنەوە چاوەڕێی دەستی دەست و پێوەندەکانێتی لە ئیسرائیل کە زەمینەسازی بۆ هاتنی بکەن و تەنها ڕووداوەکانی ئەوێشی کردووە بە نیشانە بۆ کاتی دەرچوون و خۆ ئاشکراکردنی.

## ئەو شوێنانەی کە دەجال ناتوانێت تێی بچێت:

(أبو هريره) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿و يأتي المسيح من قبل المشرق وهمته المدينة حتى اذا جاء دبر احد تلقته الملائك فضربت وجهه قبل الشام هنالك يهلك هنالك يهلك﴾[1]، واتە: (دەجال لە ڕووی ڕۆژهەڵاتەوە دێت و مەبەستی یەکەمی شاری مەدینەیە، هەتا کاتێك دەگاتە پێش کێوی (أحد) فریشتەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەویش ڕووی وەردەگێڕێت بەرەو وولاتی شام، لەوێ تیا دەچێت، لەوێ تیا دەچێت).

وە لە چەند فەرموودەی تردا هاتووە کە فریشتەکان پاسەوانی شاری مەدینە دەکەن و ڕێ نادەن دەجال بچێتە ناوی، وە لەڕیوایەتێکی تردا کە هەر (أبو هريره) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] معجم البلدان ياقوت الحموی ج١ ل٥٢٧.

[2] معجم البلدان ياقوت الحموی ج٣ ل١٤٢-١٤٣

[1] رواه الترمذي واحمد. وقال الترمذي: حديث صحيح. وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم (١٧٧١).

فەرموویەتی: ﴿علی أنقاب المدینة ملائکة لا یدخلها الطاعون ولا الدَّجَّال﴾[1]، واتە: (ئـەو ڕێگایانـەی کە بۆ مەدینە دەچن فریشتەی لێیە نە تاعون و نەدەجال ناتوانن بچنە ئەو شارەوە).

هەروەها (أنس ی کوڕی مالـك)یـش ڕەزای خـوای لێبێـت دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا یدخل المدینة رعب المسیح الدَّجَّال لها یومئذ سبعة أبواب علی کل باب ملکان﴾[2]، واتە: (ترساندن و تۆقاندنی دەجال ناچێتە ناو مەدینە، لەو ڕۆژەدا حەوت دەرگای هەیە لەسـەر هـەر دەرگایەك دوو فریشتە وەستاون).

هەروەها شاری (کەمە)ش وەکو (مەدینە) لەسەر دەجال قەدەغە کراوە و ناتوانێت تێـی بـچێت، وەك (انس) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ﴿لیس من بلدین الا سیطؤه الدَّجَّال الا مکة والمدینة ولیس نقب من أنقابهـا الا علیـه الملائکـة صـافین تحرسـها فینـزل بالسبخة فترجف المدینة ثلاث رجفات یخرج الیه منها کـل کـافر ومنـافق﴾[3]، واتـە: (هـیچ شـارێك نامێنێت کە دەجال پێی تێنەخات جگە لە مەکە و مەدینە، لەسەر هەریـەك لـە دەرگاکـانی فریـشتە ڕیزیان بەستووە، پاسەوانی دەکەن، تا دەجال ناچار دەبێت لە (سبخە) دابەزێت مەبەست پێی پارچە زەویەکە کە لماویەو لەبەر سوێری گیای تێدا سەوز نابێت ئیتر شاری مەدینەش سێجار بەخەڵکەکەی ناوی یەوە ڕادەتەکێت و دەلەرزێت، هەرچی بێباوەڕ و دووڕوو هەیە لە شارەکە دەچنە دەرەوە بـۆ لای دەجال).

هەروەها جگە لە شاری مەکە و مەدینەش هەردوو مزگەوتی (بیت المقدس) و مزگەوتی (طور)ی لیّ قەدەغە کراوە کە تێی بچێ، وەك لە فەرموودەیەك هاتووە کە (جنادەی کوڕی ابی امیە الازدی) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: (مـن و پیاوێـك لـە (انـصار)ـەکان چـووین بـۆ لای یـەکێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) پێ مان ووت: فەرموودەیەکمان بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستبێت باسی دەجال تێدا بکات.... لە فەرموودەکەدا دەڵێت: ﴿.... و إنه یمکث في الأرض أربعـین صـباحا یبلـغ فیها کل منهل ولا یقرب أربعة مساجد: مسجد الحرام ومسجد الطـور ومـسجد الأقـصی﴾[4]، واتـە: (........ دەجال چل ڕۆژ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، تیایدا دەگاتە هەموو شوێنێك، بەڵام نزیکی چوار

---

[1] رواه البخاري في صحیحه. فتح الباري (١٠١/١٣).

[2] رواه البخاري في صحیحه. فتح الباري (٩٠/١٣).

[3] صحیحي البخاري و المسلم، و صحیح الجامع برقم (٥٣٠٦).

[4] رواه أحمد وقال الهیثمي رجاله رجال الصحیح، و مجمع الزوائد (٧/٣٤٣) وقال ابن حجر: (رجاله ثقات) وفتح الباري (١٠٥/١٣).

مزگەوت ناكەوێت: مزگەوتی كەعبەو مزگەوتی مەدینـە، مزگـەوتی كێـوی طـوررو مزگـەوتی بیـت المقدس).

## ماوەی مانەوەی دەجال لەسەر زەوی:

سەبارەتی بەمانەوەی دەجال لەسەر زەوی هـەموو فـەرموودەكانی پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەو ڕاسـتیە دووپات دەكەنەوە كە تەنها چل ڕۆژ یا چل شەو لەسـەر زەوی دەمێنێتەوە، بەڵام لەو ماوەیەدا هەموو سەر زەوی دەگەڕێت، هەروەك فەرموودەكەی (فاطمەی كچی قەیس) پێشتر باسمان كـرد كـەدەجال لەسەر زاری خۆی دەڵێت: ﴿.... فأسير في الأرض فلا أدع قريةً الا هبطتها في أربعين ليلـة....﴾[1]، واتە: (لەسەر زەویدا دەگەڕێم، هیچ گوندێك نامێنێت كە تێی نەچم، لە ماوەی چل شەودا).

هەروەها لـە فەرموودەكـەی (جنـادە)شـدا كـە دەڵێـت: ﴿... وإنـه يمكـث في الأرض أربعـين صباحا...﴾[2]، واتە: (چل ڕۆژ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە). بەڵام ئایا ئەو چل ڕۆژە یان ئەو چـل شـەوە وەك شەوانی ئاسایی خۆمان وان؟ یان جیاوازن؟

سەبارەت بەو چل شەو و ڕۆژە لە فەرموودەكەی (نواسی كوڕی سمعان)دا هاتووە كە دەڵێـت: ﴿... قلنا يا رسول الله وما لبثه في الأرض قال أربعون يوما يوم كـسنة ويـوم كـشهر ويـوم كجمعـة وسائر أيامه كأيامكم قلنا يا رسول الله فذلك اليوم الذي كسنة أتكفينا فيه صلاة يوم قال لا أقدروا له قدره قلنا يا رسول الله وما اسراعه في الأرض قال كالغيس استدبرته الـريح﴾[3]، واتـە: (ووتمـان ئـەی پێغەمبەری خوا! ماوەی چەند لەسەر زەوی دەمێنێتـەوە؟ فـەرمووی: چـل ڕۆژ ڕۆژی یەكـەمی وەك ساڵێكە، و ڕۆژی دووەمی وەكو مانگێكە و ڕۆژی سێیەمی وەكو هەفتەیەكەو باقی ڕۆژەكانی تـری وەك ئەم ڕۆژانەی خۆتان وایە، ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ڕۆژەی كەوەك سـاڵێك وایە تەنها پێنج فەرزە نوێژی یەك ڕۆژی تیدا بكەین؟ فەرمووی: نەخێر نەخێر لەسـەر ڕۆژانـی ئاسـایی بیپێـون(واتـە هەرماوەی شەو و ڕۆژێكی ئاسایی پێنج فەرزی تێدا بكـەن). ووتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەی خێراییەكەی لەسەر زەویدا چەندە؟ وەك هەور كە ڕەشەبا پاڵی پێوە بنێت.....).

كەواتە بە پێی ئەم فەرموودە پیرۆزە لەسەرەتا هاتنی دەجالدا پێوانەی شەو و ڕۆژ لەسـەر زەوی تێكدەچێت و لەسەر پێوانەی ئاسایی خۆی نامێنێـت، بـەڵام دواتـر وەك خـۆی لـێ دێتـەوە، ئەمـەو لەفەرموودەكەدا هاتووە كە ڕۆژی یەكـەم هێنـدەی سـاڵێكی لـێ دێـت، وە ڕۆژی دووەم هێنـدەی

---

[1] صحيح مسلم (١٨/٧٨-٨٣)مع شرح النووي.

[2] فتح الباري (١٣/١٠٥).

[3] صحيح مسلم (١٨/٦٥-٦٦مع شرح النووي).

مانگێك وە ڕۆژی سێیەم هێندەی هەفتەیەك، دواتر شەو و ڕۆژ ئاسایی دەبێتەوەو وەكو خۆی لێ دێتەوە، وە لەفەرموودەكەشدا هیچ ئاماژەیەك بەوە نەكراوە كە ئەو ڕووداوە بەهۆی دەجالەوە ڕوودەدات، یان دەجال وادەكات كە پێوانەی شەو و ڕۆژ تێكبچێت، بەڵكو لەو كاتەدا كە دەجال دێت زەوی خۆی بەهۆی كارەساتێكەوە پێوانەی شەو و ڕۆژی تیدا تێكچووە، نەك كارێك بێت كەدەجال ئەنجامی بدات زاناكانیش لە كۆن و تازەدا زۆر قسەیان دەربارەی ئەو مەسەلەیە كردووە و ڕاو بیرو بۆچونی جیاوازیان بۆ لێكدانەوەی هەیە، بۆ نموونە هەندێكیان پێیان وایە كە خوای گەورە هەر بەڕاستی كات درێژدەكات تا وای لێ دێت شەو و ڕۆژی یەكەم هێندەی ساڵێك بێت و، شەو و ڕۆژی دووەم هێندەی مانگێك بێت و، شەو و ڕۆژی سێیەم هێندەی هەفتەیەك بێت، وەك زانای گەورە (ابن ملك) دەفەرموێت. بەڵام (علي القاري) ئەم ڕایەی پێ دروست نییەو دەڵێت ئەگەر وابوایە دەبوو لەو ڕۆژەدا كە هێندەی ساڵێكە تەنها پێنج فەرز نوێژی تێدا بكرایە، چونكە نوێژە فەرزەكان كاتی دیاری كراوی خۆیان هەیە و نابێت لە كاتی تردا بكرێت[1]

وە هەندێكی تریان پێیان وایە كە درێژبوونەوەی شەو و ڕۆژ لەو كاتەدا هۆكەی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی كە دەجال چاوبەست لە خەڵك دەكات و لە ڕێگەی سحرەوە وایان لێ دەكات كە شەوو ڕۆژیان لێ تێك بچێت و نەتوانن لێكیان جیابكەنەوە، كەئەمەش ڕای (عبدالفتاح ابو غدە)یە كە لەپەراوێزەكەیدا بۆ كتێبی (التصريح تواتر في نزول المسيح)دا دەری دەبڕێت[1]

كەئەمەش بۆچونێكی لاوازە، چونكە هەر وەك ئیمامی (نووی) دەڵێت: (زاناكان دەڵێن: ئەم فەرموودەیە ڕووداوێكی ڕاستیە نەك سیحر و خویاڵ بەبەڵگەی ئەوەی جگە لەسێ ڕۆژی یەكەم ڕۆژەكانی تری وەك ڕۆژی ئاسایی خۆمانی لێ دێتەوە)[2] هەروەها مامۆستا (سەعید نورسی) هەوڵی داوە لێكدانەوەیەكی زانستیانە بۆ ئەو ڕووداوە بدۆزێتەوە، دەڵێت: كە دەجال یەكەم جار لە جەمسەری بەستەڵەكی باكوری زەویەوە دێت كەلەوێ شەش مانگ شەوەو شەش مانگیش ڕۆژە، دواتر كەمێك دێتە خوارەوە بۆ ئەو ناوچانەی كە تێدا مانگێك شەوەو مانگێك ڕۆژە دواتر بۆ ئەو ناوچانەی كە هەفتەیەك شەوەو هەفتەیەك ڕۆژ، پاشان دێتە ئەو ناوچانەی خۆمان كە شەو و ڕۆژیان تێدا وەك یەكە[3]

---

[1] المرقات شرح المشكاة للعلامة علي القاري (٥/١٩٥).

[1] التصريح بما تواتر في نزول المسيح للكشميري. تحقيق عبدالفتاح أبو غدة ل١١١

[2] الشرح صحيح مسلم للنووي (١٨/٦٥).

[3] زنجيره نامەكانی سەعید نورسی زنجیرەی (نیشانەكانی ڕۆژی دوایی).

که پێمان وایە ئەو ڕاو بۆچونەش لاوازە، چونکە جیاوازی کات لە ناوچە بەستەڵەکەکاندا ڕووداوێك نیە تایبەت بێت بە سەردەمی دەجالەوە و لەهیچ فەرموودەیەکیشدا ئاماژە بەوە نەکراوە کە دەجال لەوێوە دێت، بەڵام ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ هەوڵ بدەین لێکدانەوەیەکی زانستیانە بۆئەودیاردەیە بدۆزینەوە دەبێت چاوێك بەڕەوتی ڕووداوەکانی پێش هاتنی دەجال بخشێنینەوە، ئەوکاتە پێم وایە بتوانین تا ڕادەیەکی زۆر هۆکاری ئەو دیاردەیەمان بۆ ڕوون بێتەوە و نهێنی ئەوڕووداوەمان بۆ ئاشکرابێت.

وە پێش ئەوەی بێینە سەر لێکدانەوەی ئەو دیاردە سەرسوڕهێنەرە پێویستە تێبینی دوو خاڵی گرنگ بکەین لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ):

**یەکەم**: دیاردەکە لە سەرەتادا زەق و ئاشکراترە، بەڵام دواتر بەرەو تەنك بوونەوەو کەم بوونەوە دەچێت تاوای لێدێت ئاسایی دەبێتەوە و شەو و ڕۆژ وەك جارانی لێ دێتەوە.

**دووەم**: کاتێك کە هاوەڵەکان ڕەزای خوایان لێبێت پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن لەوکاتەدا چۆن نوێژ بکەن ئایا هەر تەنها پێنج فەرز نوێژی تێدا بکەن یاخود چۆن؟ پێغەمبەریش(ﷺ) پێیان دەفەرموێت کە نەخێر بەڵکو(اقدُروا لَهُ قَدرهُ).واتە ماوەی کاتی نوێژەکان لە ڕۆژێکی ئاسایدا بپێون و هەموو (٢٤) سەعاتێك لەکاتی خۆیاندا دووبارەیان بکەنەوە، کەلەمەوە بۆمان دەردەکەوێت نەك تەنها شەو و ڕۆژ لەخەڵکی تێك دەچێت، بەڵکو کاتەکانی ناو شەوو ڕۆژیش کە بە هۆیانەوە نوێژەکان ئەنجام دەدرێن ئەوانیش تێك دەچن و ناتوانرێت لێك جیابکرێنەوە، کە ئەم خاڵەش گرنگی خۆی هەیە لە لێکدانەوەی ئەو دیاردەیەدا، جا لەڕوانگەی زانستەوە تێکەڵ بوونی کات بەشێوازێك کە خەڵکی نەتوانن کاتی نوێژەکان لەیەکتر جیابکەنەوە، بەهۆی یەکێك لەدوو هۆکارەکەوە دەبێت، یان ئەوەیە دەبێت زەوی لە خولانەوە بەدەوری خۆیدا بوەستێت کەئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی نیوەی جیهان بەردەوام ڕۆژبێت و نیوەکەی تریشی بەردەوام شەوبێت کە ئەمەش ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی ڕۆژی یەکەم ساڵێك بێت و ڕۆژی دووەم مانگێك و ڕۆژی سێیەم هەفتەیەك، وە هەروەها فەرمان کردنی پێغەمبەریش(ﷺ) بە پێوانەی کاتی نوێژەکان لەسەر ڕۆژی ئاسایی ئەوە دەگەیەنێت کە کات نەوەستاوەو زەوی لە خولانەوەی خۆی نەکەوتووە، چونکە وەك پێشتر لە بۆچونەکەی (علی القاری)دا هاتبوو نوێژەکان خوای گەورە بەپێی کاتەکان فەرزی کردوون و دەبێت لەکردنیاندا پشت بە خۆرهەڵاتن و ئاوابوونی خۆر ببەسترێت، جا ئەگەر زەوی لە خولانەوە وەستا، کاتیش دەوەستێت و ناتوانرێت پێوانەی کاتیش بکرێت بۆ نوێژەکان، لەبەر ئەوە پێمان وایە ئەم بۆچونە هەڵەیەو زەوی لە خولانەوە ناکەوێت بە دەوری خۆیدا.

کەواتە دەبێت بچینە سەر هۆکاری دووەم کە پێمان وایە ئەمەیان واقعی تر و زیاتر ڕاستی دەپێکێت، ئەویش ئەوەیە کە شەو و ڕۆژ لە ڕاستیدا هەروەك خۆی لەسەردەمی دەجالدا بەردەوام دەبێت هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نایەت لە درێژبوونەوە و کورت بوون، بەڵام هۆکارێکی تر ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی شەو و ڕۆژیان بۆ جیانەکرێتەوە، واتە بەربەستێکی وا بێتە بەردەمیان کەنەتوانن بزانن ئایا شەوە یان ڕۆژ، بەواتایەکی تر خەڵکی سەرزەوی وەك ئەو کەسەیان لێ بێت کە لەبەندیخانەیەکی تاریکدا بەند کراوە نازانێت کەی ڕۆژ دەبێتەوە و کەی شەو دادێت، جا بابزانین چ بەربەستێك هێندە گەورەیە بتوانێت بەری ڕووناکی لەهەموو خەڵکی سەرزەوی بگرێت و بێ ئاگایان بکات لە هاتنی شەوو ڕۆژ.

پێم وایە ئەگەر کەمێك بەووردی و تێفکرینەوە سەرنجی ڕووداوەکانی پێش هاتنی دەجال بدەین، بەتایبەت ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیەی کە لە بەشەکانی پێشوودا بە درێژی باسمان لێ کرد، وەبەشێوەیەکی زانستیانە ئاکامی جەنگێکی لەو جۆرە هەڵبسەنگێنین کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێت: تەنانەت باڵندەش لەئاسمانەوە لە ئاگری ئەو جەنگە قوتاری نابێت و دەکەوێتە خوارەوە و، کوشتارێکی هێندە گەورەی تێدا ڕوودەدات کە دوای شەڕەکە تەنانەت کەس دەسکەوت کۆناکاتەوە و میراتیش بەش ناکرێت، وە ئەو جەنگە کە هەموو وولاتانی ڕۆژئاوا بەشداری تێدا دەکەن دژی لەشکری ئیسلامی هەموو جۆرە چەکێکی کاولکاری تێدا بەکار دەهێنرێت، لە پێش هەمووشیاندا چەکی ئەتۆمی کە لای هەموان ئاشکرایە توانای کاولکاری ئەو چەکە تا چ ڕادەیەکە. بەجۆرێك کە نەك تەنها مرۆڤ و گیانلەبەران دەکوژێت، بەڵکو لەکاتی تەقینەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو چەکە ژینگەی زەویش بە تەواوی تێك دەچێت، بۆیە پێم باشە بۆزانینی ئاکامی جەنگێکی جیهانی لەو جۆرە کە هەموو جۆرە چەکێکی ئەتۆمی و هایدرۆجینی تێدا بەکاربێت بگەڕێینەوە بۆ لای زانایانی پسپۆڕ لەو بوارەدا بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕادەیەك کاریگەری لەسەر ژینەگەی زەوی دەبێت.

تیمێك لە زانایانی ئەمریکا بەسەرپەرشتی زانی پسپۆڕ (برایان تون) هەستان بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە ئاکامەکانی جەنگێکی ئەتۆمی و کاریگەری بەکارهێنانی ئەو چەکانە لەسەر مرۆڤایەتیو ژینگەی زەوی، لەکۆتایدا گەشتنە ئەو ئاکامەی کە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی بەشێوەیەکی زۆرو بەربڵاو دەبێتە هۆی ڕوودانی دیاردەیەك کەناویان نا (زانستی ئەتۆمی)(NUCLEAR) کەبەشی زۆری جیهان دەگرێتەوە. ئەو زانایانە دەڵێن کە لە ئاکامی تەقاندنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو بۆمبە ئەتۆمیانە، بڕێکی ئێجگار گەورە لە خۆڵ و تەپ و تۆز و دوکەڵ و هەروەها تەنی تیشکاوی کە لەو بۆمبانە دەردەچێت بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوەو لەشێوەی

هەوریکی ئەستوری تاریکدا بەری ئاسمان دەگریت و بۆ ماوەی چەندین مانگ سەر زەوی دەبێتە شەوەزەنگ و تاریکستان، هەروەها پلەی گەرما لە چینەکانی سەرەوەی هەوادا زۆر بەرز دەبێتەوە، چونکە ئەو هەورە ڕشە تیشکی خۆر بۆ خۆی گلدەداتەوەو ناهێڵێت بگاتە سەر زەوی، وە بە پێچەوانەشەوە پلەی گەرمی لەسەر زەوی بەڕادەیەك دادەبەزێت کەلە نیوەی سەرەوەی زەویدا دەگاتە (٢٥) پلەی ژێر سفر، کەئەمەش دەبێتە هۆی تیاچونی هەرچی ڕووەك و بەروبومی کشتوکاڵی هەیە لەسەر زەویدا و، دواتریش تیاچوونی مەڕ و ماڵات و ئاژەڵ، وە ئەو خەڵکانەش لەسەرەتای تەقاندنەوەی بۆمبەکاندا نەمردوون و ماون بەشی زۆریان بەهۆی ئەو سەرما و سۆڵەو قات و قڕیەو پیش بوونی ژینگەیەوە تیا دەچن و دەمرن[1]

بەڵێ ئەمە ئاکامی ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیە دەبێت کە لەپێش هاتنی دەجالدا ڕوودەدات، دەجال وەك پێشتر لە فەرموودەکاندا باسمان کرد لە کۆتایی ئەو جەنگەدا دەبێت، کاتێك کەسەرتاپای زەوی شەوەزەنگەو خەڵکی شەو و ڕۆژیان بۆ لێك جیاناکرێتەوە و ماڵ وێرانی و کاولکاری و قات و قڕی و سەرماو سۆڵەو دەرد و نەخۆشی باڵی ڕەشی بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا کێشاوە و ئاسمان بارانی لێ نابارێت و زەوی گیای لێ سەوز نابێت و برسێتی بە جۆرێك زۆر بۆخەڵکی دەهێنێت کە لە پێناو بەدەست هێنانی نانێکدا هەموو جۆرە کارێکی ناشایستە دەکرێت، هەروەك لە ئینجیلی بەرنابادا هاتووە کە ڕاسترینی ئینجیلەکانە کە ئەمڕۆ لەبەر دەستدا بێت و بۆماوەی چەندین سەدە بە نهێنی لە کتێبخانەکەی پاپادا شاردرابووەوە، تا خوای گەورە لەسەر دەستی یەکێك لە قەشەکانی خۆیاندا بەناوی (فرا مرینو) ئاشکرای کرد لەسەدەی شازدەی زاینیدا و دواتریش ئەو قەشەیە پاش خوێندنەوەی ئەو ئینجیلە موسڵمان بوو، لەو ئینجیلەدا هاتووە کەپێغەمبەر عسی صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت باسی قیامەت بۆ قوتابیەکانی دەکات و پێیان دەڵێت: ﴿قبل ان ياتي ذلك اليوم سيحل بالعالم خراب عظيم، وستنشب حرب فتاكة طاحنة، فيقتل الأب إبنه، ويقتل الإبن اباه، بسبب أحزاب الشعوب، ولذلك تنقرض المدن و تصير البلاد قفراً وتقع أوبئة فتاكة، حتى لا يعود يوجد من يحمل الموتى للمقابر بل تترك طعاما للحيوانات و سيرسل الله مجاعة على الذين يبقون على الأرض فيصر الخبز أعظم قيمة من الذهب، فياكلون كل أنواع الأشياء النجسة، يا لشقاء ذلك الجيل الذي لا يكاد يسمع فيه أحد يقول (اخطأت فارحمني يا الله) بل يجدفون بأصوات مخفوفة على المجيد المبارك الى الأبد...﴾[1]، واتە: (پێش ئەوە ڕۆژی قیامەت بێت، جیهان کاولکاریەکی گەورەی بەسەردا دێت، وە

---

[1] حرب النجوم و الحرب العالمية الثالثة. موسى زناد ل١٣٢-١٣٥

[1] انجيل برنابا (فصل٥٣) چاپی یەکەم١٩٠٧

جەنگێکی وێران کەر هەڵدەگیرسێت، تیایدا باوك کوڕی خۆی دەکوژێت و کوڕیش باوکی خۆی دەکوژێت، بەهۆی بەش بەش بوونی گەلانی جیهان لەنێوان خۆیاندا، هەر بەو هۆیەوە شارەکان کاول دەبن و وولاتەکان چۆڵ دەبن و چەندین نەخۆشیی کوشندە بلاودەبنەوە و تا وای لێ دێت کەس نامێنێت جەنازەی مردووەکان بەرێت بۆگۆڕستان، بەڵکو بەجێ دەهێڵرێت و دەبنە خۆراکی گیانلەبەران، وە خوای گەورە برسێتیەك دەنێرێت بۆ ئەوانەی کە ماون لەسەر زەوی تا وای لێ دێت نان نرخی لە ئالتون زیاتر دەبێت، ئیترهەرچی شتی پیس هەیە دەیخۆن، ئای لەنەگبەتیی خەڵکی ئەو سەردەمە کە بەدەگمەن لەیەکێکیان دەبینسێت بلێت (هەڵەم کردووە خوای گەورە لێم خۆش بە) بەڵکو قسەی ناشایستەو ترسناك بە خوا دەڵێن).

بەڵێ دەجال لەسەرەتای ئەو (زستانە ئەتۆمیە)دا دەبێت کەبەشی زۆری جیهانی کردووە بەشەوەزەنگ وە بۆ ماوەی یەك دانە ساڵ خەڵکی خۆری تێدا نابینن، پاشان ووردە ووردە ئەو دوکەڵ و هەورە ڕەشە دەڕەوێتەوە، تا دوای مانگێی تر بۆ جاری دووەم خۆر دەبیننەوە و لەدوای هەفتەیەکی تریش بۆ جاری سێیەم، ئیتر دواتر ئاسمان ڕۆشن دەبێتەوە و خەڵکی دەتوانن شەوو ڕۆژ لێك جیا بکەنەوە. پێشمان باشە لێرەوە دیاردەیەکی هاوشێوە وەبیر موسڵمانان بخەینەوە، بەتایبەتی موسڵمانانی کوردستان و عێراق، ئەویش لەکۆتایی جەنگی کەنداودا بوو کاتێك کەبەشی زۆری بیرە نەوتەکانی عێراق لەساڵی (١٩٩١)دا لەلایەن فڕۆکە جەنگیەکانی هاوپەیمانەکانەوە تەقێنرایەوەو سوتێنرا، هەموو بیرمانە کەچۆن دووکەڵکی ڕەش بۆ ماوەی زیاتر لە هەفتەیەك ئاسمانی لێڵ و تاریك کردبوو، وە جارجارەش کە باران دەباری تەنها ڕەشاوێك بوو لە ئاسمان دەهاتە خوارێ، جا ئەگەر تەقاندنەوەی چەند بیرە نەوتێك ئەو کاریگەریە گەورەی هەبێت، ئایا دەبێت تەقاندنەوەی سەدان بۆمبی ئەتۆمی و هایدرۆجینی زەوی دووچاری چ کارەساتێك بکات؟

لە کۆتایشدا با لەیادمان نەچێت کە(نواسی کوڕی سمعان) لە فەرموودەکەدا دەڵێت پرسیارمان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە خێرایی ڕۆشتنی دەجال لەسەر زەوی چۆنە؟ ئەویش فەرمووی: ﴿كالغَيثِ استَدبَرتهُ الرّيح...﴾ وەك پەڵەهەور کە ڕەشەبای توند پاڵی پێوە بنێت، کە ئەمەش بەڕاستی جوانترین ئاماژەیە بۆ بەکارهێنانی فڕۆکە لەم سەردەمەدا و دەجالیش هەر بەهۆی فڕۆکەوەیە کە دەتوانێت هەموو سەرزەوی بگەڕێت لەو ماوە کەمەدا.

## ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی ( ابن صیاد ):

(ابن صياد) یەكێك بوو لە جوولەكەكانی شاری مەدینە، وە كاتێك كە پێغەمبەر(ﷺ) كۆچی كرد بۆ (مەدینە) هێشتا تەمەنی مندالّ بوو، خۆی ناوی (عبدالله) بوو باوكیشی ناوی (صیاد) یان (صائد)بوو[1]

وە (ابن كثیر) دەگێڕێتەوە كە دواتر موسلّمان بووەو كوڕێكیشی بووە ناوی ناوە (عمار) كەیەكێك بووە لە پیاوچاكەكانی (تابعین)[2] ئەم (ابن صیاد)ـە وەك ئیمامی (ذهبي) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: (بەكوێری و خەتەنەكراوی لەدایك بووە).[3] وە كابرایەكی جادوگەر بووەو وە هەندێجار فالّی دەگرتەوە، جاری وا هەبوو ڕاست دەردەچوو وە جاری وا هەبوو درۆ دەردەچوو، تا وا لەناو خەلّكدا بلاّوبۆوە كە گوایە دەجالە. پاش ئەوەی كە ئەم هەوالّە لەناو خەلّكدا زۆر بلاّو بۆوە گەیشتەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ویستی خۆری ببینێت و تاقی بكاتەوە بزانێت دەجالە یان نا، هەربۆ ئەم مەبەستەش پێغەمبەر(ﷺ) چەند جارێك چووە بۆلای (ابن صیاد) و قسەی لەگەلّدا كردووە، هەروەك (عبدالله كوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە (كە ئیمامی عومەر لەگەلّ پێغەمبەر(ﷺ) و پۆلێك لە هاوەلاّن چوون بۆلای (ابن صیاد) بینیان لە نزیك بینایەكی بەرز لە گەڕەكی (مغالە)ی ئەنصارەكان لەگەلّ كۆمەلّە مندالّێك یاری دەكات، (ابن صیاد)یش نزیك ببوەوە لەتەمەنی بالّغ بوون، هەستی بەخۆی نەكرد هەتا پێغەمبەر(ﷺ) كێشای بە دەستیدا پێی فەرمووی: ﴿أتشهد أني رسول الله﴾، واتە: (ئایا شاهێدی دەدەیت كەمن پێغەمبەری خوام؟) ئەویش سەیرێكی كرد و پێی ووت: شایەتی دەدەم كە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارەكانی، پاشان بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: ئەی تۆ شایەتی دەدەیت كەمن پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەریش(ﷺ) ڕفزی كردوو پێی فەرموو: (أمنت بالله وبرسله) واتە باوەڕم هەیە بە خواو پێغەمبەرەكانی، پاشان لە (ابن صیاد)ی پرسی: (ماتری)؟ واتە چی دەبینیت؟ ئەویش ووتی ڕستگۆیەك و درۆزنێك یەن بۆلام، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ﴿خلط علیك الأمر﴾، واتە: (كارەكەت لێ تێكەلّ بووە)، پاشان پێی فەرموو: ﴿ءاني خأبت لك خبیئا﴾، واتە: (شتێكی نهێنیم لێ شاردوێتەوە بزانم دەزانیت؟)، (ابن صیاد)یش ووتی: (هو الدخ) واتە (شتەكە دوخە)ئەویش پێی فەرموو: (اخسأ فلن تعدو قدرك) واتە: (ترۆ بە قەت لەوە زیاتر نابیت)، ئیمامی عومەریش ڕەزای خوای لێبێت ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە با لەمی بدەم، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: ﴿ان یكنه فلن تسلط علیه، و ان لم یكنه فلا

---

[1] فتح الباري (٣/٢٢٠ و ٦٥/١٦٤).

[2] النهاية/الفتن و الملاحم (ڕۆژهەلاّت/١٢٨) تحقیق د.طه زیني.

[3] تجرید أسماء الصحابة (١/٣١٩) رقم (٣٣٦٦)للحافظ الذهبي.

خير لك في قتله﴾[1]، واته: (ئەگەر دەجال بێت ئەوا ناتوانیت بیكوژیت، ئگەر ئەویش نەبێت خێـر لـە كوشتنیدا نییە).

وە (عبـدالله ی كـوڕی عومـەر) ڕەزای خـوای لێبێـت دەڵێـت: لـەدوای ئـەوە جـارێكی تـر پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (ابی كوڕی كعب) بە نهێنـی ڕۆیـشتن بـۆلای ئـەو دارخورمایـەی كـە (ابـن صیاد)ی لیَ بوو بەمەبەستی ئەوەی كە گوێ لە (ابن صیاد) بگرێت پێش ئەوەی هەستی پێ بكات و بیبینێت، بینیان وا ڕاكشاوەو خۆی داپۆشیوەو لەبەر خۆیەوە وورتە وورتی دێـت، لەكاتـەدا دایكـی (ابن صیاد) پێغەمبـەری(ﷺ) بینـی كـە لـە پـەنا دارخورماكانـدا خـۆی پـەنهان كردبـوو هـاواری لەكوڕەكەی كردو ووتـی: ئـەی صـاف ئـەوە محمـدە(ﷺ)، (ابـن صـیاد)یـش یەكـسەر ڕاپـەڕی، پێغەمبەریش (لو تركته بين)[1] واته: (ئەگەر وازی لیَ بهێنایە بۆمان ئاشكرا دەبـوو دەجالـە یـان نـا). لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كە پێغەمبەر(ﷺ) لەم مەسەلەیەدا وەستاوەو لەلایەن پەروەردگاریشەوە وەحي بۆ نەهاتووە كە ئایا دەجالە یان نا؟!

بەڵام ژمارەیەك لە هاوەڵان ڕەزای خوایان لیَ بێت بە دڵنیاییەوە دەیان گووت كە (ابـن صـیاد) دەجالە. لەوانەش (ئیمام عومەر و عبدالله كوڕیو جابری كوڕی عبدالله و ابو ذری غفاری).

وە (نووی و قرطبي و شەوكانی) لەسەر ئەو ڕایەن كە (ابن صیاد) دەجال بووە، بەڵام (بیهقـي و ابن كثير و ابن تيمية) پێیان وایە كە (ابن صیاد) جادوگەرێكی بچووك بووە نەك دەجالی گەورە.

وە ئەو لایەنەی كە بە دەجالی گەورەی دەزانن ئەو فەرموودانەی پێـشتر بەبەڵگـە دەهێنـنەوە وە دەڵێن كە ئیمامی عومەر لەبەردەم پێغەمبـەر(ﷺ) سـوێندی خـواردووە كـە (ابـن صـیاد) دەجـالی گەورەیەو پێغەمبەریش(ﷺ) لە سوێندەكەی عومەر بێدەنگ بووە[2]

بەڵام ئەو لایەنەی كە بە جادوگەرێكی بچووكی دەزانن و پێیان وانیە كە دەجالی گـەورە بێـت. فەرموودەكەی(فاطمةی كچی قەیس) بەبەڵگە دەهێننەوە و دەڵێن لەو فەرموودەدا بە ئاشكرا هاتووە كە دەجال كۆت و زنجیر كراوە لە یەكێك لە دورگەكانی ڕۆژهەڵات، لەبەر ئەوە ناگونجێت كە (ابن صیاد) كە لەو كاتەدا منداڵ بووە و لە شاری مەدینە ژیاوەو لە هەمان كاتدا ئەو دەجالە بێت كەلـە دورگەكەدا بینراوە.

---

[1] صحيح البخاري (٣١٨/٣مع الفتح).

[1] صحيح البخاري (٣١٨/٣مع الفتح).

[2] صحيح البخاري (٢٢٣/١٣_مع الفتح)و صحيح مسلم (٥٢/١٨-٥٣-مع شرح النووي).

پاشان کۆمەڵە بەڵگەیەکی تر دەهێنینەوە لەسەر ئەوەی کە (ابن صیاد) دەجالی گەورە نییە، بۆنموونە دەڵێن لە فەرموودەکەدا هاتووە کە دەجال کافرە بەڵام (ابن صیاد) لە دوایدا موسڵمان بووە، هەروەها دەجال منداڵی لێ نابێت بەڵام (ابن صیاد) کوڕێکی هەبووە بەناوی (عمارە)، وە دەجال (مکە) و (مەدینە)ی لێ قەدەغەکراوە و ناتوانێت تێی بچێت بەڵام (ابن صیاد) لەمەدینە لەدایك بووە چووەتە شاری مەکەش، وە (ابن صیاد) خۆی لە دوای موسڵمان بوونی زۆر پێی ناخۆش بووە کە خەڵك گومانی دەجالیان پێ دەبرد، بۆیە هەروەك (ابو سەعیدی خودری) ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە کە (ابن صیاد) ئەو نموونانەی سەرەوەی بەبەڵگە دەهێنایەوە کە دەجال نیە، بەڵام دەیووت: سوێند بە خوا من دەجال دەناسم و شوێنی لەدایك بونەکەشی دەزانم و دەشزانم ئێستا لە کوێیە، بۆیە (ابو سەعید) دەڵێت پێم ووت: (تبا لك سائر الیوم)[1]، واتە: (دەگ ئەمڕۆ داماوبیت و خێر لە خۆت نەبینیت).

پوختەی قسە مەسەلەی (ابن صیاد) بە درێژایی مێژوو لەلایەن زانایانی ئیسلام لێکدانەوەو بۆچوونی جیاوازیان لەسەر بووە کە ناتوانین هەمووی لێرەدا باس بکەین، بەڵام بۆچونی شیخ الإسلام (ابن تیمیە)ەمان لەهەمووی پێ ڕاست ترە کە دەڵێت: (مەسەلەی (ابن صیاد) لای زۆرێك لە هاوەڵان بووبوو بە گرفت، بە دەجالی تێدەگەیشتن وە پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەرەتادا لە ئاست مەسەلەکە وەستابوو تا دواتر بۆی ڕوون بووەوە کە دەجال نیە، بەڵکو لە پێری ئەو فالچی و جادووگەرانە بووە کە پەیوەندییان بە شەیتانەوە هەیە، هەر بۆیەش دەچوو تا تاقی بکاتەوە)[2]

## چۆنیەتی خۆپاراستن لە دەجال:

پێغەمبەری پێشەوا (محمد)(ﷺ) چۆن لە ژیاندا هەردەم خەمخۆری هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بووە و بەردەوام ڕێنمایی و ئامۆژگاری پێویستی سەبارەت بە هەموو کێشەو گرفتەکانی ژیان پێشکەش کردوون، بە هەمان شێوەش خەمخۆری ئوممەتەکەی بووە هەتا ڕۆژی قیامەت، وە ئەوەی ڕەزامەندی خواو خۆش گوزەرانی موسڵمانانی تێدابێت لە دوای خۆی بۆی بەجێ هێشتوین تا کەس سەری لێ نەشێوێت و گومڕا نەبێت، وەئەوەی کاری خێربێت بۆی ڕوون کردوینەتەوە وە لەهەموو کارێکی خراپیش ئاگاداری کردوینەتەوە چونکە خۆی کۆتایی پێغەمبەرانەو بە دوای خۆیدا پێغەمبەری تر نایەت و ئاینەکەشی کۆتایی ئاینە ئاسمانیەکانەو ئاینی تری بەدوادا نایەت، هەر بۆیەش

---

[1] صحیح مسلم (١٨/٥١-٥٢)مع شرح النووي.
[2] الفرقان بین أولیاء الرحمن و أولیاء الشیطان ص٧٧.

دوای ئەوەی زۆر بە ئاشکراو ڕوونی هەموو شتێکی دەربارەی فیتنەی دەجال بۆ ڕوون کردوینەتـەوە و پێش وەخت ئاگاداری کردوینەتەوە لێی، بەهەمان شێوەش ڕێنمایی پێویـستی بـۆ بـەجێ هێـشتوین تابتوانین خۆمان لەو فتنە گەورە بپارێزین و زەرەر و زیانمان پێ نەگەیەنێت، لەو ڕێنمایانەش:

١- پەیوەست بوون بە ئیسلامەوەو خۆ چەکدار کردن بە چەکی باوەڕ و ناسینی خوای تاك و تەنها و زانینی ناوو سیفەتە پیرۆزەکانی تا لەو ڕۆژەدا کەس بە دەجال گومڕا نەبێت، وە بـزانین کـە دەجال مرۆڤێکە دەخواو دەخواتەوە و پاشەڕۆی هەیەو خوای گـەورەش پـاك و بێعەیبـە لـەو سیفەتانە، هەروەها دەجال چاوی سەقەت و کوێرە و ئەگەر خوا بوایـە هەڵبەتـە پـێش هـەموو شتێك چاوی خۆی چاك دەکردەوەو نەی دەهێشت خودی خۆی عـەیب داربێـت، وە بـزانین کە هیچ کەسێك خوای گەورە نابینێت تا نـەمرێت، بـەڵام دەجـال هـەموو کـەس بـە کـافرو موسـڵمانەوە دەیبینن.

٢- دوعاو پەناگرتن لە فیتنەی دەجال بەتایبەت لە نوێژدا وەك لە چەندین فەرموودەی (صحیح)دا هـاتووە، هـەروەها (أبـو هريـرە) ڕەزای خـوای لێبێـت دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذا تشهد أحدكم فليستعذ بالله من أربع يقول اللهم إني أعوذ بك مـن عـذاب جهنم ومن عذاب القبر ومن فتنـة المحيـا والممـات ومـن شـرّ فتنـة المسيح الـدَّجَّال﴾[1]، واتـە: (کەیەکێکتان شایەتمانی هێنا لە نوێژدا (واتە لە تەحیاتدا) با دوعا بکات و پەنا بە خوا بگرێـت لە چوار شت: بڵێت خوای گەورە پەنا بەتۆ دەگرم لە عەزابی دۆزەخ وە لە عەزابی گۆڕ، وە لەفیتنەی زیندوبوونەوە و مردن، وە لەخراپەی فیتنەی مەسیحی دەجال).

بۆیە پێویستە موسڵمان ئەم دوعایە بکات لەنوێژدا و لەدوای شایەتمانی تـەحیات هـەوڵ بـدات لەبیری نەچێت، چونکە پیاوچاکانی پێشین زۆر پەیوەست بوون پێوەی، تەنانەت پیاوچاکێکی تـابیعی وەك (ئیمام طاوس) ئەگەر کوڕەکەی لە نوێژدا ئەو دوعایەی لەبیر بکردایە، نوێژەکەی پێ دووبـارە دەکردەوە[2]

٣- لەبـەرکردنی دە ئایـەتی سـەرەتای سـورەتی (الكهـف) و خوێنـدنی ئـەو ئایەتانـە لـە کـاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دەجالدا، هەروەك لە فەرموودە درێژەکـەی (نواسـی کـوڕی سمعـان) دا هاتووە کە تیایدا دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فمن أدركه منكم فليقـرأ عليـه فـواتح

---

[1] صحيح مسلم (٥/٨٧-مع شرح النووي).

[2] صحيح مسلم (٥/٨٩-مع شرح النووي).

سورة الكهف﴾[3]، واتە: (هەر كەسێكتان گەیشت بەدەجال با سەرەتاكانی سورەتی (الكهف)ی بەسەردا بخوێنێت).

وە (أبو الدرداء) یش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿من حفظ عشر آيات من أول سورة الكهف عصم من الدَّجَّال﴾[4]، واتە: (هەر كەسێك دە ئایەتی یەكەمی سورەتی (الكهف) لەبەر بكات، لە فیتنەی دەجال پارێزراو دەبێت).

٤- هەڵهاتن و دوور كەوتنەوە لە دەجال و ئەگەر توانرا پەنا ببرێتە بەر شاری (مەكە) و(مەدینە) چونكە وەك لە فەرموودەكانی پێشوودا باسمان كرد دەجال ناتوانێت بچێتە ناویان، وە پێویستە موسڵمان هەوڵ بدات بەهیچ شێوەیەك بەرەو ڕووی دەجال نەڕوات و خۆی لە بینین و قسەكردن لەگەڵی دا بپارێزێت چونكە وەك لە فەرموودەكەی (عمرانی كوڕی حصین) دا هاتبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿مَن سَمِعَ بالدّجّال فَلْيَنأَ عنه فوالله إنَّ الرَّجُلَ ليأتيه وهو يحسب أنّه مؤمنٌ فيَتَّبِعُهُ ممّا يبعثُ به من الشبهات أو لما يبعثُ به من الشبهات﴾[1]، واتە: (هەركەس هەواڵی هاتنی دەجالی بیست با خۆی لێ لابدات و دوور كەوێتەوە لێی، چونكە سوێند بە خوای گەورە پیاوی وا دێتە لای خۆی زۆر بە ئیماندار دەزانێت كەچی شوێنی دەكەوێت، بەهۆی ئەو كارە گوماناویانەی كە ئەنجامی دەدات).

## ڕووبەڕوو بوونەوەی لەشكری ئیسلام لەگەڵ دەجال:

وەك لە پێشتردا باسمان كرد، لە پێش هاتنی دەجالدا موسڵمانان لەژێر ئاڵای (محمدی مهدی) دا كۆدەبنەوە و لەشكرێكی ئیسلامی توندو تۆڵ و بەهێز پێك دەهێنن و چەند جەنگێكی سەركەوتوو ئەنجام دەدەن و ناوچەیەكی بەر فراوان لە عێراق و حیجاز و شام دەخەنە ژێردەسەڵاتی خۆیان و دواتریش لەدوای جەنگە گەورەكەی كە ڕۆمی تیدا دەشكێت موسڵمانان دەتوانن شاری ئەستامبوڵیش ئازاد بكەن، بەڵام لەو كاتەدا دەجال خۆی و لەشكرەكەی پەیدا دەبێت، سەرەتا لەخوراسانەوە دەردەچێت و بەرەو أصفهان دێت، پاشان لە اصفهان تەواوی هێزەكانی خۆی

---

[3] صحيح مسلم (١٨/٦٥-مع شرح النووي).

[4] صحيح مسلم (٦/٩٢-٩٣-مع شرح النووي).

[1] الفتح الرباني (٢٤/٧٤)، سنن أبي داود (١١/٢٤٢ مع عون المعبود) ومستدرك الحاكم (٤/٥٣١).

کۆدەکاتەوە بەمەبەستی پەلاماردانی لەشکرەکەی ئیمامی مەهدی و ڕووخاندنی ئەو خەلافەتە ئیسلامیە کەتازە دروست بووە.

موسڵمانانیش کە هەواڵی دەرچوونی دەجال دەبیستن دیارە زۆر شپرزە دەبن بەتایبەت کەدەزانن دەجال کێیەو لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەموو شتێك دەربارەی دەزانن، هەربۆیە هێزە ڕزگارکەرەکانی ئەستامبوڵ بەپەلەوبێ دواکەوتن بەرەو ناوچەکانی سەرکردایەتی لەووڵاتی شام دەکشێنەوەو دواتر سەرجەم هێزەکانی لەشکری ئیسلامی لەوێ کۆدەبنەوە.

پاشان سوپاکەی دەجال لە شاری (أصفهان)ەوە بەرەو خاکی خەلافەت بەڕێ دەکەون، وە ئەوخەلکەش کە دێتە ڕێیان دەبن بەدوو بەشەوە، یان ئەوەیە باوەڕی پێدەکەن و شوێنی دەکەون، یان ئەوەیە بەرەو لووتکەی چیاکان هەلدێن هەروەك (ام شريك) ڕەزای خوای لێبێت لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿ليفرنَّ الناسُ من الدَّجّال في الجبال﴾[1]، واتە: (خەلکی لەدەست دەجال هەلدێن بۆ ناو چیاکان).

ئەمەو دەجال دەیەوێت پێش هەموو شوێنێك پەلاماری خاکی حیجاز بەتایبەتی (مەکەو مەدینە) بدات هەتا بەنیازی گڵاوی خۆی ئیسلام لە بنچینەوە ڕیشە کێش بکات و لەسەرچاوەیەکەوە ووشکی بکات، بەڵام کاتێك دەگاتە ئەو خاکە پیرۆزەو دڵنیا دەبێت کە پەلاماردان و کاولکردنی ئەو دوو شارە لەتواناو دەسەڵاتی ئەو دانیەو خوای گەورە فریشتەکانی خۆی لە چوار دەوری ئەودوو شارە داناوەو پاسەوانیی دەکەن هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد، بۆیە بەناچاری ڕووی خۆی و سوپاکەی بەرەو ووڵاتی شام وەردەچەرخێنێت بەمەبەستی هێرش کردنە سەر ئەو لەشکرە ئیسلامیەی کە لەوێ کۆبوونەتەوە، هەروەك لە فەرموودەکەی (أبو هريرە) دا ڕەزای خوای لێبێت هاتبوو کە دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ويأتي المسيح من قبل المشرق و همته المدينة حتى إذا جاء دبر أحد تلقته الملائكة فضربت وجهه قبل الشام هنالك يهلك هنالك يهلك﴾[2]، واتە: (دەجال لە ڕووی ڕۆژهەڵاتەوە دێت و مەبەستی یەکەمی شاری مەدینەیە، هەتا کاتێك دەگاتە پشت کێوی (احد) فریشتەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەویش ڕووی وەردەگێڕێت بەرەو شام، لەوێ تیادەچێت، لەوێ تیادەچێت) بەڵێ دەجال بە خۆی و سوپاکەیەوە ڕوو دەکاتە شام و لەگەڵ لەشکری ئیسلامی دا ڕووبەڕووی یەك دەبنەوە، نواسی کوڕی سمعان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] صحيح مسلم رقم الحديث (٢٩٤٤).

[2] رواه الترمذي وأحمد. وقال الترمذي: حديث صحيح. وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم (١٧٧١).

فەرموویەتی: ﴿إنه خارج خلة بين الشام والعراق فعاث يميناً وعاث شمالاً يا عباد الله فاثبتوا﴾[1]، واتە: (دەجال دێتە ڕێگەی نێوان شام و عێراق بەڕاست و چەپدا خراپەکاری دەکات، ئەی بەندکانی خوا خۆڕاگربن) بەڵێ لەو ڕۆژەدا تەنها لەشکری ئیسلامی بە غیرەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی هەبێت لەگەڵ دەجالدا، هەرچەندە دەشزانن کەلەناوبردنی دەجال لەتوانای ئەواندا نیە، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوادەکات خۆڕاگربن، پاراستنی ئیسلام و ئاڵای جیهادیش باجی خۆی دەوێت، بۆیە بە هەچ نرخێك بێت ڕووبەڕوو بوونەوەی پێویستە، دەبێت بۆ دەجال بسەلمێنرێت کە تەنها ئیسلامە لەڕوویدا دەوەستێت وە هەر تەنها موجاهیدانی ئیسلامیشە کە فێڵ و جادووەکانی دەجال کاریان تێ ناکات و ناتوانێت لە خشتەیان بەرێت، لەو ڕۆژەدا هەروەك ابن مسعود ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت خەڵکی دەبن بە سێ بەشەوە: ﴿يفترقُ الناس عند خروج الدّجّال الى ثلاث فِرَق، فِرقةٌ تتبعهُ، وفرقةٌ تلحقُ بأرض بها منابتُ الشيخ، وفرقة تأخذ بشط العراق يقاتلهم ويقاتلونهُ حتى يجتمع المؤمنون بقرى الشام، ويَبعثونَ طليعةً فيهم فارس فرسهُ أشقر أو أبلق، فيُقتلون فلا يرجع منهم بشر﴾[2]، واتە: (لەکاتی دەرچوونی دەجالدا خەڵکی دەبن بە سێ بەشەوە، بەشێکی شوێنی دەکەون، وە بەشێکی هەڵدێت بۆ ناوچەیەك کە گیاو لەوەڕگای تێدا بێت، وە بەشێکیشی کەنار عێراق دەگرن، دەجال شەڕیان لەگەڵ دەکات و ئەوانیش شەڕی لەگەڵ دەکەن، تاوای لێدێت ئیمانداران لە گوندەکانی شام کۆدەبنەوەو هێزێکی پێشمەرگە ئاڕاستەی دەجال دەکەن، سوارێکیان تێدایە ئەسپەکەی ڕەش و سپییە، ئەو هێزە هەر هەموویان دەکوژرێن و یەك کەسیشیان لێ ناگەڕێتەوە).

بەڵێ ئەو موجاهیدانە خۆیان شەهیدی هەڵدەبژێن و ڕووبەڕووی هێزێك دەبنەوە کە پێشتر سور دەزانن لە دەرحەقی نایەن.

پاشان ئیمامی مەهدی تەواوی هێزەکانی خۆی لەناو شاری (قدس)دا کۆ دەکاتەوە چونکە دڵنیایە کە ئەو شارەش وەك مەکەو مەدینە بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) پارێزراوە لە دەجال، دەجالیش بە خۆی و سوپاکەیەوە گەمارۆی ئەو شارە دەدات و تەواوی ڕێگاکان دەگرێت هەتاهیچ خواردن و یارمەتیەك نەگاتە دەستی موسڵمانان لەو شارەدا، بەو شێوەیە موسڵمانان بەگەمارۆکراوی دەمێننەوە هەتا وای لێدێت برسێتی زۆریان بۆ دەهێنێت و بێ هێزو لاوازیان دەکات و نزیك فەوتان دەبنەوە بۆیە بڕیار دەدەن هەموو یەك دەست دەمەو بەیان هەڵمەت بەرنەسەر سوپاکەی دەجال یا ئەوەیە خوای گەورە سەریان دەخات، یان وەك براموجاهیدەکانی پێشوویان بە پلەی شاهەدەت

[1] صحيح مسلم رقم (٢٩٣٧).

[2] اخرجه الحاكم في مستدركه(٥٩٨/٤)و ابن كثير في الفتن ل١٢٠

دەگەن، (حذیفةی یەمانی) ڕەزای خوای لێبێت سەبارەت بەوموسـڵمانانەی گـەمارۆ دراون دەڵێـت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿... فيقول بعض المؤمنين لبعض: ما تنتظـرون أن تلحقـوا بـأخوانكم في مرضاة ربكم؟ من كان عنده فضل طعام فليعد به علـى أخيـه، صـلوا حـين ينفجـر الفجـر، وعجلـوا الصلاة ثم أقبلوا على عـدوكم...﴾[1]، واتە: (ئیماندارەکان بەیەکتر دەڵێن چاوەڕێی چی دەکـەن؟ بـا ئێمەش بەبراکانی پێشوومان بگەین و ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنین، هەر کەس کـەمێك خـۆراکی پێماوە با بەشی براکەی لێبدات، لەگەڵ بەیاندا نوێـژەکانتان بکـەن و پەلـەی تێـدا بکـەن، پاشـان هەڵمەت بەرنە سەر دوژمنەکانتان....).

بەڵێ دوا بڕیار بڕیاری شەڕەو مەبەستیش تەنها بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی خوایـە و خـوای گەورەش وای ڕەخساندووە ئەو ڕۆژە کۆتایی چل ڕۆژەکەی دەسـەڵات دارێتی دەجال بێت.

**تیاچوونی دەجال:**

دەمەو بەیان لەشکری ئیسلامی گەمارۆ دراو لەناو شاری (قدس)دا خۆیان دەبەسـتن و پـەیمانی مردن بەخوا خۆیان دەدەن پاشان ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن بۆ نوێژی بەیانی، قامەت دەکرێت (محمدی مهدی) پێشەواو سەرکردەیان پێش دەکەوێت بۆ ئیمامەت کردن، ئالەو کاتە پیرۆزەدا خوای گەورە دەروی خێری خۆی دەکاتەوەو بەهانای ئەو کۆمەڵە ئیماندارەوە دەچێت و سەربازێکی تایبەتی خۆی دادەبەزێنێتە سەر زەوی کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵە بۆ ئەو ڕۆژەی هەڵگرتووە، ئەو سەربازەش ئەو پێغەمبەرە خوا ویستە کەدەجال بەدرۆو بوهتان ناوەکەی دزیوە بۆخۆی و لاف و گەزافی خوایەتی پێ لێدەدات بەسەر زەوی دا، ئەو پێغەمبەرەی کەهەرلەسەرەتاوە جوولەکە پیلانی کوشـتنیان داڕشـت، بەڵام خوای گەورە پاراسـتی و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و دواتریش بەوەوە نەوەسـتان و ئاینەکـەیان گۆڕی و لە ڕێگەی جوولەکەیەکی داخ لە دڵەوە بەناوی (پۆلص) کەبەدرۆ خۆی کرد بە مەسیحی ئینجیلیان شێواندو چەند ئینجیلێکی ساختەیان دروست کرد کە تیایدا (عیسا) بە خواو کوڕی خـوا ناو دەبات و لەڕێگەی (قسطنطین)ی پاشای ڕۆمەوە سەپاندیان بەسەر خەڵکی داو بەدرێژایی چەندین سەدە خەڵکانێکی بێ شوماریان پێ گومڕاو سەر لێ شێواو کردو ئەمجارەشیان لەڕێگـەی دەجالـەوە کەسایەتی ئەوپێغەمبەرە بۆ خۆیان دەدزن و لەپەنا ناوی پیرۆزی (مەسیح)دا هەرچی خوا پێی ناخۆشە ئەنجامی دەدەن، بەڵام خوای باڵادەست ئیرادەی وادەبێت کە بۆ دواجار زەوی لە خراپـەو فەسـادی جوولەکە پاك بکاتەوەو پەردە لەسەر گەورەترین درۆو بوختان لەمێژوودا هەڵماڵێت و ڕاسـتیەکان

[1] فتح الباري (٦/٤٥٠) و مسلم (١٨/٦١).

بۆ هەموو جیهان ڕوون بکاتەوە، ئەویش بەدابەزینی مەسیحی حەق و ڕاستی صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت بۆ جاری دووەم لەسەر زەویدا هەتا کۆتایی بەم گاڵتە جاڕیە بهێنێت و بەدەستی خۆی ئەو جادووگەرە بکوژێت کە بەناوی مەسیحەوە لافی خوایەتی لێدەدات و بەهەموو خەڵکی جیهان بسەلمێنێت کە (عیسی) بەندەو پێغەمبەری خوایەو هەرگیز لە غەیری بەندایەتی کردن بۆ خوا هیچ بانگەشەیەکی تری نەکردووە.

بەڵێ لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەداو پێش ئەوەی موسڵمانان نوێژ دابەستن (عیسی)ی پێغەمبەر و بەندەی خوا دادەبەزێتە ناو لەشکری موسڵمانان و بۆ جاری دووەم دەگەڕێتەوە سەر زەوی عیسا لەو ڕۆژەدا دەبێتە گەورەترین مژدەی خێر بۆ ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی کە تاکە کۆمەڵ بوون لەسەرزەویدا ملیان بۆ دەجال شۆڕ نەکردو لە ڕوویدا وەستان و پێیان دەوت تۆ مەسیحی جادوگەری نەك مەسیحی ڕاستی، ئای دەبێت چ ساتەوەختێکی خۆش و پڕ بەرەکەت بێت کاتێك کەئەو موسڵمانە برسی و هیلاك و ئابلۆقە دراوانە بەچاوی خۆیان دەبینن پێغەمبەرێکی پایە بەرز وەك (عیسێ) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە ناویان و دەبێت چ گوڕوتینێك بە ئیمانی ئەو کۆمەڵە موجاهیدە ببەخشێت کاتێك بەچاوی خۆیان دەبینن فەرموودەو بەڵێنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دێتە دی و بەبینینی پێغەمبەر (عیسی) شاد دەبن.

(أبو هريره) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿كيف أنتم إذا نزل ابن مريم فيكم وإمامكم منكم﴾[1]، واتە: (دەبێت لەوکاتەدا کەیف و حاڵتان چۆن بێت کەعیسای کوڕی مەریەم لەناوتاندا دادەبەزێت و پێشەواو سەرکردەشتان لە خۆتانە).

بەڵێ (عیسی) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لەکاتێکدا دادەبەزێت کە (محمدی مهدی) پێشەوای موسڵمانانەو وەستاوە پێش نوێژی بۆ لەشکرەکەی بکات (ابو امامە)شەڕی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿... وإمامهم رجل صالح فبينما إمامهم قد تقدم يصلي بهم الصبح اذ نزل عليهم عيسى ابن مريم الصبح فرجع ذلك الإمام ينكص يمشي القهقري ليتقدم عيسى يصلي بالناس فيضع عيسى يده بين كتفيه ثم يقول له تقدم فصل فإنها لك أقيمت فيصلي بهم إمامهم فإذا انصرف قال عيسى عليه السلام افتحوا الباب فيفتح ووراءه الدجال معه سبعون ألف يهودي كلهم ذو سيف محلي وساج فإذا نظر إليه الدجال ذاب كما يذوب الملح في الماء فينطلق هاربا فيدركه عند باب اللد الشرقي فيقتله فيهزم الله اليهود فلا يبقى شيء مما خلق الله عزوجل يتواري به

---

[1] رواه البخاري (فتح الباري ٤٩١/٦) ومسلم (١٣٦/١٥) ورقم الحديث (١٥٥).

يهودي إلا إنطلق الله ذلك الشيء لا حجر ولد شجر ولا حائط دابة إلا الغرقدة فإنها من شجرهم لا تنطق إلا قال يا عبد الله المسلم هذا يهودي فتعال اقتله﴾[1]، واتـه: (.... پێشەواکەیان کابرایەکی پیاوچاکە، کاتێك کە پێش دەکەوێت بۆ ئەوەی پێش نوێژیان بۆ بکات بۆ نوێژی بەیانی، ئالەوبەرەبەیانەدا عیسای کوڕی مەریەم لەناویاندا دادەبەزێت، پێشەوای موسڵمانەکانیش دەکشێتەوە، دوا بەدوا دێتە دواوە بۆ ئەوەی عیسا پێش بکەوێت پێی نوێژیان بۆ بکات، عیساش دەستی دەخاتە نێوان هەردوو شانیەو و پێی دەڵێت: خۆت پێش بکەوەو پێش نوێژیەکەمان بۆ بکە، چونکە قامەتەکە بۆ تۆکراوە، پاشان پێشەواکەیان پێش نوێژیان بۆ دەکات، کاتێك کە لێدەبنەوە و دەڕوات، عیسا دەڵێت دەرگای شارم بۆ بکەنەوە، کەسەیر دەکەن دەجال لەدوای دەرگا کەوە وەستاوە و حەفتا هەزار جوولەکەی لەگەڵدایە، هەرهەموویان خاوەنی شمشێری ڕازاوەو قەڵغانن، پاشان کە دەجال چاوی بە عسیا دەکەوێت دەتوێتەوە هەروەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، پاشان هەڵدێت، ئەویش لە ئاستی دەرگای (لد) ی ڕۆژهەلات دەیگێڕێتەوەو دەیکوژێت ئینجا خوای گەورە جوولەکە دەبەزێنێت، بەجۆرێك کە هیچ دروست کراوێکی خوا نامێنێت جوولەکە خۆی لەپەنادا حەشار بدات و خوای گەورەش نەهێنێتە قسەکردن، نەبەرد و نەدار و نەدیوار و نەئاژەڵ جگە لەدرای توترك کەلەداری جوولەکەیەو قسە ناکات، دەڵێت ئەی بەندەی موسڵمانی خوا، ئا ئەمە جوولەکەیەو وەرە بیکوژە).

(اللد)یش شارێکی ناسراوە لە فەلەستین لەنزیك شاری (الرملە)وە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فبينما هم يعدون للقتال يسوون الصفوف اذ أقيمت الصلاة فينزل عيسى بان مريم صلى الله عليه وسلم فأمهم فإذا رآه عدو الله ذاب كما يذوب الملح في الماء فلو تركه لاتذاب حتى يهلك ولكن يقتله الله بيده فيريهم دمه﴾[1]، واتە: (لەکاتێکدا کە لەشکری ئیسلامیی سەرگەرمی خۆ سازاندنن بۆ شەڕ ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن، و قامەت دەکرێت بۆ نوێژ، عیسای کوڕی مەریەم صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لەناویاندا دادەبەزێت و پێشیان دەکەوێت بۆ جەنگ، کاتێك کە دوژمنی خوا دەبینێت (مەبەست پێی دەجالە) دەتوێتەوە هەروەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، ئەگەر لێ بگەڕایە بەتەواوی دەتوایەوە تا لەناو دەچوو، بەڵام خوای گەورە بەدەستی ئەو دەیکوژێت و پاشان خوێنەکەشیان پیشان دەدات).

---

[1] صحيح الجامع الصغير (٢٧٦/٦) و رقمه (٧٧٥٢).

[1] صحيح مسلم (٢٢٢١/٤) و رقم الحديث (٢٨٩٧).

بەم جۆرە درۆو بوختانی دەجال ئاشکرا دەبێت کە خوا نەبووەو بەڵکو لەبەر چاوی هەموویانـدا دەکوژرێت و وەك باقی مرۆڤەکانی تر خوێنی لیَ دەڕژێت و دەمرێت، وە جوولـەکەکان هەتا هەتایـە خۆیان و نیـازە گڵاوەکانیـان لـەگۆڕ دەنـرێن و زەویـان لـیَ پـاك دەکرێتـەوەو لاپەڕەیـەکی نـویَ لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هەڵدەدرێتەوە کە تیایدا ئیسلام سەروەر و عیسـای کوڕی مەریەمیش صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت پێشەواو ڕابەرە.

## دابەزینی عیسای کوڕە مەریەم صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت

خوای گەورە لە قورئاندا ئەو ڕاستیەمان زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی بـۆ دووپـات دەکاتـەوە کـە عیسای کوڕی مەریەم صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت بەدەستی جوولـەکەکان نـەکوژراوە، وەك خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن و دیانەکانیش پێی هەڵخەڵەتاون و باوەڕیان پێکـردووە، بـەڵکو خـوای گەورە پاراستویەتی لە دەستی جوولـەکەو هەڵی کێـشاوە بـۆ ئاسمـان وەك لـە سـورەتی (النساء) دا دەفـــەرموێت ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ [1]، واته: (نە کوشتویانەو نە لـە خاچیشیان داوە، بەڵکو کەسێکی تریان بۆ خرایە شێوەی ئەو، وە ئەو کەسـانەش کـە ڕاو بۆچـوونی جیاوازیان هەیە لەسەری هەموویان لیَی بەگومانن، هیچ زانیاریـەکیان دەربـارەی نیـە جگـە لەشـوێن کەوتنی گومان نەبێت، وە دڵنیا نین لەوەی کە بەڕاسـتی کوشـتویانە، بـەڵکو خـوای گـەورە هـەڵی کێشاوەو بەرزی کردۆتەوە بۆلای خۆی، وە خوای گەورە هەر خۆی خاوەن عیزەت و حیکمەتە).

کەواتە (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت نەمردووەو نەکوژراوە بەڵکو خوای گـەورە بە تواناو دەسەڵاتی خۆی خۆی بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان و لە ئـاخر زەمانیـشدا جـارێکی تـر دای دەبەزێنێتەوە سەرزەوی، هـەروەك دەفـەرموێت: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾ [2]، واتـە: (عیـسا صـەلاتو سەلامی خـوای لەسـەربێت نیـشانەیە بـۆ قیامـەت). وە دەشـفەرمووێت: ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ [3]، واتە: (کەسانێك هەن لە ئەهلی کتاب مەبەست پێیان جوولـەکەو دیانە لـە پێش مردنی عیسـادا باوەڕی پیَ دەهێنن). کەئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەشێکی زۆر لەو دیانانەی

---

[1] النساء /١٥٧-١٥٨

[2] الزخرف /٦١

که عیسا به خواو کوڕی خوا تێ‌دەگەن، لە کاتی هاتنە خوارەوەی عیسا بۆ جاری دووەم لــە ئـاخر زەماندا، لەو بیرو باوەڕە پوچەڵەی خۆیان پەشیمان دەبنەوە و باوەڕی پێ دەهێنن کە بەندەی خوایە.

وە لە سورەتی (المائدة) دا خوای گەورە منەت بەسەر عیسادا دەکات و پێی دەفەرموێت:

﴿ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ﴾[1]، واتە: (لەو فەزڵ و موعجیزانەی کـە بـەتۆم بەخـشیوە ئەوەیە کەلەسەر بێشکە قسە لەگەڵ خەڵکیی دەکەیت و هەروەها بە پیریش). هەمووشمان دەزانین کە عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لەتەمەنی (٣٣) ساڵیدا هەڵکێشراوە بـۆ ئاسمـان و پـیر نەبووە، بەڵکو ئەو ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە جاری دووەمی دابەزینی دا بۆ سەر زەوی پیر دەبێت، بۆیە قسە کردنیشی لــە پیریدا وەکـو قـسەکردنی لەسـەر لانـك، خـوای گـەورە بـە موعجیزەی لــە قەڵــەم دەدات، وە لــە فـەرموودەکانی پێغەمبەریشدا(ﷺ) بەدرێـژی باسـی هاتنـە خوارەوەی عیسا کراوە لە ئاسمان و ئەو ڕاستیە دووپات کراوەتەوە، هەروەك (اوس ی کوڕی اوس) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ينزل عيسى بن عند المنارة البضاء شرقي دمشق﴾[2]، واتە: (عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێتە سـەر زەوی لــە ئاسـتی منـارە سـپیەکەی ڕۆژهەڵاتی دیمەشق).

وەلە ئینجیلی (بەرنابا)شدا هاتووە کە عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت بە قوتابیەکانی دەڵێت: ﴿الحق اقول لكم متكلما من القلب، إني أشقر لأن العالم سـيدعوني إلهـا، و علـى أن اقـدم لأجل هذا حسابا، لعمر الله الذي نفسي واقفة في حضرته، إني رجل فان كسائر الناس، على أني و إن أقامني الله نبيا على بيت إسرائيل لأجل صحة الضعفاء وإصلاح الخطاة خادم الله، و أنتم شهداء علـى هذا، كيف أني أنكر على هؤلاء الأشرار الذين بعد إنصرافي من العـالم سـيبطلون حـق إنجيلـي بعمـل الشيطان، ولكني سأعود قبل النهاية، سيأتي معـي أخنـوخ و إيليـا، و نـشهد علـى الأشـرار سـتكون آخرتهم ملعونة﴾[3]، واتە: (بەڕاستی پێتان دەڵێم لە ناخی دڵـمـەوە، لـەرزم لێـدێت و مووچـڕکە بـە گیانمدا دێت، لەبەر ئەوە کە خەڵکی بە خوا ناوم دەبەن، وەلەسەر ئەوە دووچاری لێ پرسینەوە دەبم لە بەردەم خوادا، سوێند بەو خوایەی کە گیانم وەستاوە لە خزمەتیدا من پـاوێکم وەك ئـەو هـەموو خەڵکەی تر، دەفەوتێم و نامێنم، من هەرچەندە کە خوای گەورە بـە پێغەمبـەر نـاردوومی بـۆ مـاڵی ئیسرائیل، لە پێناو لەش ساغی نەخۆش و لاوازەکان و ڕاستکردنەوەی تاوانکاران بەڵام من خزمـەت

[1] المائدة/١١٠

[2] صحيح الجامع الصغير (٣٦١/٦) ورقمه (٨٠٢٥) وقال الألباني صحيح الإسناد.

[3] ءانجيل برنابا (الفصل ٥٢).

کارو بەندەی خوام، وە ئێوەش شایەتن کەمن چۆن بەرەنگاری ئەو تاوانبارانە دەکەم کەلەدوای ڕۆیشتنم لە جیهان ئینجیلە ڕاستەکەم بەتاڵدەکەنەوە و دەیگۆڕن بەکاری شەیتان، بەڵام من لە پێش کۆتایی جیهان دەگەڕێمەوە، ئەخنوخ و ئیلیاش لەگەڵ خۆم دەهێنم، وە شایەتی دەدەین لەسەر ئەو تاوانبارانەی کە دووچاری کۆتایەکی نەفرەت لێ کراو دەبن).

بەڵێ عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە کۆتاییدا دێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەوتاوانبارانە ڕیسواکات کە ئینجیلەکەیان گۆڕیوەو، (عیسا)یان بەخوا ناو بردوە، وە شایەت بێت لەسەر ئەو کۆتاییە نەفرەت لێ کراوەی کە دووچاری دەبن.

## شێوەو ڕوخساری (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت:

(ابن عباس) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿رأيت عيسى وموسى و إبراهيم، فأما عيسى، فأحمر جعد عريض الصدر...﴾[1]، واتە: (عیسا و موسا و ئیبراهیمم بینی، عیسا سورکارێکی قژ لول و سنگ پان بوو).

وە (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ليس بيني وبينه نبي يعني عيسى فإذا رأيتموه فاعرفوه رجل مربوع الى الحمرة والبياض ينزل بين ممصرتين كأن رأسه يقطر وإن لم يصبه بلل...﴾[2]، واتە: (لەنێوان من و عیسادا هیچ پێغەمبەرێك نیە، ئەگەر بینیتان بیناسنەوە، پیاوێکی چوار شانەی باڵا مامناوەندیە، سور و سپیە، لەنێوان دوو بەرگی سوری زەرد باودا دادەبەزێت، سەری دەڵێی ئاوی لێدەتکێت، هەرچەندە تەڕیش نیە).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا عبداللە کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿أراني الليلة عند الكعبة فرأيت رجلا آدم كأحسن ما أنت راء من أدم الرجال له لمة كأحسن ما أنت راء من اللمم قد رجلها فهي تقطر ماء متكئا على رجلين أو على عواتق رجلين يطوف بالبيت فسألت من هذا فقيل المسيح ابن مريم﴾[3]، واتە: (شەوێکیان لە خەونمدا لە ئاستی کەعبە بووم، پیاوێکم بینی ڕەنگ خاکی، بەڵام جوانترین ڕەنگ خاکیە کەلە پیاودا هەبێت، قژە لاجانێکی هەبوو، جوانترین قژە لاجان کە تۆ بینیبێتت، خاوی کردبووەوە بەریدابووەوە، دەتووت ئاوی لێدەتکێت، شانی دادابووە سەر دوو پیاو، یان خۆی دابوو بەسەر شانی دوو پیاودا تەوافی دەکرد بەدەوری ماڵی بەیتدان پرسیارم کرد ئەمە کێیە؟ ووتیان: ئەمە مەسیحی کوڕی مەریەمە).

---

[1] صحيح البخاري (٤٧٧/٦-مع الفتح).

[2] صحيح الجامع الصغير (٩٠/٥)و رقم الحديث (٥٢٦٥).

[3] صحيح البخاري (٤٧٧/٦-مع الفتح) و صحيح مسلم (٢٣٣/٢-مع شرح النووي).

وە (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿.... أقرب الناس به شبها عروة بن مسعود الثقفي﴾[1]، واتە: (نزیکترین کەس کەلە شێوەی عیسا بچێت عروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی یە). کەبەکێك بوو لە هەوەڵە دڵسۆزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و بەدەستی بێ باوەڕەکانی شاری (طائف) شەهیدکرا.

وە (نواسی کوڕی سمعان) ڕەزای خوای لێبێت سەبارەت بە شوێن و چۆنێتی دابەزینەکەی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذ بعث الله المسيح ابن مريم فينزل عند المنارة البيضاء شرقي دمشق بين مهرودتين واضعا كفية على أجنحة ملكين إذا طأطأ رأسه قطر وإذا رفعه تحدر منه جمان كاللؤلؤ فلا يحل لكافر يجد ريح نفسه إلا مات ونفسه ينتهي حيث ينتهي طرفه فيطلبه حتى يدركه بباب لد فيقتله ثم يأتي عيسى ابن مريم قوم قد عصمهم الله منه فيمسح عن وجوههم ويحدثهم بدرجاتهم في الجنة﴾[2]، واتە: (لەو کاتەدا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت، ئەویش لەلای منارە سپیەکەی ڕۆژهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێت، دوو پۆشاکی لەبەر دایە کە بە زەعفەران ڕەنگ کراوە، هەردوو شانی خستۆتە سەر باڵی دوو فریشتە، کەسەری دادەنەوێنێت ئاوی لێدەتکێت، کەبەرزیشی دەکاتەوە، وەك دەنکە مرواری پایدا شۆڕ دەبێتەوە، هیچ کافرێك نیە بۆنی هەناسەی بکات و نەمرێت، وە هەناسەکەشی هەتا چاوی بڕدەکات دەڕوات، شوێن دەجال دەکەوێت، هەتا لە دەرگای (لد)دەیگرێت و دەیکوژێت، پاشان خەڵکانێك یەن بۆلای عیسا کەخوای گەورە پاراستونی لەدەجال ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پایەو پلەپایان بۆدەکات لە بەهەشتدا).

ئەو منارە سپیەش کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەکات لەسەردەمی خۆیدا نەبووە، بەڵام ئەمڕۆ وەکو هاتنەدی موعجیزەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو منارەیە دروست کراوەو دەکەوێتە تەنیشت مزگەوتی (اموي) لەدمشق.

هەروەها لەنزیك شاری (قدس)یشەوە شارێك هەیە بەناوی (اللد) کە لە زاناییان پێیا وایە (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لەوێ دەجال دەکوژێت، بەڵام فەرموودە (صحیح)ەکان زیاتر ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو ڕووداوە لە شاری (دمشق)دا ڕوودەدات.

## (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت حوکم بە قورئان دەکات:

[1] صحيح مسلم (٢/٢٣٧-٢٣٨-مع شرح النووي).

[2] صحيح مسلم (١٨/٦٧-٦٨-مع شرح النووي).

(عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە پاش هاتنە خوارەوەی بۆ سەر زەوی هیچ ئاین و شەریعەتێکی نویّ لەگەڵ خۆی ناهێنێت، بەڵکو حوکم بەشەریعەتی ئیسلام دەکات و دەبێتە یەکێك لە شوێن کەوتوانی محمد(ﷺ) هەر بۆیەش لەکاتی دابەزینیدا نوێژ لەدوای (محمدی مهدی)ەوە دەکات و ڕازی نیە پێش بکەوێت هەروەك (جابری کوڕی عبدالله) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿فينزل عيسى بن مريم عليه السلام، فيقول أميرهم: تعال صل بنا، فيقول: لا، ان بعضكم على بعضكم أمراء، تكرمة الله هذه الأمة﴾[1]، واتە: (.... پاشان عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت، پێشەوای موسڵمانەکان پێی دەڵێت: فەرموو پێش نوێژمان بۆبکە، ئەویش دەڵێت: نەخێر ئێوە پێشەواکانتان لە خۆتان دەبێت، ڕێزێکە خوا لەم ئوممەتەی ناوە).

وە (أبو هريرە) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿كيف أنتم اذا نزل فيكم عيسى ابن مريم فأمكم منكم﴾، واتە: (دەبێت چۆن بێت کاتێك کە کوڕی مەریەم لەناوتاندا دادەبەزێت و بەوەی خۆتان پێشەواییتان دەکات).

(ابن أبي ذئب) کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە بە (ولیدی کوڕی مسلم) دەڵێت: (تدري ما أمكم منكم). واتە: (ئایا دەزانیت بەوەی خۆتان پێشەوایەتیان دەکات مەبەستی پێی چیە؟ ئەویش ووتی: (فأمكم بكتاب ربكم تبارك و تعالى و سنة نبيكم(ﷺ)))[2]، واتە: (پێشەوایەتیتان دەکات بە قورئانەکەی خوای گەورە و سونەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ)).

کەواتە حوکمی عیسا بە قورئان و سونەتی پێغەمبەرە(ﷺ) وەك موسڵمانێك لە ئوممەتی ئیسلام کار دەکات نەك وەك پێغەمبەرێك کە بەرنامەو شەریعەتی تازەی لەگەڵ خۆی هێنابێت.

وە لە فەرموودەیەکی تردا (سحنظلةی أسلمی) دەیگێڕێتەوە دەڵێت گوێم لە (أبو هريرە) بوو ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەری(ﷺ) دەگێڕایەوە کە فەرموویەتی: ﴿والذي نفسي بيده ليهلن ابن مريم بفج الروحاء حاجا أو معتمرا أو ليثنينهما﴾[3]، واتە: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، لە(فج الروحاء)دا کەشوێنێکە لە نێوان مەکە و مەدینە عیسای کوڕی مەریەم تەهلیلە دەکات بۆحەج یان بۆ عەمرە یان هەردووکیان پێکەوە دەکات). کەواتە (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لەدوای پێشەوای موسڵمانانەوە نوێژ دەکات و حەج و عەمرەی مالّی بەیت دەکات و لەگەڵ لەشکری ئیسلامیدا جیهاد دەکات و حوکمیش بە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات.

---

[1] صحيح مسلم (٢/١٩٣-١٩٤-مع شرح النووي).
[2] صحيح مسلم (١٣٧/٤) رقم (١٥٦).
[3] صحيح مسلم (٢٣٤/٨- مع شرح النووي).

## گەڕانەوەی خۆشی و ئاسایش و خێر و فەڕ لەسەردەمی (عیسا)دا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت:

پاش ئەو هەموو ناخۆشی و نەهامەتی و شەڕ و کاولکاری و برسێتیەی دووچاری مرۆڤایەتی بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەتی دبێت لە پاش جەنگە جیهانیە گەورەکەو لەسەردەمی دەجالدا، وە پاش ئەوەی کە دەسەڵاتی کوفری جیهانی ڕیشە کێش دەکرێت و دەجالی جادوو گەر بە دەستی (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت دەکوژێت، ئیسلام وەکو دەسەڵات و حوکم دەگێردرێتەوە گۆڕەپانی ژیان و موسڵمانان دەبنە هێزی یەکەم لەسەر زەوی دا، ئیتر خوای گەورە دەرگای ڕەحم و بەرەکەتی خۆی والآدەکات و خۆش گوزەرانی و ئاسایش و دادوەری بەجۆرێك باڵ بەسەر زەویدا دەکێشێت کە لەمێژوودا مرۆڤایەتی شتی وای بەخۆوە نەبینیوە، (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿طوبى لعيش بعد المسيح، يؤذن للسماء في القطر، ويؤذن للأرض في النبات، حتى لو بذرت حبة على الصفا لنبت، و حتى يمر الرجل على الأسد فلا يضره، ويطأ على الحية فلا يضره، ولا تشاح، ولا تحاسد، ولا تباغض﴾[1]، واتە: (ئافەرین و خۆشی بۆ ژیانێك کە لەدوای مەسیح دێت، فەرمان دەدرێت بە ئاسمان کە ببارێت، وە فەرمان دەدرێت بە زەوی کە سەوز بێت، تەنانەت ئەگەر دەنکە تۆوێك لەسەر بەردی ڕەق بچێنرێت دەڕوێت، وە پیاو بەلای شێردا بڕوات زیانی پێ ناگەیەنێت، وە پێی بنێت بەسەر ماردا زیانی پێ ناگەیەنێت، نەناکۆکی دەمێنێت، نە حەسودی، نە ڕق و قینە).

وە لە فەرموودەکەی (ابو امامه)دا ڕەزای خوای لێبێت هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿... فيكون عيسى ابن مريم عليه السلام في أمتي حكما عدلا وإماما مقسطا يدق الصليب ويذبح الخنزير ويضع الجزية ويترك الصدقة فلا يسعى على شاة ولا بعير وترفع الشحناء والتباغض وتنزع حمة كل ذات حمة حتى يدخل الوليد يده في الحية فلا تضره وتفر الوليدة الأسد فلا يضرها ويكون الذئب في الغنم كأنه كلبها وتملأ الأرض من السلم كما يملأ الإناء من ماء وتكن الكلمة واحد فلا يعبد الا الله و تضع الحرب أوزارها وتسلب قريش ملكها وتكن الأرض كفاثور الفضة تنبت نباتها بعهد آدم حتى يجتمع النفر على القطف من العنب فيشبعهم و يجتمع النفر على الرمان فتشبعهم ويكون الثور

---

[1] حديث صحيح، رواه أبوبكر الأنباري و الديلمي و الضياء، سلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني (٤/٥٥٩) ورقمه (١٩٢٦).

بكذا وكذا من المال وتكون الفرس بالدريهمات...﴾[1]، واته: (عیسای کوڕی مەریەم لە ئومەتەکەمدا دەبێتە حاکمێکی دادپەروەر، و پێشەوایەکی ڕێك و ڕاست، خاچ دەشکێنێت و بەراز سەردەبڕێت و لەناوی دەبات، سەرانە لادەبات، و پارە بەخشین واز لێ دێنێت و ئاماژەیە بۆ پارە زۆر بوون و دەوڵەمەندی خەڵکی دەست لە مەڕو ماڵات و وڵاغ هەڵدەگرێت ئەویش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەئەوەندە زۆر دەبێت خەڵك پێویستی پێ نامێنێت وە دووبەرەکی و ڕق و کینە هەڵدەگیرێت، تەنانەت منداڵ دەست دەخاتە ناو دەمی مارەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، و منداڵ ئازاری شێر دەدات کەچی زیانی پێ ناگەیەنێت، وە گورگ لەناو ڕانە مەڕدا وەکو سەگی پاراستنی لێ دێت، و زەوی پڕدەبێت لە ئاشتی و ئارامی، هەروەك چۆن جام پڕدەبێت لە ئاو، وە خەڵکی هەموو یەك قسە دەبن و غەیری خوا کەسی تر ناپەرسترێت، وە جەنگ و کوشتار کۆتایی پێدێت و نامێنێت، وە (قریش) دەسەڵاتی لێ دەستێندرێتەوە، وە زەوی وەکو دەفری زیوی لێ دێت، وەکو سەردەمی ئادەم ڕووەکی لێ دەڕوێت، بە جۆرێك کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر گۆڵە تریێك کۆدەبنەوەو تێریان دەکات، وە کۆمەڵە خەڵکێك لە سەر هەنارێك کۆدەبنەوەو تێریان دەکان، وە نرخی گایەك بەوەندەو بەوەندە دەبێت، وە نرخی ئەسپ دەبێتە چەند درهەمێك....).

وە لە فەرموودەیەکی تردا کە (أبو هريرە) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿... ويهلك الله في زمانه الملل كلها إلا الإسلام﴾[2]، واتە: (لەسەردەمی عیسادا خوای گەورە هەموو ئاینەکان لەناو دەبات تەنها ئیسلام نەبێت).

وە ئێمەش وەکو موسڵمان باوەڕی تەواومان بەو مژدەو بەڵێنانەی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە کەهەمووی وەك چۆن خۆی باسی کردووە ئاوا دێتە دی، وە دڵنیاشین کە تەنها ئیسلام ڕزگارکەری مرۆڤایەتی و تەنها لە سایەی ئیسلامیشدا ئاشتی و ئاسایش و دادپەروەری دەگەڕێتەوە سەر زەوی، وە داواکارین کە خوای گەورە لەو کۆمەڵە ئیمانداره موجاهیدەمان بگێڕێت کە هاوشانی عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت جیهاد دەکەن و پێغەمبەریش(ﷺ) لە دەرحەقیاندا دەفەرموێت: ﴿صابتان من أمتي، أحرزهما الله من النار، عصابة تكون مع عيسى بن مريم﴾[3]، واتە: (دوو کۆمەڵ لە ئومەتەکەم خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ پاراستونی، کۆمەڵێك غەزای هیندستان دەکەن، وە کۆمەڵێك لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا دەبن).

---

[1] رواه ابن ماجه وابن خزيمة والحاكم بإسناد صحيح. وفي الصحيح الجامع الصغير (٢٧٦/٦) رقم (٧٧٥٢).

[2] صحيح الجامع الصغير (٩٠/٥) رقم (٥٢٦٥).

[3] صحيح الجامع الصغير (٣٥/٤) رقم (٣٩٠٠).

(ئیمام ئەحمەد) و (نسائي) لە (ثوبان)ەوە ڕەزای خوای لێبێت گێڕاویانەتەوە. وە (عیسا) صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە پاش گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی بۆجاری دووەم بۆ ماوەی چل ساڵ حوکم بە ئیسلام دەکات، پاشان وەفات دەکات و دەمرێت، هەروەك (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فيمكث في الأرض أربعين سنة، ثم يتوفى ويصلي عليه المسلمون﴾[1]، واتە: (چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، پاشان وەفات دەکات و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن).

## هاتنی یاجوج و ماجوج

پاش ئەوەی لەسەردەمی (عیسا)دا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە ژێر سایەی ئیسلامیدا خۆشی و هێمنی و ئاسودەیی بۆ سەر زەوی دەگێڕێتەوەو شەڕو کوشتارو خوێن ڕشتن بەتەواوی لەسەر زەوی هەڵدەگیرێت و نامێنێت ویست و ئیرادەی خوا وادەبێت کە مرۆڤایەتی دووچاری تاقی کردنەوەیەکی نوێ بێت لە جۆرێکی تازە کە پێشتر مرۆڤایەتی شتی لەو جۆرەی بەخۆوە نەدیوە کە ئەویش بریتیە لە دەرچوونی یاجوج و ماجوج بۆ سەر زەوی جا پێش ئەوەی بێینە سەر باسی یاجوج و ماجوج بزانین کێنەو لەکوێوە دێن چی دەکەن پێمان باشە ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە باس لە هاتیان دەکەن بهێنین و مانایان بکەین پاشان سەرنج و تێبینی و ڕوونکردنەوەی خۆمانی لەسەر بدەین.

### یەکەم/ یاجوج و ماجوج لە قورئانی پیرۆزدا:

خوای زاناو کاربەجێ لە قورئانی پیرۆزدا لە دوو سورەتدا باس لە یاجوج و ماجوج دەکات:

١- لە سورەتی (الكهف) دا دەفەرموێت: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ

[1] رواه أحمد وأبو داود. قال ابن حجر (صحيح) (٤٩٣/٦) و صحيح الجامع الصغير (٩٠/٥) رقم (٥٢٦٥).

يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي
خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟
حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا
﴿٩٧﴾ قَالَ هَـٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴾ [1]، واتـه: (پرسـيارت لـێ
دەكەن دەربارەی (ذي القرنين)، تۆش بڵـێ باسـێكتان دەربارەيـان بـۆ دەكـەم، ئێمـە توانـاو دەسەڵاتمان پێدابوو لـەسـەر زەوی داو لـەهەموو شـتێك هۆكارمـان پێبەخـشی بـوو * ئـەويش شوێن يەكێك لەو هۆكارانـە كـەوت و بـەكاری هێنـا * هـەتا كاتێـك كـە گەيـشتە شـوێنی خۆرئاوابوونی خۆر * بينی خۆرەكە لەچاوگێكی قوڕە ڕەشدا ئـاوا دەبێـت و لـە ئاسـتی ئـەو شوێنەش كۆمەڵە خەڵكێكی بينی * پێمان ووت ئەی (ذي القرنين) يان ئەوەيە ئازاريان دەدەيت و دەيان كوژيت وەيان چاكەيان لـەگەڵ دەكەيت و بانگەشەيان دەكـەيت بـۆ ڕێی ڕاسـت، ئـەويش ووتـی ئـەوەی كـە زوڵـم دەكـات ئـازاری دەدەيـن و پاشـان دەگەڕێتـەوە بـۆلای. پەروەردەگاری خۆی ئەويش ئازارێكی سەختی دەدات * بەڵام ئەوەی كە باوەڕی هێناو كاری چاكەی كرد، ئەوە پاداشتی باشی هەيەو ئێمەش فـەرمانی كـاری قـورس و گرانـی پێناكـەين* پاشان شوێن يەكێك لەو هۆكارانە كەوت و بـەكاری هێنـا * هـەتا كاتێـك گەيشتە شـوێنی خۆرهەڵاتنی خۆر بينی لـەسـەر كۆمەڵە خەڵكێك هەڵدێت كە هـيچ پۆشـەرێكمان لـەخۆر پـێ نەبەخشيبوون * بەو شێوەيە خەبەرداريش بوون لە هەموو ئـەو زانـست و توانايـەی كـەپێمان بەخشيبوو * پاشان شوێن يەكێك لـەو هۆكارانـە كەوتـەوەو بـەكاری هێنـا * هـەتا كاتێـك گەيشتە نێوان دوو بەربەستەكەو بينی لە پێش دوو بەربەستەكەدا كۆمەڵە خـەڵكێكی لـێ بـە لەقسەتێ ناگەن و حـاڵی نـابن ووتيـان ئـەی (ذي القـرنين) (يـاجوج و مـاجوج ) فەسـاد و خراپەكاری زۆر دەكەن لە زەوی دا * پێت چۆنە ئەگەر ئێمە پارە و سـەرانەيەكت بـۆ دابـين بكەين بەمەرجێك لەنێوان ئێمەو ئەواندا بەرەبەستێك دروست بكـەيت * ئـەويش ووتـی هـەر كارێك خوای پەروەردگارم بۆم ئاسان بكات و يارمەتيم بدات چاك و پڕ خێر دەبێت، ئێوەش بە هێزو تواناتان يارمەتيم بدەن نێوان ئێوەو ئەوان پردەكەمەوە دەی گرم * كەرتـە ئاسـنم بـۆ بهێنن هەتا كاتێك لوتكەی هەردوولا تەنيشتەكەی بەيەك گەياندوو يەكسانی كـردن بەيـەكتر، ووتی كەرتە ئاسنەكان بجۆشێنن و سووری بكەنەوە هەتا كاتێك ئاسنەكەی وەك ئاگر لێ كـرد

[1] الكهف/(٨٣-٩٨).

ووتی (قطر)م بۆ بێنن بەسەریدا بیرژێنم و کەلێنەکانی پێ پڕبکەمەوە * ئیتر نەتوانییان بەسەریدا سەرکەون و زاڵ بن، وە نەتوانیشیان کونە بکەن * ووتی ئەمە ڕەحمەتێکە لە پەروەردگارمەوە، هەرکاتێکیش بەڵێنەکەی پەروەردگارم هات، تەختی دەکات، بەڵێنی پەروەردگاریشم حەق و ڕاستە *).

٢- **خوای گەورە لەسورەتی (الانبیاء)دا دەفەرموێت:** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾ ، واتە: (هەتا کاتێك یاجوج و ماجوج کرایەوە، لەهەموو بەرزایەکی زەوی دینە خوارەوەو بەخێرایی دەڕۆن، وە بەڵێنی حەق و ڕاستی خوا نزیك بووەوە، ئالەو کاتەدا چاوی بێباوەڕان ئەبڵەق بووە دەڵێن ماڵ وێرانی بۆ خۆمان بەڕاستی ئێمە بێ ئاگابووین لەمە، بەڵکو ئێمە زاڵم و ستەمکار بووین).

## دووەم/( یاجوج و ماجوج ) لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) :

١- (ئەبو سەعیدی خودری) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يقول الله تعالى يا آدم فيقول لَبَّيْكَ وسَعْدَيك والخيرُ في يديك فيقول أخرِج بَعْثَ النار قال: وما بعث النار قال: من كل ألفٍ تِسعمَائةٍ وتسعةً وتسعين فعنده يَشيبُ الصغير وتَضَع كلُّ ذات حمل حملها وترى الناس سُكارَى وما هم بسكارَى ولكن عذاب الله شديد قالوا: يا رسول الله، أيُّنا ذلك الواحد؟ قال أبشِروا فإن منكم رجلا ومن يأجوجَ ومأجوجَ ألفاً﴾[1]، واتە: (خوای گەورە دەفەرموێت ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێ بەڵێ بۆ فەرمانت ئەی خوای گەورە و خێریش هەر لەدەستی تۆدایە، خواش دەفەرموێت: ئەوانەی کە دەنێرێن بۆ ئاگر جیایان بکەرەوە، ئەویش دەڵێت: نێردراوەکانی ئاگر کێن؟ دەفەرموێت: لەهەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەد و نۆ، ئالەو کاتەدا منداڵ سەری سپی دەبێت و هەموو ئافرەتێکی سك پڕ سکەکەی دادەنێت و، خەڵکیی دەبینیت سەرخۆشن و هیچیشیان سەرخۆشی مە نین، بەڵام ئازارو تۆڵەی خوا توندە، ووتیان: جا کام لە ئێمە ئەو نەفەرە دەبێت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: مژدە بێت بۆ ئێوە یەك پیاو و لە یاجوج و ماجوج هەزار). مەبەست پێی ئەوەیە هەتا لەم ئومەتە یەك پیاو دەچێتە ئاگر لە یاجوج و ماجوج هەزار دەچێت کەئەمەش ئاماژەیە بۆ بێ باوەڕییان هەروەها بۆ زۆریی ژمارەیان.

---

[1] صحيح البخاري (٦/٣٨٢-مع الفتح).

٢- (ام حبيبه)ی کچی (ابو سفيان) له (زەینەبی کچی جەحش) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە که پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکیان بەترسەوە هاتە ژوورەوە بۆلای و دەیفەرموو: ﴿لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذَا قال وحلق بين إبهامه والتي تليها، قالت زينب بنت جحش فقلت يا رسول الله أنهلك وفينا الصالحون؟ قال نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ﴾[1]، واتە: (هیچ خوایەك نیه تەنها (الله) نەبێت، خاك بەسەر عەرەب لەو ڕووداوە خراپەی کە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ بەربەستەکەی یاجوج و ماجوج ئەمە کراوەتەوە (بەسەری هەردوو پەنجە گەورەو پەنجەی شایەتمانی بازنەیەکی دروست کرد).(زەینەبەی کچی جەحش) دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەناو دەچین لەکاتێکدا کە پیاوانی چاکمان لەناودابێت؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر داوێن پیسی زۆر بوو)).

٣- (ابن حرملە) لە پوریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: ﴿خطب رسول الله(ﷺ) وهو عاصب إصبعه من لدغة عقرب فقال إنكم تقولون لا عدو وإنكم لا تزالون تقاتلون عدوا حتى يأتي يأجوج و مأجوج عراض الوجوه صغار العيون شهب الشعار من كل حدب ينسلون كأن وجوههم المجان المطرق﴾[2]، واتە: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) ووتاری دەداو پەنجەی بەستبوو لە پێوەدانی دووپشکێك فەرمووی: ئێوە دەڵێن دوژمن تەواو بوو نەما، بەڵام لە ڕاستیدا ئێوە بەردەوام دوژمنێکتان دەبێت کە شەڕی لەگەڵ دەکەن هەتا یاجوج و ماجوج دێت، دەم و چاو پان و چاو بچوك، قژی تەپڵە سەریان سپی یەو لە هەموو بەرزاییەکەوە دێنە خوار و شۆڕ دەبنەوە دەم و چاویان هەر دەڵێی قەڵغانە).

٤- (نواسی کوڕی سمعان) ڕەزای خوای لێبێت لە فەرموودەیەکی درێژدا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ثم يأتي عيسى ابن مريم قوم قد عصمهم الله منه فيمسح وجوههم ويحدث بدرجاتهم في الجنة فبينما هو كذلك اذ اوحى الله الى عيسى اني قد أخرجت عبادا لي لا يدان لأحد بقتالهم فحرز عبادي الى الطور ويبعث الله يأجوج ومأجوج وهم من كل حدث ينسلون فيمر اوائلهم على بحيرة طبرية فيشربون ما فيها ويمر آخرهم فيقولون لقد كان بهذه مرة ماء ويحصر نبي الله عيسى وأصحابه حتى يكون رأس الثور لأحدهم خيرا من مائة دينار لأحدكم اليوم فيرغب نبي الله عيسى وأصحابه فيرسل الله عليهم النغف في رقابهم

[1] صحيح البخاري (٣٨١/٦) و صحيح مسلم (٢/١٨-٤-مع شرح النووي).

[2] مسند الإمام أحمد (٢٧١/٥ – وهامشه منتخب الكنز) وقال الهيثمي: رواه أحمد والطبراني ورجالهما رجال الصحيح. مجمع الزوائد(٦/٨).

فيصبحون فرسى كموت نفس واحدة ثم يهبط نبي الله عيسى وأصحابه الى الأرض فلا يجدون في الأرض موضع شبر الا ملأه زهمهم ونتنهم فيرغب نبي الله عيسى وأصحابه الى الله فيرسل الله طيرا كأعناق البخت فتحملهم فتطرحهم حيث شاء الله ثم يرسل الله مطرا لا يكن منه بيت مدر ولا وبر فيغسل الأرض حتى يتركها كالزلفة﴾[1]، واتە: (پاشان کۆمەڵێك خەڵك دێن بۆلای عیسای کوڕی مەریەم کە خوای گەورە پاراستونی لە دەجال، ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پلە و پایەیان بۆ دەکات لە بەهەشتدا، لەو کات و حاڵەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆ عیسا، کەکۆمەڵە بەندەیەکی خۆمم هێناوەتە دەر، کەس توانای دەسەڵاتی کوشتارو شەڕکردنی نیە لەگەڵیاندا، بۆیە هەتا زووە بەندەکانم سەرخە بۆ کێوی (طور)، خوای گەورەش یاجوج و ماجوج دەنێرێت، ئەوانیش لە هەموو بەرزاییەکەوە شۆڕ دەبنەوە، سەرەتاکانیان بەلای دەریاچەی (طبرية)دا تێ دەپەڕێت هەرچیەکی تێدایە دەی خۆنەوە، وە کۆتاییەکەیان تێ دەپەڕێت دەڵێت: کەرەتێکیان ئالێرەدا ئاوی تێدا بوو، جا عیسای پێغەمبەری خواو هاوڕێکانی گەمارۆ دەدرێن، تا وای لێدێت یەك سەر گا بۆ یەکێکیان باشترە لەسەد دینار بۆ یەکێکتان لەم ڕۆژەدا، ئیتر عیسای پێغەمبەری خواو هاوڕێکانی داوای کۆمەك و یارمەتی لە خوای گەورە دەکەن، خوای گەورەش کرمێك دەنێرێت بۆ ملیان، هەر هەموویان بە جارێك وەك مردنی یەك کەس قڕ دەکەن، پاشان عیسای پێغەمبەری خواو هاوڕێکانی دادەبەزنەوە بۆ سەر زەوی، کە سەیر دەکەن یەك بستە خاك نەماوە لەسەر زەوی دا کەبەچەوری و بۆگەنیان پڕ نەبوبێت، ئینجا عیسای پێغەمبەری خواو هاوڕێکانی لە خوا دەپاڕێنەوە، ئەویش جۆرە باڵندەیەك دەنێرێت کە وەك ملی حوشتر درێژن، هەڵیان دەگرێت و فڕێیان دەدات بۆ ئەو شوێنەی کە خوا دەیەوێت، پاشان خوای گەورە بارانێك دەنێرێت کەهیچ خانویەکی دروست کراو نەلەبەرد نەلەمووی ئاژەڵ (خێوەت) ناتوانێت بەری بگرێت، ئیتر بە جۆرێك زەوی دەشوات هەتا وەك ئاوێنەی لێ دەکات).

وەلە ڕیوایەتەکەی (ابن حجر)دا بۆ ئەو فەرموودەیە دەفەرموێت: ﴿قد أنزلت عبادا لي يدان لأحد بقتالهم﴾[1]، واتە: (من کۆمەڵە بەندەیەکی خۆمم دابەزاندوە کەس دەسەڵات و شەڕ کردنی نیە لەگەڵیاندا).

---

[1] صحيح مسلم (٢٢٥٤/٤) ورقمه (٢٩٣٧).

[1] صحيح (٢٥٥٥/٤) رقمه (٢٩٣٧).

٥- (أبو هريره) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن يأجوج ومأجوج يحفرون كل يوم حتى اذا كادوا يرون شعاع الشمس قال لذي عليهم إرجعوا فسنحفره غدا فيعده الله أشد ما كان حتى اذا بلغت مدتهم واراد الله أن يبعثهم على الناس حفروا حتى اذا كادوا يرون شعاع الشمس قال الذي عليهم ارجعوا فستحفرنه غدا انشاء الله تعالى واستثنوا فيعودون اليه وهو كهيأته حين تركوه فيحفرونه ويخرجون على الناس فينشفون الماء ويتحصن الناس منهم في حصونهم فيرمون بسهامهم الى السماء فترجع عليها الدم الذي اجفظ فيقولون قهرنا أهل الأرض وعلون أهل السماء فيبعث الله نغفا في اقفائهم فيقتولهم بها قال رسول الله(ﷺ) والذي نفسي بيده إن دواب الأرض لتسمن وتشكر شكرا من لحومهم﴾[1]، واتە: (یاجوج و ماجوج هەموو ڕۆژێك خەریكی هەڵكەندن (مەبەست پێی بەربەستەكەیە)، هەتا كاتێك كە نزیك دەبێت كە تیشكی خۆر ببینن، ئەوەی بەسەریانەوەیە بۆ كارەكە دەڵێت، بگەڕێنەوە بەیانی هەڵدەكەنین، ئینجا خوای گەورە توندو بتەوتری دەكاتەوە، هەتابەم شێوەیە دەنگەن ئەو كاتەی بۆیان دیاری كراوە، وە خوای گەورە ویستی وابوو بیان نێرێتە سەر خەڵكی دەست دەكەن بەهەڵكەندن، هەتا كاتێك كە نزیك دەبێت كە تیشكی خۆرببینن، ئوەی بەسەریانەوەیە دەڵێت بگەڕێنەوە سبەی هەڵی دەكەنین ئەگەر خوا ڕازی لەسەر بێت و ئەگەری تێ دەخات، ئینجا دەگەڕێنەوە سەری كە دەبینن وەك ئەو ڕۆژەی بەجێیان هێشتووە ماوەتەوە، ئینجا هەڵی دەكەنن و دێنە دەرەوە بۆ سەر خەڵكی، ئیتر ئاو ووشك دەكەن و خەڵكی بۆ خۆپاراستن لێیان لە قەڵاكانیاندا خۆیان قایم دەكەن، ئەوانیش تیرەكانیان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن و تیرەكانیان بەپڕ لەخوێنی دەگەڕێنەوە خوارەوە، ئینجا دەڵێن، خەڵكی سەر زەویمان بەزاندو سەركەوتین بەسەر خەڵكی ئاسمانیشدا، ئینجا خوای گەورە كرمێكیان بۆ دەنێرێت لەپشت ملیاندا، هەموویان بەوە دەمرن، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئاژەڵ و گیان لەبەری سەر زەوی لەگۆشتەكەیان قەڵەو و پڕ و تێرو هەڵئاوساو دەبێت).

---

[1] رواه الترمذي وابن ماجه وابن حبان والحاكم. واسناده صحيح. قال الحاكم (صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي وجاء عند الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم (١٧٣٥) (٣١٣/٤)).

٦- (ابن مسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن يأجوج ومأجوج أقل ما يترك أحدهم بصلبه ألفا من الذرية﴾[1]، واتە: (هەر یەك لە یاجوج و ماجوج کەمترینی نەوەی کەلەدوای خۆی بەجێی دەهێڵێت هەزار وەچەیە لەپشتی خۆی).

پاش ئەوەی کە ئەم ئایەت و فەرموودانەمان هێنا باس لە یاجوج و ماجوج دەکەن، بە پێویستی دەزانم هەندێ سەرنج و تێبینی دەربارەی ئەم کۆمەڵە مەخلوقەی خوای کار بەجێ بخەمە ڕوو.

لەسەرەتادا پێم باشە دوو ڕاستی بخەمە ڕوو، ئەویش ئەویە:

١- نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ئەو ڕووداوانەی کەلەپێش هاتنی ئەو ڕۆژەدا ڕوو دەدەن هەتاهاتنی دەجال دەتوانین بلێین ڕووداوی سروشتی و ئاسایین و پێچەوانەی ئەو یاساو سوننەتانەی خوای گەورە نین لەم بونەوەرەدا کە مرۆڤ پێیان ئاشنا بووە، بەڵام لەگەڵ هاتنی دەجال و ئەو رشووداوانەی کە بەدوایدا دێن، (هەر لەدابەزینی عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە ئاسمان و هاتنی یاجوج و ماجوج و هەڵاتنی خۆر لە ئاواوەو هاتنی (دابە) و ئەو بایەی ڕۆحی ئیمانداران دەکێشێت و .....). دەتوانین بلێین ڕوو داوی ئاسایی نین و بەدەرن لەو یاساو سوننەتە خوایی یانەی کە مرۆڤایەتی لە مێژووی درێژی ژیانیدا پێیان ئاشنا بووە، وەئەم نیشانە گەورانە وەك زۆربەی زانایان دەفەرموون جارێ کۆتایی هاتنی تەمەنی ئەم بۆنەوەوە بەگوێی مرۆڤایەتیدا دەچرن و هەواڵی تێکچوونی شیرازەی ئاسمان و زەوی گشت بونەوەر دەگەیەنن، بۆیە دەڵێن بەڕاستی لێرە بەدواوە دەبێت خۆمان بۆجۆرێکی تر لەو نیشانەو ڕووداوانە ئامادەبکەین کە زۆر نامۆو سەرسوڕهێنەرن و جیاوازن لەونیشانەو ڕووداوانەی کە پێشتر پێیان ئاشنا بووین، وە باوەڕمان وایەو دڵنیاشین کەهەموویان ڕاستن و، وەبەو شێوەیەش کە خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسیان کردوون ئاوا دێنە دی.

٢- ئەو هەواڵ و بەسەر هاتانەی کە خوای گەورە لە سورەتی (الکهف)دا بۆی باس کردوین هەر هەمووی هەواڵ و بەسەر هاتی سەرسوڕهێنەرن هەر لەباسی ئەو کۆمەڵە لاوەی کەبۆماوەی (٣٠٩) دانە ساڵ لە ئەشکەوتێکدا خەویان لێ دەکەوێت و پاشان زیندوودەبنەوەو لە خەو هەڵدەستن هەروەك ئەوەی تەنها شەوێك خەویان لێ کەوتبێت، هەروەها بەسەر هاتی ئەو پیاوەی کە مامۆستایەتی پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك موسا دەکات صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت لە ئاستی دا جۆشی دادەمێنێت و لەحیکمەتەکەی تێ ناگات تا لە کۆتاییدا خۆی

---

[1] رواه ابن حبان في صحيحه (الإحسان ٢٩٢/٨ رقم ٦٧٨٩).

بۆی ڕوون دەكاتەوە، هەروەها بەسەر هاتی پادشایەكی دێرینی وەك (ذي القرنين) كەلەو چەرخە دێرینانەی مرۆڤ تیایدا زۆر دواكەوتوو و كەم زانست بووە كەچی ئەو زۆر بەئاسانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی دەگەڕێت و كاری وا ئەنجام دەدات كە هێشتا مرۆڤی زانای ئەمڕۆش لەتوانایدا نیە، بۆیە دەڵێین بەسەرهاتی یاجوج و ماجوجیش كە لەكۆتایی ئەو سوورەتە پیرۆزەدا هاتووە، ئەگەر وەك ڕووداوێكی نامۆو سەرسوڕهێنەر هاتە بەر چاومان دەبێت لامان ئاسایی بێت و، هەوڵ بدەین بەمێشكێكی كراوەو زانستیانەو لەڕوانگەی ئایەت و فەرموودەكانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تارادەیەكی زۆرنزیك ببینەوە لە ڕاستی.

ئەمەو زاناكانی ئیسلامیش سەبارەت بە یاجوج و ماجوج كۆمەڵێك لێكدانەوەو بیر و بۆچوونی جیاوازیان هەیە، وە بڕێكی زۆریش لە هەواڵی (ئیسرائیلیات) و فەرموودەی (ضعیف) دەربارەیان گێڕدراوەتەوە كە هیچیان جێگەی متمانە نین و ئێمەش لەم كتێبەدا خۆمان لێ دوورە پەرێز گرتووەو پشتمان پێ نەبەستوون، بەڵام زۆربەی زانایان پێیان وایە كە یاجوج و ماجوج لەنەوەی ئادەمن صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت هەروەك (ابن كثير) لەتەفسیرەكەیدا ئامازەی پێ دەكات[1] و فەرموودەی ژمارە(١) یش بەبەڵگەی ڕاستی بۆ چونەكەی دەهێنێتەوە كە خوای گەورە فەرمان بە ئادەم دەكات لە هەموو هەزارێك نۆسەد و نەوەد و نۆ جیا بكاتەوەبۆ دۆزەخ و دواتریش پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆشی هاوەڵانی دەداتەوە بەوەی لە ئومەتەكەی یەك پیاو لە یاجوج و ماجوج هەزار هەرچەندە (كعب الحبار) بۆچونێكی جیاوازی هەیە كە دەڵێت (یاجوج و ماجوج تەنها لەنەوەی ئادەم دروست بوون بەبێ حوا) بەڵام ابن كثير دەڵێت ئەمە قسەیەكە زۆر نامۆیەو هیچ بەڵگەیەكی عەقڵی و نەقڵی لەسەر نیە[2] وە هەندێك لە زاناكان پێیان وایە كە لەنەوەی (یافث) ی كوڕی (نوح) ن صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت، وە بۆ ئەمەش پشت بەو فەرموودەیە دەبەستن كە (أبو هريره) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ﴿ولد نوح سام و حام ويافث، فولد لسام العرب وفارس والروم، وولد لحام القبط والبربر والسودان، وولد ليافث يأجوج ومأجوج والترك والصقالبة﴾[3]، واتە: (كوڕەكانی نوح سیانن، سام حام یافث، سام عەرەب و فارس و ڕۆمی لێ بووە، وە حامیش قبط و بەربەرو سودانی لێ بووە، وە یافثیش یاجوج و ماجوج و تورك و صەقالبەی لێ بووە). بەڵام ئەم فەرموودەیە سەنەدەكەی (ضعیف)ە و ناتواندرێت پشتی پێ ببەسرێت.

---

[1] تفسیر ءابن كثير ج٥ ل٢١٩٣

[2] تفسیر ءابن كثير ج٥ ل٢١٩٣

[3] حديث ضعيف انظر فتح البارى ج١٣ رقم (٧١٣٥).

وه هەندێك لە زانایانی ئەم سەردەمە پێیان وایە كە مەبەست لە یاجوج و ماجوج ئەم میللەتانەیە كە ئەمڕۆ دانیشتووی وولاّتی چین و یابان و مەنغۆلیان، وە پێشیان وایە كە ئەوبەربەستەی كە كاتی خۆی (ذي القرنين) لەبەردەمیاندا دروستی كردووە هەر دەكەوێتە ئەوناوچانەوە تەنانەت (سید قطب)ڕەحمەتی خوای لێبێت لە تەفسیرەكەیدا وای بۆ دەچێت كەیاجوج و ماجوج ئەو مەغۆل و تەتەرانە بن كەكاتی خۆی هێرشیان كردە سەر نیشتمانی ئیسلام و تەخت و تاراجیان تێكدا بەسەر یەكدا[1]

وە (ئیمامي قرطبي)یش كە هاوچەرخی ئەو هێرشەی مەغۆل و تەتاربووە لەتەفسیرەكەیدا هەربۆچونێكی لەوجۆرە هەیە[2] بەلاّم ئەو بۆچونەش پێچەوانەی ئەو ڕاستیەیە كە یاجوج و ماجوج لە ئاخر زەماندا و لەسەر دەستی عیسای كوڕی مەریەمدا صەلات‌و سەلامی خوای لەسەربێت دێنە سەر زەوی و بەپیرۆزی دوعای ئەویش خوای گەورە لەناویان دەبات و فریان دەداتە دەریاوە.

بەلاّم ئێمە پێمان باشە بێنە سەر لێكۆڵینەوەو شیكردنەوەی ئەو ئایەت و فەرموودانەی كە باس لە یاجوج و ماجوج دەكەن و هەوڵ بدەین لە ڕوانگەی ئەوانەوە چەمكێك لە ڕاستیەكانمان بۆ ڕوون ببێتەوە.

## لێكۆڵینەوەو شیكردنەوەی ئایەت و فەرموودەكان:

## یەكەم/ لە ئایەتەكانی سورەتی الكهف دا ئەم چەند ڕاستیەمان بەرچاو دەكەوێت:

---

[1] في ظلال القرآن (٤/٢٢٩٣-٢٢٩٤).

[2] تفسير قرطبي (١١/٥٨).

خوای گەورە تواناو زانست و دەسەڵاتێکی وای بە (ذي القرنين) بەخشیوە کە بۆ هەرکارێك مەبەستی بێت هۆکاری پێویستی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پێ بەخشیوە ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا﴾[1]

١- ئایەتی ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾ کە مانای بەکارهێنانی یەکێك هۆکارو (وسیلە) تابەتانە دەگرێتەوە کەخوا پێی بەخشیوە سێجار دووبارە بۆتەوە، وەهەر جارێکیان لەدوای هاتنی ئەو ئایەت (واتە بەبەکارهێنانی ئەو هۆکارە) (ذي القرنين) توانیویەتی سەفەرێکی دوورو درێژ ئەنجام بدات و پانتاییەکی زۆر گەورە ببڕێت، جاری یەکەم بەهۆی ئەو هۆکارەوە توانیویەتی بگاتە خۆرئاوای خۆر و جاری دووەم پێی گەیشتۆتە خۆرهەڵاتی خۆر وە جاری سێیەم پێی گەیشتۆتە نێوان دوو بەربەستەکە، بۆیە پێویستە بزانین ئەو هۆکارە (سببا) مەبەست پێی چیەو چی دەگەیەنێت، وە پێمان باشە قورئانی پیرۆز خۆی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە چونکە (القرآن يفَسرُ بعضُهُ بعضاً)، واتە: (قورئان هەندێکی هەندەکەی تری روون دەکاتەوە). وە بەچاو پێ داخشاندنەوەیەکی سورەتەکانی قورئان بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم ورشەیە لە چوار سورەتدا هاتووە:

أ- لە سورەتی (غافر)دا: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾[2]، واتە: (فرعەون ووتی ئەی هامان تەلارێکم بۆ دروست بکە بەڵکو بەهۆیەوە بتوانم بگەمە رێگاکان، رێگاکانی ئاسمان، بۆ ئەوەی خواکەی موسا ببینم).

ئیمامی شەوکانی لە تەفسیرەکەیدا لە مانای (اسباب) دا دەڵێت (الطرق) واتە (رێگاکان). وە (قتادە) و (الزهری) و (السدی) و (الاخفش) دەڵێن بەمانای (الابواب) واتە (دەرگاکان)[3]، کەواتە ﴿أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ مەبەست پێی دەرگاکانی ئاسمان یان رێگاکانی ئاسمانە.

ب- ﴿أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ﴾[1]، واتە: (یان پێیان وایە زەوی و ئاسمانەکان و ئەوەی لەنێوانیان دایە مولکی ئەوانە، دەبا بتوانن سەرکەون بەرێگاکانی ئاسماندا).

[1] الکهف/ ٨٤.
[2] غافر/٣٦-٣٧.
[3] فتح القدر للشوکاني ج٤ ل٦٤٦ تحقيق د. عبدالرحمن عيدة.

ئیمامی (الشوكانی) دەڵێت واتە: (فليصعدوا في الأسباب التي توصلهم الى السماء)[2] بەمانای (دەبا سەركەون بەو ڕێگایانەدا یان بەو دەرگایانەدا كە دەیان گەیەنێتە ئاسمان).

ج- لە سوورەتی (الحج)دا ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ﴾[3]، واتە: (هەركەسێ گومانی وایە كە خوای گەورە سەری ناخات لەو دونیاو لە قیامەتدا با پەتێك درێژكاتەوە بۆ ئاسمان و پایەدا سەركەوێت پاشان بیپچرێنێت، ئینجا با سەیربكات بزانێت بەم فێڵە داخی دڵی دادەمركێتەوە).

ئیمامی شەوكانی دەڵێت: (أي يطلب حيلة يصل بها الى السماء)[4]، واتە: (با هەوڵ بدات فێڵێك یان ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە پێی بگاتە ئاسمان).(عبدالرحمن ی كوڕی زیدی كوڕی اسلم) یش دەڵێت (أي ليتوصل الى بلوغ السماء)[5] واتە: (با هەوڵ بدات خۆی بگەیەنێتە ئاسمان).

د- لە سوورەتی (البقرة) دا: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ﴾[6]، واتە: (لەو ڕۆژەدا ئەوانەی كە خەڵك شوێنیان كەوتبوو حەشا دەكەن لەوانەی كە شوێنیان كەوتبوون وە سزای سەختی خوایان بینی، وە هەموو هۆكارەكانیان لێ پچڕا)، واتە هەموو ئەو دەرگایانەی كە دەیان گەیەنێتە ڕەزامەندی خوا لێیان داخراوەو ڕێگەیان لێ پچڕاوە.

كەواتە پاش ئەو گەڕانە بەدوای ووشەی (سبب)یان (اسباب) لە سوورەتەكانی قورئاندا زۆربەڕوونی بۆمان ئاشكرا دەبێت كە ئەم ووشەیە لە قورئاندا پەیوەستە بە ئاسمانەوەو مەبەست پێی ڕێگاكانی ئاسمان یان دەرگاكانی ئاسمان یان هەر هۆكارێك كە بتوانیت پێی بگەیتە ئاسمان، بۆیە پێم وایە ئێمەش شتێكی تازە بابەت ناهێنین ئەگەر بڵێین (فاتبع سببا) مەبەست پێی هۆكارێكە كە (ذي

---

[1] ص/١٠

[2] فتح القدير ج ٤ل٥٥٥.

[3] الحج/١٥

[4] فتح القدير ج٣ ل٦٠١.

[5] تفسير ابن كثير ج٥ ل٢٣٦٧

[6] البقرة/١٦٦

القرنين) بەکاری هێناوە بۆ هات وچۆکردن لە ئاسماندا و بەهۆشیەوە توانیویەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بکات.

٣- کاتێك کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ ﴾ ، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ ﴾ ، پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە خوای گەورە دەفەرموێت (بلغ) واتە گەیشتۆتە ئەو جێگایە: مەبەستیشمان پێی ئەوەیە کە مرۆڤ لەهەر شوێنێکی زەوی دا بوەستێت دەتوانێت خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون ببینێت، بۆیە (ذي القرنين) تەنها ئەوەندە نیە خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوونی بینیبێت، بەڵکو خوای گەورە پێمان دەڵێت کە گەشتۆتە ئەو جێگایەی کەبەڕاستی خۆری تێدا ئاوا و وون دەبێت پاشان ئەو جێگایەی کە خۆری تێدا هەڵدێت و دەردەکەوێت چونکە (مغرب و مطلع) دوو (اسم مكان)نیشانەکانی واتە ناوی شوێنن، پاشان کاتێك سوورەتەکەی باس لەوە دەکات کە لەشوێنی هەڵاتنی خۆرەکەدا (ذي القرنين) کۆمەڵە خەڵکانێك دەبینێت، (وَجَدَها تطلُعُ عَلَى قَومٍ لَم نَجعَل لَهُم مِن دُنِها سِتراً) واتە (هیچ شتێك نیە لە تیشکی خۆرەکەیان لەسەر لابدات و دایان پۆشێت) هەندێك لە زاناکان دەڵێن مەبەست پێی ئەوەیە کە هیچ جل و بەرگێکیان لەبەردا نیە دایان پۆشێت لە تیشکی خۆر، وە هەندێکی تریان دەڵێن واتە شوێنەکەیان دەشتێکی تەخت بووەو شاخ و دار و بەردی تێدا نەبووە سێبەریان بۆ بکات و هەندێکی تریان دەڵێن واتە خانووماڵیان نەبووە بچنە ناوی، بەڵام (محمد متولي شعراوي) بۆچونێکی جیاوازی هەیە کە پێ دەچێت لە هەموو بۆچونەکانی تر زیاتر نزیك بێت لە ڕاستیەوە ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت (ئەوشتەی کە دەبێت بە پۆشاك و بەربەست لەبەردەم خۆردا نەجل و بەرگەو نەخانوو بەرەیەو نەشاخ و داریشە بەڵکو ئەوپۆشەرە تەنها تاریکاییە).[1]

بەڵێ ئەو شوێنەی کە خوای گەورە بە (مطلع الشمس) ی ناو دەبات و (ذي القرنين) ئەوکۆمەڵە خەڵکەی تێدا بینیوە شوێنێك بووە کە شەو و تاریکایی نەبووە بەڵکو بەردەوام ڕۆژ بووە و تیشکی خۆر لێی داون، هەرچەندە کە (متولي الشعراوي) وای بۆدەچێت کە شوێنەکە یەکێك لەدوو جەمسەرەکەی باکور یان باشووری زەوی بێت، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ کام لە دووجەمسەرەکەی باکور باشوری زەوی ئەم سیفەتەی تێدا نیە کە بەردەوام ڕۆژ بێت و تاریکی بەسەردا نەیەت، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەو دوو جەمسەرەدا تەنانەت لەو دوو کاتانەشدا کە ڕۆژ

---

[1] معجزة القرآن للشيخ محمد متولي السعراوي.

بەهۆی هەور و بەفر بارینەوە زۆر بەکەمی تیشکی خۆر لە زەوی دەدات، بۆیە پێمان وایە ئەنەوشوێنەی کە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی تێدا دەژین و بەردەوام ڕۆژەو شەوی تێدا نیە لەسەر زەوی بێت، وە ئەمەبەستیش بە (مطلع الشمس) و (مغرب الشمس) یش سەر زەوی یە، بەڵکو (ذي القرنين) لە کاتی گەشتە ئاسمانیەکەیدا ئەو شوێنانەی دیوەو بەو خەڵکانە گەیشتوە، بەڵێ لەوانەیە ئەم بۆچونە ئارادەیەك سەیرو تازە بێت و خەڵکانێکی زۆریش باوەڕی پێ نەکەن بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەگەر کەسێك باسی ئەوەی بکردایە کە لەماوەی چەند سەعاتێکی کەمدا بەهۆی فڕۆکەیەکەوە دەتوانیت بەدەوری زەوی دا بخولێیتەوە یان لەماوەی چەند ڕۆژێکدا دەتوانیت بچیتە سەرمانگ خەڵکی گاڵتەیان پێدەکردو عەقڵیان قبوڵی نەدەکرد بەڵام لای خەڵکی ئەمڕۆ کارێکی زۆر ئاسایەو هەموو کەس باوەڕی پێیەتی بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵە نزیکەکانی قسەیەکیان بۆ خەڵك نەکردووە کەلەڕادەی تێگەیشتنی عەقڵیان بەدەربێت بەڵکو بەشێوازێك بۆیان ڕوون کردونەتەوە کەلێی تێگەن، ئەوەتا ئیمامی عەلی کاتێك کە پیاوێك پرسیاری دەربارەی (ذي القرنين) لێ دەکات (كيف بلغ المشارق والمغارب؟) واتە (چۆن توانیویەتی بگاتە خۆرهەڵاتەکان و خۆرئاواکان؟) ئیمامی عەلیش بەزمانی خۆی وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێت ﴿سبحان الله، سخر له السحاب، وقدّر له الاسباب، وبسط له اليد﴾[1]، واتە: (پاکی و بێ عەیبی بۆخوا، هەوری بۆ موسەخەر کرابوو، وە هۆکاری بۆ ئاسان کرابوو، وە دەسەڵاتیشی پێ بەخشرابوو).

لێرەدا ئیمامی عەلی ڕاستیەکە دەدرکێنێت بەڵام بەشێوازێك کە لەگەڵ عەقڵی سەردەمی خۆیدا بگونجێت دەڵێت(هەوری بۆ موسەخەر کرابوو) هەروەك چۆن کاتێك کە پرسیاری خێرایی هاتو چۆی دەجالیان لەسەر زەوی دا لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد فەرمووی: ﴿كالغيث استدبرته الريح﴾[2]، واتە: (خێرایی هاتوچۆکەی وەکو هەور وایە کە بایەکی توند پاڵی پێوە بنێت) ئێمە ئەمڕۆ دەزانین کە مەبەستی پێی بەکارهێنانی فڕۆکەیە بەڵام خەڵکی ئەو کاتە لە فڕۆکە حاڵی نەدەبوو، بۆیە بەو شێوازە بۆیان باس دەکات، هەر بۆیە معاویەی کوڕی ابو سفیانیش بەسەرسوڕمانەوە بە (كعب الاحبار) دەڵێت (أنت تقول أن ذا القرنين كان يربط خيله بالثريا) واتە: (تۆ دەڵێیت کە (ذا القرنين) وڵاخەکەی خۆی بە ئەستێرەی (ثريا) وە دەبەستەوە!؟) (كعب)یش لە وەڵامدا ووتی ﴿إن كنت

---

[1] تفسير ابن كثير ج٥ ل٢١٨٩.

[2] صحيح مسلم (١٥/٦٥-٦٦مع شرح النووي).

قلت ذاك فإن الله تعالى قال وآتينه من كل شيء سبباً﴾[1]، واتـه: (ئەگـەر وام ووتبێـت ئـەوە شـتێكی سەیر نیە چونكە خوای گەورە دەفەرموێت بۆ هەر شتێك هۆكارێكمان پێ بەخشیوە كە بیگاتێ).

كەواتە (كعب الاحبار)یش كە پیاوێكی زانابووە بە كتێبە ئاسمانیە پێـشینەكان قەناعـەتی وابـووە كە(ذا القرنین) توانیویەتی هاتوچۆی نێوان ئەستێرەكان بكات بەهۆی ئەو تواناو زانستەی كە خـوای گەورە پێی بەخشیوە.

٤- پاش ئەوەی كە (ذا القرنین) گەشتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا تەواو دەكات ئەم جـارە گەشـتێكی تر دەكات تا دەگاتە نێوان دوو بەربەست، زۆربەی زاناكانیش ئەو دوو بەربەستە بە دووچیای بڵند مانا دەكەن و دەڵێن كە (ذي القرنین) نێـوان دوو چـیاكەی پڕكردۆتـەوەو بەربەسـتێكی توندوتۆڵی دروست كردووە تا یاجوج و ماجوج نەتوانن لێی بپەڕنەوەو خراپەو فەساد لەسەر زەوی دا بكەن، ئایەتەكە دەفەرموێت ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمًا ﴾ واتـه: (كاتێك كە گەیشتە نێوان دوو بەربەستەكە بینی لە پێش دووبەربەستەكەدا كۆمەڵە خـەڵكێك هەن) بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و تێبینی یە داواكاری ئەو كۆمەڵە خەڵكەیە لە (ذي القرنین) كە پێی دەڵێن ﴿ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدًّا ﴾ واتە (یاجوج و ماجوج خراپەكاری و فەسادیەكی زۆر دەكـەن لەسـەر زەوی دا، جـا ئەگـەر قبوڵت بێت پارەو سـەرانەیەكت بـۆ كۆبكەینـەوە هـەتا لـەنێوان ئێمـەو ئەوانـدا بەربەسـتێك دروست بكەیت) دیارە ئەو كۆمەڵـە خەڵكـە لەسـەر زەوی بـوون و توانـاو دەسـەڵاتی (ذي القرنین) یشیان بینیوە بۆیە لێی ڕادەبینن كە بتوانێـت ئـەو كارەیـان بـۆ ئـەنجام بـدات، بـەڵام داواكاریەكەیان لە (ذي القرنین) بۆ دروست كردنی بەربەسـتێك ئـەوە دەگەیـەنێت كـە ئـەو كۆمەڵە خەڵكە ئاگادار نەوون كە لەنێوان ئەوان و یاجوج و ماجوج دا دوو بەربەسـت هەیـە چونكە ئەگەر بیانزانیبایە كە لەنێوان ئەوان و یاجوج و ماجوج دا دوو بەربەسـت هەیـە داوای دروست كردنی بەربەستێكیان لێ نەدەكرد، بـەڵام (ذي القـرنین) لەبـەر ئـەوەی كـە خـۆی لەنێوان دوو بەربەستەكەوە هاتووە بۆلایان دەزانێت پێویست بەدروست كردنی بەربەستی تـر ناكات بەڵكو پێویستە كەلێنی نێوان دوو بەربەسـتەكە پـڕ بكرێتـەوە چـونكە لـەو كەلێنـەوە یاجوج و ماجوج دەپەڕنەوەو زیان بەخەڵكی دەگەیەنن بۆیە پێیان دەڵێت (اجعل بینكم و بینهم ردما) واتە: (پڕدەكەمەوەو دەیگرم، لێرەدا دەڵێین ئەگەر ئەو دوو بەربەستە مەبەست پێـی دوو

[1] تفسير ابن كثير ج٥ ل٢١٨٩.

چیای گەورەبێت ماقوڵ نیەو ناگونجێت کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئەو دوو چیا بەرزەیان لەنێوان خۆیان و یاجوج و ماجوج دا نەبینیبێت و هەستیان بەبوونی نەکردبێت بۆیە پێمان وایە ئەو دوو بەربەستە مەبەست پێی دوو چیا نیە بەڵکو هەروەك (ابن الاعرابی) دەڵێت (کل ما قابلك فسدّ ما وراءه فهوسد))[1]، واتە: (هەر شتێك بێتە بەر دەمت و دوای خۆیت لیّ بگرێت ئەوا پێی دەوترێت بەربەست). هەروەها ئەگەر ئەو بەربەستە تەنها مەبەست پێی پڕکردنەوەی نێوان دوو چیا بوایە، ماقوڵ نیە قەومێکی بەتوانای وەك یاجوج و ماجوج نەتوانن بەسەریدا سەربکەون، یاخود نەتوانن بەسەر چیاکاندا سەربکەون و بپەڕنەوە، یاخود هیچ ڕێگایەکی تریان دەست نەکەوێت کە پێی بپەڕنەوە بۆ ئەو دیوی چیاکە.

## دووەم/ لە ئایەتەکانی سوورەتی (الانبیاء) یشدا تێبینی ئەم خاڵانە دەکەین:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾ واتە: (لەگەڵ کردنەوەی بەربەستەکەی یاجوج و ماجوج دا ئیتر لە هەموو بەرزاییەکەوە بەخێرایی شۆڕدەبنەوە، چونکە ووشەی (حدب) بەمانای بەرزایی دێت یاخود بەزەویەك دەوترێت کە بەرزبێت، کە ئەمەش بەڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە یاجوج و ماجوج لەبەرزاییەوە شۆڕ دەبنەوەو دادەبەزن کە ئەمەش بۆچوونی هەندێك کەس ڕەت دەکاتەوە کە پێیان وایە یاجوج و ماجوج لە ژێر زەوی دا یان لە دوکەلێکی قوڵدا گەمارۆ درابن).

٢- هەر لەو ئایەتە پیرۆزەشەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لەگەڵ کردنەوەی بەربەستەکەدا یاجوج و ماجوج تەنها لەیەك لاو تەرەفەوە نایەن بەڵکو لەگەڵ کردنەوەی بەربەستەکەدا لە هەموو بەرزاییەکەوە دێنە سەرزەوی و بڵاو دەبنەوە.

٣- پاش ئەوەی کە خوای گەورە باسی کردنەوەی بەربەستەکەو دابەزینی یاجوج و ماجوج دەکات بە دوایدا دەفەرموێت:﴿ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ واتە: (ئیتر بەڵێنە ڕاستەکەی خوا کە ڕۆژی قیامەتە نزیك دەبێتەوە، هاوکاتیش چاوی بێباوەڕان بەرەو سەرەوە ئەبلەق دەبێت).

هەندێك لە زانا بەڕێزەکان پێیان وایە کە ئەم ئایەت باس لەڕۆژی دوایی دەکات، بەڵام خوای گەورە نەی فەرمووە (وجاء الوعد الحق) یان (ووقع الوعد الحق) بەڵکو فەرموویەتی (واقترب الوعد الحق) واتە لەو کاتەدا قیامەت نزیك دەبێتەوە نەك قیامەت دێت، کەواتە ئایەتەکە باس لە کاتێك

---

[1] فتح القدیر ج٣ ل٤٢٩.

دەكات كە قیامەت نزیك بۆتەوە بەڵام هێشتا نەهاتووە، مەبەستیشمان لەو ڕوونكردنەوەیە ئەوەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا هِىَ شَٰخِصَةٌ أَبْصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ ئەو (إذا)یە لەو جێگەیەدا لە زمانی عەرەبی پێی دەوترێت (إذا الفجائیة) واتە (كت و پڕ لەو كاتەدا) یان (هاوكات لەگەڵ ئەودا) چاوی بێباوەڕان بەرەو سەرەوە یان بەرەو ئاسمان ئەبڵەق دەبێت، واتە (كە بەربەستەكە كرایەوە یاجوج و ماجوج لە هەموو بەرزاییەك هەتنە خوارەوە و قیامەت نزیك بۆوە، ئا لەو كاتەدا چاوی كافرو بێ باوەڕەكان بەرەو ئاسمان ئەبڵەق دەبێت).

ئێمەش لێرەدا دەپرسین باشە لەكاتی هاتنی یاجوج و ماجوج دا، بۆچی چاوی كافرەكان بەرەو سەرەوە ئەبڵەق دەبێت و دەڵێن قوڕ بەسەرمان ئێمە بێ ئاگابووین لەم بەڵێنە خوایە. وەڵامی ئەم پرسیارەش هەر دەبێ ئەوە بێت كە یاجوج و ماجوج لە بەرزاییەكانی ئاسمانەوە دادەبەزنە خوارەوە بۆیە چاوی بێ باوەڕەكان بەرەو ئاسمان ئەبڵەق دەبێت، ئەگەر كەسێكیش پرسیار بكات و بڵێت (ئەی باشە بۆ خوای گەورە تەنها باسی بێباوەڕەكان دەكات كە بەو دیمەنە چاویان بەرەو ئاسمان ئەبڵەق دەبێت؟).

لە وەڵامدا دەڵێین چونكە پێشتر خوای گەورە لەڕێی عیساوە صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت ئیماندارەكان ئاگاداردەكاتەوە كە یاجوج و ماجوج دادەبەزێنێتە سەر زەوی هەروەك لە فەرموودەی ژمارە(٤)دا هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إذا أوحى الله إلى عيسى إني قد أنزلت عباداً لي لا يديّ لأحدٍ بقتالهم﴾[1]، واتە: (لەو كاتەدا خوای گەورە هەواڵ دەنێرێت بۆ عیسا كەوا من كۆمەڵە بەندەیەكی خۆم دابەزاندوە بۆ سەر زەوی كەس دەسەڵاتی شەڕ كردنی نیە لەگەڵیاندا).

هەر بۆیە بینینی ئەو دیمەنە كاریگەری ڕووداوەكە لەسەر ئیمانداران كە پێشتر باوەڕیان پێ هەبووەو لێی ئاگاداربوون زۆر كەمتر دەبێت لەو كاریگەریەی كەلەسەر ئەو كافر و بێباوەڕانە دروستی دەكات كە هەتا قەومانی ڕووداوەكە هەر گاڵتەیان پێ هاتووەو باوەڕیان نەكردووە شتی واڕوودات هەر بۆیەش دەڵێن ﴿قَدْ كُنَّا فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾

## سێیەم/ لە فەرموودەكانی پێغەمبەریشدا(ﷺ) ئەم چەند ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

---

[1] صحيح مسلم (٤/٢٢٥٥) ورقمه (٢٩٣٧).

١- سیفاتەکانی یاجوج و ماجوج لە فەرموودەکان بەم شێوەیە:

أ- دەم و چاویان پانەو چاویان بچوکەو تەپڵەی سەریان سپی یە. (فەرموودەی ژمارە سێ).

ب- هەموو ئەو چەم و دەریاچانەی کە دێتە ڕێیان ئاوەکەی دەخۆنــەوە و هیــچی تێــدا نــاهێڵن و ووشکی دەکەن، بەجۆرێك ئەوانەی کەلە دواوە دێن دەڵێن پێشتر ئالەم شوێنەدا ئــاو هــەبوو. (فەرموودەی ٤و٥).

ج- هیچ کام لە یاجوج و ماجوج نامرێت هەتا لانی کەم هــەزار کــەس لەوەچــەی خــۆی بــەجێ دەهێڵێت (فەرموودەی ٦).

د- هەر هەموویان یەك مردن و بەیەك جار دەمرن بەهۆی کرمێکەوە کە خوای گەورە لــە پــشت ملیاندا دروستی دەکات پێی دەوترێت (النغف). (فەرموودەی ٤و٥).

هـ- پاش مردنیان ئاژەڵ و مەڕو ماڵات گۆشــتەکانیان دەخــۆن بەڕادەیــەك کــەپێی قەڵــەو دەبــن و هەڵدەئاوسێن (فەرموودەی ٥).

و- خوای گەورە بەبەرەکەتی دوعای عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت جۆرە باڵندەیــەك دەنێرێت کەلەملی حوشتر دەچێت لاشەکانیان هەڵدەگرێت و فڕێی دەداتە شوێنێك کە خوای گەورە خۆی دەزانێت (فەرموودەی ٤).

ئێمەش لێرەدا پرسیار دەکەین و دەڵێین: ئایا هیچ کام لەم ســیفەتانە ســیفەتی ئــادەمیزادن؟ ئــەم هەموو مرۆڤە لەسەر زەوی دەژین ئایا کەس بیستویەتی ئاوی دەریاچــەیەك یــا ئــاوی ڕووبارێــك بــە خواردنەوە ووشك بکات؟ ئایا لە سیفەتی مرۆڤدا هەیە کە هیچ کامیان نەمرێت هەتا هەزار لەوەچەی خۆی نەبینێت؟

ئایا قەت بینراوە مەڕو ماڵات و ئاژەڵ گۆشتی مرۆڤی کردوو بخوات و پێی قەڵەو بێــت؟ ئەمانــە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە یاجوج و ماجوج پێهاتەی لەشیان جیاوازە لە مرۆڤی سەر زەوی و سیفات و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، ئەم سیفەتانەی یاجوج و ماجوج زیاتر ئەو بۆچوونەمان دەســەلمێنێت کە ئەمانە کۆمەڵە مەخلوقێکن دانیشتوی سەر زەوی نین بەڵکو دێنــە ســەر زەوی وەپێدەچێت کــە پێکهاتەی جەستەشیان زۆر لەگەڵ کەش و هەواو ژینگەی زەویدا نەگونجێت و نەتوانن بەبــەردەوامی لەسەر زەوی دا بمێننەوە هەر بۆیەش هەموویان تووشی یەك دەرد دەبن و بەیەك جار دەمرن، هەروەها پێدەچێت کە شێوازی بــەکارهێنانی ئــەوانیش بــۆ ئــاو جیاوازبێــت لــە شــێوازی ئێمــە هــەر بۆیــەش لەماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی زۆر ڕووبار و دەریاچە ووشك دەکەن.

٢- ئەو بەربەستەی کە کاتی خۆی (ذي القرنين) لەبەردەم یـاجوج و مـاجوج دروسـتی کـردووە هەتا ئەمرۆ هەر ماوەو هەتا ئەو ڕۆژەش کە خوا مەبەستێتی دەربچن هـەر دەمێـنن، بەبەڵگـەی ئەوەی کە هەموو ڕۆژ خەریکی هەڵکەندنین بەڵام وەك خۆی لێدێتەوە تا ئەو ڕۆژەی کەخوای گەورە ڕێگە بەدەرچوونیان دەدات لـەئاخر زەمانـدا هـەروەك لـە (فـەرموودەی ژمـارە ٥)دا هاتووە، هەروەها لەو فەرموودەیەشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو بەربەستە نـەك تـەنها ڕێگەی لە یاجوج و ماجوج گرتووە کە بەرەو زەوی بێن بەری تیشکی خۆریشی لیّ گرتوون، بە جۆرێك کە ناهێڵێت تشکی خۆر ببینن (حتى اذا كادوا يرون شعاع الشمس) کەواتـە ئـەم فەرموودە پیرۆزە زۆر بەڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە ئێستا یاجوج و مـاجوج لەشـوێنێکدان کە تیشکی خۆریان لیّ وە دیار نیەو تیشکی خۆریان ناگاتیّ، کەئەمـەش گـەورەترین بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە یـاجوج و مـاجوج بـەردەوام هـەموو ڕۆژ سـەرگەرمی هەڵکەنـدنی بەربەسـتەکەن، بۆیـە دەڵـێین بەڕاسـتی ناچـێتە ئەقڵـەوە کـە میللـەتێکی بـیّ شـومارو لەئەندازەبەدەری وەك یاجوج و ماجوج لەم سەر زەوییەدا بژین و هـەموو ڕۆژێـك سـەرقاڵی هەڵکەندنی بەربەستێك بن بەڵام نەهیچ کەسێك و نەهیچ ئـامێرێکی پێـشکەوتووی ئـەمڕۆیش نـەتوانێت نەئـەو میللـەتـە زۆر و بیّئەندازەیـەو نەئـەو بەربەسـتەش کـە بـەردەوام سـەرقاڵی هەڵکەنـدنین ببینێـت، بۆیـە دەتـوانین بەدڵنیاییـەوە بڵـێین کـە ئـەمڕۆ نـە یـاجوج و مـاجوج لەسەرزەوین و نە ئەو بەربەستەش کەکاتی خۆی (ذي القرنين) دروستی کردووە لەسەرزەوییە.

٣- ئێمە لەبەشەکانی پێشوودا باسمان کـرد کەچـۆن لەشـکری ئیـسلامیی لەئاخرزەمانـدا لـەژێر فەرماندەی (محمدی مهدی) و (عیسای کوڕی مەریەم)صـەلاتو سـەلامی خـوای لەسـەربێت ڕووبەڕووی هەموو کوفری جیهـانی دەبنـەوە و لەشـکری لـەبن نـەهاتووی خـاچ پەرسـتان دەشکێنن و لەجەنگی جیهانی سیّیەم دا سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و تەنانەت ڕووبـەڕووی دەجال دەبنەوە کە گەورەترین فیتنەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بۆیە جێی سەرسـوڕمان دەبێـت ئەگەئەگەر ئەو لەشکرە بە توانایەو ئەو کۆمەڵە موجاهیدە گیـان بەخـشە دەستەوسـان بوەسـتن لەئاستی یاجوج و ماجوجداو تەنانەت بیر لە کـەمترین شـەڕو ڕووبـەڕوو بوونـەوەش نەکـەن لەگەڵیاندا، بەڵکو خوای گەورە هەر لە سەرتاوە لەڕێی عیساوە صەلاتو سـەلامی خـوای لەسەربێت ئاگاداریان دەکاتەوە کەهیچ مرۆڤێك توانای ڕووبەڕووبوونەوەی یاجوج و ماجوج نیە وەداوای لێدەکات کە موسڵمانەکان بەرەو کێوی (طور)بەرێت و لـەوێ خۆیـان مـەڵاس بدەن وە خەڵکی تریش لەقەڵاو تەلارو چیا بەرزەکان خۆیـان حەشـار دەدەن تـا ئـەو کاتـەی

کەخوای گەورە لەناویان دەبات و ئەم فیتنەیە دەرەوێنێتەوە، کەئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە یاجوج و ماجوج خەڵکێك نین وەك خەڵکانی سەر زەوی کە شەرکردن لەگەڵیاندا جیخاد بێت و موسڵمانان بتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە، چونکە ئەگەر وەکو خەڵکی ئاسایی بونایە مانای نیە ئەو لەشکرە ئیسلامییە بەهێزو توانایەی کە تاکە هێزی سەرزەویەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو جیهاندا کێشاوەو پێغەمبەرێکی وەکو عیسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت ڕابەرایەتیان دەکات کە بەدەستی خۆی دەجال دەکوژێت تەنانەت بیرلەڕووبەڕووبوونەوەش نەکەن لەگەڵیاندا. لە کۆتایی ئەم باسەشدا دووبارەی دەکەمەوە کە لەوانەیە خەڵکانێکی زۆر ئەم بۆچوون و لێکدانەوەیان سەبارەت بە یاجوج و ماجوج تاڕادەیەك پێ سەیر و تازە بابەت بێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم کەئەمە بۆچونێکە وەکو هەموو بۆچونەکانی تر، بۆچون و لێکدانەوەکانی مرۆڤیش هەڵەو ڕاست لە خۆ دەگرێت جا ئەگەر ڕاستیمان پێکابێت ئەوا لەلایەن خواوەیەو ئەگەر هەڵەش بێت ئەوە هەڵەی خۆمانە، بەڵام هەوڵمان داوە کە لێکدانەوەکەمان تەنها لەڕوانگەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە (صحیح)ەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بێت چونکە پێمان وایە قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان هیچ ڕاستیەك نەماوە کە ڕوونیان نەکردبێتەوە یاخود لانی کەم ئاماژەیان پێ نەکردبێت وە بەپێویستیشی دەزانم ئەوە بڵێم کەلەم بۆچونەدا سوودم لەناملکەیەك وەرگرتووە لەژێر ناونیشانی (رحلة بين الحقيقة و الخيال في سيرة ذي القرنين و ياجوج و ماجوج) کەلەلایەن (الدكتور عبدالستار اسمر الرجبو)ەوە نوسراوە کە پوختەی ئەم بۆچونەی تێدایە بەڵام ئەوبەداخەوە بۆ سەلماندنی بۆچونەکەی پشتی بەژمارەیەکی زۆر لە فەرموودەی (ضعيف) و (موضوع) و ئەو هەواڵانە بەستووە کەبە (ئیسرائیلیات) ناودەبرێن، بەڵام لەلێکدانەوەی ئایەتەکانی سورەتی (الكهف) و (الانبياء)دا پێم وایە تاڕادەیەکی زۆر سەر کەوتوو بووە منیش سوودی زۆرم لێ وەرگرتووە.

## هاتنی دەسەڵاتدارێك بەناوی (القحطاني)

لە ئاخر زەماندا کاتێك کە دونیا بەرەو تێکچون و کۆتایی دەڕوات، پیاوێك لەناو (قحطاني)ەکاندا پەیدا دەبێت کە دەسەڵات دارێکی بەتوانا دەبێت و خەڵکی ملی بۆ کەچ دەکەن و

لە ژێر سایەیدا کۆدەبنەوە، مەبەستیش لـە (قحطـان) عەرەبـەکانی وولاّتـی یەمەنـە کەبەرەچـەڵەکی ڕەسەنی عەرەب ناسراون و عەرەبی وولاّتەکانی تر لەوانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

لەو بارەیەوە (أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى يخرج رجلٌ من قحطان يسوق الناس بعصاهُ﴾[1]، واتـە: (قیامـەت هەڵناسـێت هەتا پیاوێك لە قحطان دەردەچێت بە گۆپاڵەکی خەڵکی دەداتە پێش خۆی).

کەئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی وەك چۆن شوان مەڕو ماڵات دەداتە پێش خـۆی ئـەویش بەهـەمان شێوە دەکات، وە خەڵکیش گوێڕایەڵی دەکەن و ملی بۆ کەچ دەکەن.

ئیمامی (قرطبي) دەفەرموێت (يسوق الناس بعصاه) ئەوە دەگەیـەنێت کـە خـەڵکی لەسـەردەمی ئەودا ڕێك و ڕاست دەبن و لە دەوریدا کۆدەبنەوە وەمەبەسـتیش بـە (عـصا) خـودی گۆپاڵەکـەی دەستی نیە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئەوەی کـە خـەڵکی گوێڕایـەڵی دەکـەن ئـەویش دەسـەڵاتی دەبێـت بەسەریاندا، هەرچەندە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە ڕەفق و توندیشیان لەگەڵ بەکار دەهێنێت[2]

هەروەها (نعیم ی کوڕی حماد)یش لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویـەتی (ورجـل مـن قحطان كلهم صالح)[3]، واتە: (پیاوێکیش لە (قحطان) دەسەڵات دەگرێتە دەست، ئەوانـە هـەموویان پیاو چاکن). ئەمەو هەرچەندە لە هـیچ فەرموودەیـەکی (صـحیح)دا کـات و سـەردەمی دەسـەڵات دارێتی ئەم پیاوە دیاری نەکراوە بەلاّم بەشێك لەزانایان پێیان وایە کە لەدوای وەفاتی ئیمامی مەهدی و لەسەردەمی (عیسا)دا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت پەیدا دبێت هەروەك (ابن حجر) لە(فتح الباری) دا فەرموودەیەکی لە (ابن حماد)ەوە نەقڵ کردووە کە (قیس ی کوڕی جابری الصدفي) لـە باپیریەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە فەرموویەتی: ﴿سيكون من أهل بيتي رجل يملأ الأرض عدلاً كما مُلئت جورا، ثم من بعده القحطاني، والذي بعثني بالحق ما هو دونه﴾[4]، واتـە: (لـە ئـال و بەیتی من پیاوێك پەیدا دبێت زەوی پڕدەکات لە داد پەروەری وەك چـۆن پڕبـوو لەسـتەم کـاری، لەپاش ئەویش (قحطاني)ی دێت، سوێند بەوەی کەمنی بەحەق ناردووە قیامەت لەو تێ ناپەڕێت).

---

[1] صحيح البخاري (٧٦/١٣ مع الفتح) وصحيح مسلم (٣٦/١٨ مع شرح النووي) ومسند أحمد رقم الحديث (٩٣٩٥).

[2] التذكرة ص٦٣٥

[3] سنده جيد فتح الباري (٥٣٥/٦).

[4] الفتن لنعيم بن حماد (ق١٠٥ رقم١١٦٨). فتح الباري (٥٤٦/٦).

پاشانیش (ابن حجر) هەر لە (نعیم ی کوڕی حماد)ەوە نەقڵی دەکات کە (ارطاة کوڕی منذر) کە یەکێکە لە تابیعەکانی خەڵکی شام دەفەرموێت: (بلغني أن المهدي يعيش أربعين عاماً، ثم يموتُ على فراشه، ثم يخرج رجلٌ من قحطان، مثقوب الأذنين على سيرة المهدي، بقاؤه عشرين سنة، ثم يموت قتلاً....)[1]، واتە: (هەواڵم پێگەیشتووە کە مەهدی چل ساڵ دەژی، پاشان لەسەر جێگەدەمرێت، پاشان پیاوێك لە (قحطان) دێت هەردوو گوێی سمراوە (کون کراوە) لەسەر ڕێ و شوێنی مەهدی حوکم دەکات، بیست ساڵ دەمێنێتەوە، پاشان بەکوشتن دەمرێت).

پاشان (ابن حجر) دەفەرموێت هەرچەندە فەرموودەکە بەرزکراوەتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام سەنەدەکەی (ضعیف)ە، بەڵام قسەی (ارطاة) هەرچەندە (موقوف)ە بەڵام سەنەدەکەی لە سەنەدی فەرموودەکە ڕاسترە[2]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) باس لەهاتنی دەسەڵاتدارێکی تر دەکات بەناوی (الجهجاه) هەروەك (أبو هريره) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿لايذهب الليل والنهار حتى يملك من الموالي يقال له جهجاه﴾[3]، واتە: (شەو و ڕۆژ کۆتایی نایەت هەتا پیاوێك لە (موالی) دەبێتە خاوەن موڵك و دەسەڵات پێی دەوترێت (جەهجاه)، (موالی)یش کاتی خۆی بەو کەسانە دەوترا کەلەڕەچەڵەکدا عەرەب نەبوون و لە قەومەکانی ترن بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی عەرەبدا بوون بە موسڵمان، وە (جهجاه)یش ناو نیە بەڵکو سیفەتێکە بەکەسێك دەوترێت دەنگی گڕو بەرزبێت و زۆر هاوار بکات، ئەمە هەرچەندە هەندێك لەزاناکان وەك ئیمامی (قرطبي) پێیان وایە کە (جهجاه) و (قحطاني) هەردووکیان یەك کەس بن، بەڵام لە فەرموودەکان ئاشکرا دەردەکەوێت کە دوو کەسی جیان چونکە (قحطاني) پیاوێکی عەرەبە بەڵام (جهجاه) عەرەب نیە بەڵکو پیاوێکە لەو (موالی)یانەی کە لەژێر دەسەڵاتی عەرەبەکاندا موسڵمان بوون).

## هاتنی دوکەڵێکی گەورە (الدخان)

یەکێکی تر لە نیشانە گەورەکانی نزیك بوونەوەی ئاخر زەمان هاتنی دوکەڵێکی گەورەیە کە سەرتاپای خەڵکی لەسەر زەوی دەگرێتەوە.

---

[1] الفتن لنعيم بن حماد (ق١١٠/ ب رقم ١٢٣٥) وفتح الباري (٥٤٦/٦).

[2] فتح الباري (٥٤٦/٦).

[3] مسند أحمد (١٥٦/١٦) (ح رقم ٨٣٤٦) شرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح. وصحيح الجامع الصغير(٢٣٠/٦) (ح رقم ٧٥٦١).

سەبارەت بەو دووكەڵە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ [1]، واتە: (چاوەڕێیە ڕۆژێك دێت ئاسمان دوكەڵێكی دیارو ئاشكرا لەگەڵ خۆی دەهێنێت، خەڵكی دەگرێتەوەو دایان دەپۆشێت، ئەودوكەڵە عەزابێكی بەئازارە).

(حذیفەی كوڕی اسیدی غەفاری) دەڵێت ڕۆژێكیان قسەو باسمان دەكرد لەو كاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ڕوومان هات فەرمووی (ماذا تذاكرون؟) واتە (باسی چی دەكەن؟) ووتمان (نذكر الساعة) واتە (باسی قیامەت دەكەین) فەرمووی: ﴿انها لم تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات فذكر الدخان والدَّجَّال والدَّابة وطلوع الشمس من مغربها ونزول عيسى ابن مريم عليه السلام ويأجوج ومأجوج وثلاثة خسوف خسف بالمشرق خسف بالمغرب وخسف بجزيرة العرب وآخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس الى محشرهم﴾[2]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا لەپێش ڕوودانیدا دەنیشانە دەبینن، دوكەڵ و دەجال و دابەو هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوەو دابەزینی عیسای كوڕی مەریەم صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت و یاجوج و ماجوج و سێ ڕۆچوون، ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاوا و ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەب، وە كۆتایی ئەوانەش ئاگرێك دێتە دەر لەیەمەن خەڵكی بەرەو مەحشەر ڕاو دەنێت).

هەروەها (ابی مالك الاشعری) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ان ربكم انذركم ثلاثا: الدخان يأخذ المؤمن كالزكمة، ويأخذ الكافر فينتفخ حتى يخرج من كل مسمع منه، والثانية الدَّابة، والثالثة الدَّجَّال﴾[3]، واتە: (پەروەردگارتان لەسێ شت ئاگاداری كردونەتەوە، دوكەڵێك كەوەك هەڵامەت ئیماندار دەگرێت و كاری لێ دەكات، وە كافریش بەجۆرێك دەگرێت كە هەڵی دەئاوسێنێت تا وای لێدێت لەهەموو دەرچەیەكی لەشی یەوە دێتە دەر، وە دووەمیشیان دابەو سێیەمیشیان دەجال).

هەروەها (ابن جرير الطبري)و (بان ابی حاتم) لە (عبدالله ی كوڕی ملیكە) دەگێڕنەوە كە ووتویەتی: (غدوت الى ابن عباس ﷺ ذات يوم، فقال: ما نمت الليلة حتى اصبحت، قلت: لم؟ قال:

---

[1] الدخان(١٠-١١).

[2] رواه مسلم (٢٢٢٥/٤) رقم (٢٩٠١).

[3] تفسير الطبري (١١٤/٢٠) و تفسير ابن كثير (٢٣٥/٧) وقال ابن كثير اسناده جيد.

قالوا: طلع الكوكب ذو الذنب، فخشيت ان يكن الدخان قد طرق، فما نمت حتى اصبحت)[1]، واته: (رۆژێکیان سەر لەبەیانی چووم بۆلای عبدالله ی کوڕی عەباس ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت ووتی: ئەم شەو تا بەیانی نەخەوتوم، ووتم: لەبەرچی؟ ووتی: ووتیان ئەستێرە کلکدارەکەهەڵهاتووە، منیش ترسام دوکەڵەکە سەری هەڵدابێت، لەتاوا هەتا بەیانی نەخەوتم).

لەم ئایەت و فەرموودە پڕۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هاتنی ئەو دوکەڵە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، وە زایان و ئازارێکی گەورە بە کافر و بێباوەڕان دەگەیەنێت بەڵام زیانێکی ئەوتۆی بۆ ئیمانداران نابێت، ئەمەو لە فەرموودەکاندا بەتەواوی هاتنی ئەو دوکەڵەی دەست نیشان نەکردوە هەروەها هۆکارەکەشی ڕوون نەکردۆتەوە، بەڵام شێخ محمد بەرزنجی خاوەنی کتێبی (الاشاعة لاشارط الساعة) پێی وایە کە ئەو دوکەڵە لەدوای هاتنی یاجوج و ماجوج ڕوو دەدات وە سێ ڕۆژ دەخایەنێت، وە لە ڕیوایەتێکی تری (حذیفه) دا هاتووە دەڵێت چل ڕۆژ دەخایەنێت بەڵام هیچ کام لەم ڕیوایەتانە ناتوانرێت پشتی پێ ببەسرێت، هەرچەندە ئەگەر ڕیوایەتی چل ڕۆژەکەڕاست بێت ڕێی تێ دەچێت کە ئەو دوکەڵە هەمان دووکەڵ بێت کە پێشتر باسمان کرد کەلەئاکامی جەنگی جیهانی سێیەمدا چواردەوری زەوی دەگرێت و تیشکی خۆر لە زەوی دبڕێت و ئەو چل ڕۆژە دەخایەنێت کە فیتنەی دەجالی تێدا بەرپا دەبێت.

بەڵام من زیاتر وای بۆدەچم کە ئەو دوکەڵەی ئاخر زەمان پەیوەندی بە هیچ هۆکارێکی سەرزەویەوە نەبێت وە جیاوازبێت لەو دوکەڵەی کە لەئاکامی جەنگی جیهانی سێیەمدا پەیدا دەبێت بەبەڵگەی ئایەتەکەی سورەتی (الدخان) کە دەفەرموێت ﴿ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە دوکەڵەکە لە ئاسمانەوە دێت و زەوی دەگرێت نەك لەسەر زەوی پەیدا ببێت کە پێ دەچێت هۆکارەکەی تێ پەڕبوونی زەوی بێت بەناو یان لەنزیك پەڵە هەورێکی گازی چڕ لەپاشماوەی ماددەی کەونیی کە لەزۆر شوێنی بۆشاییەکانی ئاسماندا ئەو پەڵە هەورانە بەدی دەکرێت، وە هەروەها ئەو ئەستێرە کلکدارانەی کە بەبۆشاییەکانی ئاسماندا دەسوڕێنەوەو بەدوای خۆیاندا تەم و خومار و دوکەڵێکی زۆر بەجێ دەهێڵن کە بەشێوەی کلك بەدوایانەوە دەبینرێت دوور نیە جارێك لەجاران یەکێك لەو کلکدارانە بەشێوەیەکی وا لەزەوی نزیك بێتەوە کە تەم و خومار و دوکەڵی بگاتە سەر زەوی و ببێتە هۆی ڕوودانی ئەو دیاردەی دوکەڵەی کە لەئایەت و فەرموودەکاندا وەك یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت باسی لێوە کراوە، ئەوەشی زیاتر ئەو بۆچوونە لە قەناعەتمان نزیك

[1] تفسیر الطبري (١١٣/٢٥) و تفسیر ابن کثیر (٢٣٥/٧) وقال ابن کثیر: وهذا اسناد صحیح الی ابن عباس.

دەكاتەوە ئەو فەرموودەی پێشتر كە لە (ابن عباس)ەوە ڕەزای خوای لێبێت نەقڵمان كرد كەسەرهەڵدانی دوكەڵەكە پەیوەست دەكات بەدەركەوتنی ئەستێرەیەكی كلكدارەوە، بەڵام ئەمانە هەمووی هەر لە چوارچێوەی بۆچون و هەوڵی تایبەتی خۆمان بۆ لێكدانەوەی ڕووداوەكەدەمێنێتەوە نەك وەك ڕاستیەكی حاشا هەڵنەگر، خوای گەورەش لەهەموو كەس زاناترە.

وە پێویستە ئەوەش بزانین كە ئەو دوكەڵە جیاوازە لەو بایەی كە لە ئاخرزەمانىدا ڕۆحی ئیمانداران دەكێشێت، وەك دواتر باسی دەكەین، چونكە لە دوای ئەو بایە هیچ ئیمانداریك لەسەرزەویدا نامێنێت، بەڵام لەكاتی دووكەڵەكەدا وەك لە فەرموودەكاندا ئاشكرایە كافر و موسڵمان لەسەر زەویدا هەن و دووكەڵەكە كاریگەری ئەو تۆ لەسەر نیشانەكانی ناكات.

## هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە

هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە یەكێكە لە نیشانە هەرە گەورەكانی قیامەت و سەرەتای تێكچوونی شیرازەی زەوی و گەردونە، وەڕاستی ڕووداوی ئەم دیاردەیەش لە كۆتاییەكانی تەمەنی زەویدا بەدەقی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) سەلمێنراوە، خوای كاربەجێ لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يوم يأتي بعض آيات ربك لاينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا﴾، واتە: (ئەو ڕۆژەی كە هەندێك لە نیشانەو بەڵگەكانی خوای پەروەردگاری دێن و دەردەكەون، هیچ كەسێك دوای ئەوە باوەڕ هێنان سوودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنابێت یان لە باوەڕهێنانەكەیدا خێروچاكەی نەكردبێت).

ئیمامی (طبري) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت (وأولى الأقوال بالصواب في ذلك ما تظاهرت به الأخبار عن رسول الله أنه قال: ذلك حين تطلَع الشمس من مغربها)[1]، واتە: (ئەوەی لەپێشتر و ڕاستر بێت لەماناى ئەم ئایەتەدا ئەو هەواڵە ئاشكراو زۆرانەیە كە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە كە دەفەرموێت ئەوە كاتێك دەبێت كە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت).

(أبو هريره)ش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها فإذا رآها الناس آمن من عليها فذاك حين (لاينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل))[2]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، كە هەڵهات و خەڵك بینیان،

---

[1] تفسير الطبري (٨/١٠٣).

[2] صحيح البخاري (١١/٣٥٢-مع الفتح)، وصحيح مسلم (٢/١٩٤-مع شرح النووي).

هەر هەموویان باوەڕی پێ دەهێنن، بەڵام ئەوە کاتێکە کە هیچنەفسێك باوەڕ هێنانەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنابێت).

وە هەر (أبو هريرە) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿بادروا بالأعمال ستا: طلوع الشمس من مغربها....﴾[1]، واتە: (پێشدەست بکەن بۆ کاری چاکە، پێش ئەوەی شەش شت ڕووبدات: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.......).

وە (عبدالله ی کوڕی عومەر)یش ڕۆژی قیامەت دەڵێت: ﴿حفظت من رسول الله(ﷺ) حديثا لم انسه بعد، سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: إن أول الآيات خروجا طلوع الشمس من مغربها....﴾[2]، واتە: (فەرموودەیەکم لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر کردووە کە هێشتا لەبیرم نەچۆتەوە، گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە دەیفەرموو: یەکەمی نیشانەکان کە دەردەکەوێت هەڵهاتنی خۆرە لەخۆرئاواوە) مەبەستیش لە یەکەمی نیشانەکان واتە سەرەتای تێکچوونی شیرازەی و گەردونە.

## داخستنی دەرگای تەوبەکردن:

لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە ئیتر دەرگای تەوبەکردن دادەخرێت و هەر کەسێك لەپێش ئەو ڕووداوەدا باوەڕی نەهێنابێت و تۆبەی نەکردبێت ئیتر لە دوای ئەو ڕووداوە نەباوەڕهێنان قبوڵ دەکرێت و نە تەوبەکردنیش چونکە بەڕاستی هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە ڕووداوێکی هێندە گەورەو سامناکە بە جۆرێك هەرچی خەڵکی سەر زەوی هەیە هەر هەموویان بەجارێك تەوبە دەکەن و باوەڕ دەهێنن، بەڵام تەوبەکردن لەدوای بینینی ئەو دیاردەیە وەکو تەوبەکردنی ئەو کەسە وایە کەلە غەرغەرەی مەرگدا دەیەوێت تەبە بکات بەڵام لێی قبوڵ ناکرێت، (ابو موسای ئەشعەری) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کەفەرموویەتی: ﴿إن الله عزوجل يبسط يده بالليل ليتوب مسيء النهار ويبسط يده بالنهار ليتوب مسيء الليل حتى تطلع الشمس من مغربها﴾[1]، واتە: (خوای گەورە بەشەو دەستی دەکاتەوە هەتا خراپەکاری ڕۆژ تەوبە بکات، وە بەڕۆژیش دەستی دەکاتەوە هەتا خراپەکاری شەو تەوبە بکات، هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت).

---

[1] صحيح مسلم (١٨/٨٧–مع شرح النووي).

[2] مسند أحمد (١١/١١٠–١١١) ج رقم ٦٨٨١ تحقيق أحمد شاكر. وصحيح مسلم (١٨/٧٧–مع شرح النووي).

[1] صحيح مسلم (١٧/٧٦–مع شرح النووي).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿لا تنقطع الهجرة ما تقبلت التوبة ولاتزال التوبة مقبولة حتى تطلع الشمس من المغرب فإذا طلعت طبع على كل قلب بما فيه وكفي الناس العمل﴾[٢]، واته: (کۆچ کردن لە پێناوی خوادا پچڕاندنی نیە مادام تۆبە قبوڵ بکرێت، تۆبەکردنیش بەردەوام قبوڵە هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، هەر کاتێك هەڵهات، ئیتر هەموو دڵێك بەوەی کە تێیدایە مۆری لێدەدرێت، وە ئیتر خەڵکی پێویستیان بەکار نامێنێت).

و لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿أن الله عزوجل جعل بالمغرب بابا عرضه مسيرة سبعين عاما للتوبة لا يغلق ما لم تطلع الشمس من قبله﴾[٣]، واته: (خوای گەورە دەرگایەکی لەخۆرئاواوە داناوە بۆ دتۆبەکردن، پانتاییەکی حەفتا ساڵە رێیە، داناخرێت هەتا خۆر لە رووی ئەوەوە هەڵنەیەت).

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆژێك دێت خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت ئەویش کاتێك دەبێت کە هەموو ئەونیشانانەی پێشتر باسمان کرد ڕوودەدەن و دێنە دی وە دیاردەی هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە تەنها یەك جار دەبێت و دواتر وەك ڕۆژانی ئاسایی لێ دێتەوە بەڵام لەدوای ئەو ڕووداوە ئیتر ئیمان و تەوبە لەکەس قبوڵ ناکرێت و خەڵکی ئەو سەردەمە تا ئەو ڕۆژە هەر کارێکیان کردبێت تەنها ئەوەیان بۆ دەنوسرێت و هیچی تریان لێ قبوڵ ناکرێت. هەروەك عائیشەی دایکی موسڵمانان ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: (اذا خرج أول الآيات، طرحت الأقلام وحبست الحفظة، وشهدت الأجسام على الأعمال)[١]، واته: (هەر کات یەکەمی نیشانەکان دەرکەوت (واته هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە)ئیتر قەڵەمەکان فڕێدەدرێن و ئەو فریشتانەی چاکەو خراپەی مرۆڤ دەنوسن بەند دەکرێن و لاشەکانیش شایەتی لەسەر کردەوەکان دەدەن).

ئەمەو سەبارەت بە هۆکاری ڕوودانی ئەم دیاردەیەش لە ئایەت و فەرموودەکاندا هیچمان بۆباس نەکراوە، خوای گەورەش هەرکات ئیرادەی لەسەر شتێك بوو بە (کن فیکون)ێك دەتوانێت ئەنجامی بدات، بەڵام هەر وەك لێکدانەوەیەکی زانستیانە بۆ ئەو ڕووداوە، ماوەیەك لەمەوبەر هەواڵێکم بیست کە گوایا کۆمەڵێك لە زاناکانی گەردون ناسی تەنێکیان لە ئاسماندا بەدی کردووە

---

[٢] مسند الإمام أحمد (١٣٣/٣-١٣٤) رقم ١٦٧١ تحقيق أحمد شاكر وقال اسناده صحيح- وقال ابن كثير: (هذا اسناده جيد قوي) النهاية (١٧٠/١).

[٣] رواه الترمذي (٥١٧/٩-٥١٨-مع تحفة الأحوذي) وقال (هذا حديث حسن صحيح) ورواه ابن خزيمة في صحيحه (٩٧/١ رقم ١٩٣).

[١] رواه الطبراني في تفسيره (١٠٣/٨).

کەپێدەچێت ئەستێرەیەکی کلکدار بێت و دوای چاودێری و لێکۆڵینەوەی وورد بۆیان دەرکەوتووە کە ڕێ ڕەوی ڕۆشتنەکەی بەرەو زەوی دێت، وە دەڵێن ئەگەر لەسەرئەوئاڕاستە ڕۆشتنەی ئێستای بەردەوام بێت ئەوا بەتەنیشت زەویدا تێدەپەڕێت و بەڕادەیەکی زۆر ترسناك لەزەوی نزیك دەبێتەوەو دەبێتە هۆی ڕوودانی هەندێك گۆڕانکاریی لەسەر زەوی یەکێك لەگرنگترین ئەو گۆڕاکاریانەش ئەوەیە کە ئاڕاستەی ڕۆشتنی ئەستێرەکە بە پێچەوانەی ئاڕاستەی خولانەوەی زەویەوەیە، وە لەکاتی نزیك بوونەوەی و تێپەڕبوونی بەتەنیشت زەی دا، بەهۆی هێزی ڕاکێشانی (جاذبیة) و خێرایی ڕۆشتنەکەیەوە لەوانەیە خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا بۆماوەیەکی کەم تا تێدەپەڕێت ڕابگرێت و تەنانەت فەرەیەك یان نیو فەرەش گۆی زەوی بە پێچەوانەوە بخولێتەوە کە ئەمەش لەکاتی ڕوودانیدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خۆر بەپێچەوانەوە لەخۆرئاواوە هەڵبێت،وە دوای تێپەڕبوونی ئەستێرەکە زەوی دەست دەکاتەوە بە خولانەوەی ئاسایی خۆی وەك جاری جاران وە ئەو زانایانە پێیان وایە کە ئەو ئەستێرە کلکدارە بۆ دەوروبەری ساڵی (٢٠٢٩)ی زایینی دەگاتە نزیك زەوی، جا ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێت ئەوا لێکدانەوەیەکی زانستیانەی گونجاوە بۆ ئەو دیاردەیە، وە دوور نیە کە ئەو ئەستێرە کلکدارە هەر هەمان هۆکاری هاتنی ئەو دوکەڵە گەورەیە بێت کە پێشتر باسمان کرد، خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترەو تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

## دەرچوونی (الدابە)

ووشەی (دابة) لەزمانی عەرەبیدا بە هەموو گیاندرێك دەوترێت کە بەسەر زەویدا بڕاوات و تەپەی پێ یان دەنگی ڕۆیشتنەکەی ببیسرێت.

بەڵام ئەو (دابە)یەی کەلە ئاخرزەماندا دەردەچێت و خوای گەورە کردویەتی بەیەکێك لەنیشانە گەورەکانی هاتنی قیامەت گیاندارێکی تایبەتە و جیاوازە لە گیاندارەکانی تری سەرزەوی، ئەویش بەوەی کە ئەم گیاندارە قسە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات و کافر و موسڵمانیش لەڕێی نیشانە کردنەوە لەیەکتر جیا دەکاتەوە.

خوای زاناو کاربەجێ لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ [1]، واتە: (هەرکاتێك خەڵکی شیاو و (مستحق)ی ئەوە بوون کە بەڵێن و سزای خوایان بەسەردا جێبەجێ بێت، گیاندارێکیان لەزەوی

---

[1] النمل/٨٢.

بۆدەهێنینە دەرەوە، قسەیان لەگەڵ دەكات چونكە بەڕاستی ئەو خەڵكە باوەڕ ناهێنن بەبەڵگەو نیشانەكانی خوای گەورە).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت كە ئەو گیاندارە بە پێچەوانەی هەموو گیاندارەكانی تری سەر زەویەوە توانای توانای قسەو گفتوگۆی هەیە لەگەڵ مرۆڤدا، وە هاتنی ئایەتەكەش لە سوورەتی (النمل)دا خۆی بۆ خۆی دووپات كردنەوەی ئەو ڕاستیەیە چونكە لەو سوورەتەدا باس لە قسەكردنی مێروولەو پەپوسلێمانكە وە هەر لە ئایەتە پیرۆزەكەشدا ئەوەمان بۆڕوون دەبێتەوە كە ئەو گیاندارە كاتێك دەردەچێت كە خەڵكی تێهەڵكێشی فەسادو خراپەكاری دەبن و پشت لە فەرمانەكانی خوای گەورە هەڵدەكەن و لەڕێبازی حەق لادەدەن و گومڕاو سەرلێ شێواو دەبن بە شێوازێك كە بانگەواز و ئامۆژگاری كردنیان هیچ سوودێكی نابێت، لەوكاتەدا ئەو گیاندارە وەكو نیشانەو بەڵگەیەك دێتە ناو خەڵكی و گفتوگۆیان لەگەڵدا دەكات، ئەم ڕووداوەش هاوكات دەبێت لەگەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، هەر وەك لەو ڕیوایەتەدا هاتووە كە (عبدالله ی كوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە مە فەرموویەتی: ﴿إن أول الآيات خروجا طلوع الشمس من مغربها، وخروج الدابة على الناس ضحى، وأيهما ما كانت قبل صاحبتها فالأخرى على إثرها قريبا﴾[1]، واتە: (یەكەمی نیشانەكان هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە و دەرچوونی (دابە) لە چێشتەنگاودا بۆ سەر خەڵكی، وە هەر كامێك لەم دوو نیشانەیە لەپێش ئەوی تریاندا ڕوویدا ئەوا ئەوی تریان بەزوویی بەدوایدا دێت).

وە سەبارەت بە شێواز و ڕوخساری ئەو گیاندارەش زاناكان لەنێوان خۆیاندا بیرو ڕای جیاوازیان هەیە و قسەی زۆریان لەسەر كردووە، بەڵام هیچ كامیان بەڵگەی ڕاست و متمانەداریان پێنیە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە ئێمەش خۆمانی لێ لادەدەین و باسی لێوە ناكەین.

وە (ابو امامە) ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ﴿تخرج الدابة فتسم الناس على خراطيمهم ثم يغمرون فيكم حتى يشتري الرجل البعير فيقول ممن إشتريته فيقول اشتريته من أحد المخطمين﴾[2]، واتە: ((دابە) دەردەچێت نیشانە لە لووتی خەڵكی دەدات و دەیسمێت، پاشان ژمارەی لووت سمراوەكان زۆر دەبن لەناوتاندا تاوای لێدێت پیاو بارگیرێك دەكرێت، پێی دەڵێن لە كێت كڕیوە؟ ئەویش دەڵێت لە یەكێك لەلووت سمراوەكان).

---

[1] صحيح مسلم (١٨/٢٧-٢٨-مع شرح النووي).

[2] رواه أحمد وقال الألباني (صحيح) (صحيح الجامع الصغير(٣/٣٧)(ح ٢٩٢٤)).

ئەمەو سەبارەت بە شوێنی دەرچوونی ئەو (دابە)یەش (حذیفەی کوڕی اسید) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿تخرج الدابة من أعظم المساجد، فبينما هم كذلك اذ رنت الأرض، فبينما هم كذلك اذ تصدعت﴾[1]، واتە: ((دابە) لەگەورەترین مزگەوتەکانەوە دەردەچێت (مەبەستی مسجد الحرام)ە، خەڵکەکە هەر ئەوەندە دەزانن کە زەوی دەلەرێتەوە، پاشان هەر ئەوەندە دەزانن کە زەویەکە درزی تێدەبێت و شەق دەبێت).

هەروەها (أبو هريره)ش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿تخرج الدابة ومعها عصا موسى عليه السلام وخاتم سليمان عليه السلام فتخطم الكافر بالخاتم وتجلو وجه المؤمن بالعصا حتى أن أهل الخوان ليجتمعون على خوانهم فيقول هذا يا مؤمن ويقول هذا يا كافر﴾[2]، واتە: (دابە دەردەچێت دارەکەی موسا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت و ئەنگوستیلەکەی سلێمان صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت پێیەتی، سەری لووتی کافر بەئەنگوستیلەکە دەسمێت و، دەموچاوی ئیمانداریش بەدارەکە ڕوون و گەش دەکات، وای لێدێت خەڵکی سەر سفرەیەك لەسەر سفرەکەیان کۆدەبنەوە ئەویا دەڵێت ئەی ئیماندار ئەویشیان بەوەی تر دەڵێت ئەی کافر).

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکوێت کە (دابە) سگیانداریکی تایبەتە وەکو مرۆڤ عەقڵی هەیەو توانای قسەو گفت و گۆی هەیە و لە ئاخرزەمانندا هاوکات لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە لە مزگەوتی (بيت الحرام)ەوە دەردەچێت و لە ڕێگەی نیشانەکردنەوە کافر و ئیماندار لێك جیادەکاتەوە ئەمەش کاتێك دەبێت کە دەرگای تەوبە داخراوەو تۆبە لەکەس قبوڵ ناکرێت وە خوای گەورە دەیکات بە نیشانەو بەڵگە بۆ کۆتایی هاتنی تەمەنی زەوی و نزیك بوونەوەی قیامەت.

## هەڵگیرانی قورئان و پووکانەوەی ئیسلامەتی

پاش ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە سەردەمی ئیمامی مەهدی و عیسای کوڕی مەریەمدا صەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت زیندوو دەبێتەوەو دەسەڵات بەسەر تەواوی جیهاندا دەچەسپێنێت و دادپەروەری و ئارامی و کامەرانی باڵ بەسەر خەڵکیدا دەکێشێت و ئاماوەیەکی باش ئەم خۆشیە بەردەوام دەبێت، بەڵام پاش ئەوەی سەرلەنوێ ئیسلامەتی و دینداری بەرەو کزبوون و

[1] رواه الطبراني في الأوسط وقال الهيثمي (رجاله ثقات) المجمع (ج ٨ ص٧-٨).

[2] مسند الإمام أحمد (١٥/٧٩-٨٢) (ح ٧٩٢٤) تحقيق أحمد شاكر وقال اسناده صحيح، ومسند الترمذي (٤٤/٩) وقال حديث حسن.

لاوازبوون دەڕوات و بێباوەڕی و خراپەکاری سەرلەنوێ لەدڵەکاندا چەکەرە دەکات و خەڵکی بەرەو گومڕایی دەڕۆن تاوای لێدێت موسڵمان و ئیسلامەتی غەریب دەبێتەوە.

(حذیفەی کوڕی یەمان) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يدرس الإسلامُ كما يدرس وشيّ الثوب حتى لايدرى ما صيام ولا صلاة ولا نسك ولا صدقةٌ وليسرى على كتاب الله عزوجل في ليلةٍ فلا يبقى في الأرض منه آيةٌ وتبقى طوائف من الناس الشيخ الكبير والعجوز يقولون أدركنا آبائنا على هذه الكلمة لا إله الا الله فنحن نقولها﴾[1]، واتە: (ئیسلام دەپوکێتەوە وەك چۆن نەخشی جل و بەرگ کاڵ دەبێتەوە و دەپوکێتەوە هەتا وای لێدێت نازانرێت ڕۆژو چیەو نوێژ چیەو قوربانی چیەو پارە بەخشین چیە، وە لە شەوێکدا شەو ڕۆیی بە کتێبەکەی خوا (قورئان) دەکرێت، ئیتر تەنها یەك ئایەتی ئەو قورئانە لەسەر زەوی نامێنێت، وە وە کۆمەڵێك لە خەڵك دەمێننەوە، پیرەمێردی گەورەو بەتەمەن دەڵێن: باووباپیرانمان کەبینیان گەیشتووشن لەسەرلا الە الا الله بوون، ئێمەش ئەوان ئەیڵێینەوە).

وە (عبدالله ی کوڕی مەسعود)یش ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ﴿ليزعن القرآن من بين أظهركم يسرى عليه ليلا، فيذهب من أجواف الرجال، فلا يبقى في الأرض منه شيء﴾[1]، واتە: (بەڕاستی کاتێك دێت قورئانتان لەناودا هەڵدەگیرێت و شەوڕۆیی پێ دەکرێت، ئیتر لەناو پیاواندا نامێنێت، وەلەسەر زەوی هیچ شتێك لە قورئان نامێنێت).

(ابن تيمية)یش ڕەزای خوای لێبێت دەربارەی هەڵگرتنی قورئان دەفەرموێت: (يُسرى به في آخر الزمان في المصاحف والصُّدور، فلا يبقى في الصُّدور منه كلمة، ولا في المصاحف منه حرف﴾[2]

بەڵێ لە شەوێکدا خوای گەورە قورئانی پیرۆز هەڵدەکێشێتەوە بۆ ئاسمان، ئەو لاپەڕانەی قورئانیان تێدا نوسرابوو سپی دەبن و ئەو دڵانەش قورئانیان تێدابوو لێی دەسڕێتەوە، بەجۆرێك وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە تەنها یەك ئایەتیشی لەسەر زەوی نامێنێت و خەڵکی هیچ کام لەدروشمەکانی ئیسلامەتیان لا نامێنێت و پیرەمێرد و بەساڵاچووەکانیش بەدەگمەن ئەو (لا الا الله)یان لەبیرم دەمێنێت کە لە باوباپیرانیان بیستووە.

---

[1] أخرجه ابن ماجة والحاكم. وقال الحاكم صحيح على شرط مسلم و وافقه الذهبي وقال البوصيري اسناده صحيح. رجاله ثقات. وقال ابن حجر (أخرجه ابن ماجة بسند قوي) فتح الباري (٣/ ١٦)، وجاء في سلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني برقم (٨٧).

[1] رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير شداد بن معقل وهو ثقة (مجمع الزوائد (٧/٣٢٩-٣٣٠)).

[2] مجموع فتاوى ابن تيمية (٣/١٩٨-١٩٩).

(أنس ی کوڕی مالك) یش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا تقوم الساعة حتى لا يُقالُ في الأرض الله الله﴾[3]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەویدا ناوترێت الله الله).

## هەڵکردنی بایەك ڕۆحی ئیمانداران دەکێشێت:

پاش ئەوەی کە خوای کاربەجێ قورئانە پیرۆزەکەی خۆی هەڵدەکێشێتەوە بۆ ئاسمان بەدوای ئەوەدا خوای گەورە بایەکی نەرم و بۆن خۆش دەنێرێت ڕۆحی گشت ئیماندارانی سەرزەوی دەکێشێت، چونکە ئیمانداران لە دوای هەڵکێشانی قورئان ژیانی بۆچیەو بەبێ قورئان ئیتر چ خێرێك لە ژیاندا دەمێنێت؟

(أبو هريره) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن الله يبعث ريحاً من اليمن ألينَ من الحرير فلا تدعُ أحداً في قلبه مثقال ذرةٍ من إيمانٍ إلاّ قبضتهُ﴾[1]، واتە: (خوای گەورە بایەك دەنێرێت لەیەمەنەوە، لە ئاوریشم نەرم ترە، کەس ناهێڵێت کە هێندەی مسقالە زەرەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت ڕۆی دەکێشێت).وە (نواسی کوڕی سەمعان)یش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فبينما هم كذلك إذ بعث الله ريحاً طيبةً فتأخذهم تحت آباطهم فتقبض روح كل مؤمن وكل مسلم ويبقى شرار الناس يتهارجون فيها تهارج الحمر فعليهم تقوم الساعة﴾[2]، واتە: (لەو کاتەدا خوای گەورە بایەکی پاك و خۆش دەنێرێت و خەڵکی لە بن باڵیانەوە دەگرێت و ڕۆحی هەموو ئیماندار و موسڵمانێك دەکێشێت، ئیتر ئیتر تەنها خراپەکاران لە خەڵکی دەمێنێتەوە و ئەوانیش وەکو گوێ درێژ سواری یەکتر دەبن، قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت).

وە عائیشەی دایکی موسڵمانانیش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستوە کە دەیفەرموو: ﴿لا يذهب الليل والنهار حتى تُعبَد اللات والعزّى﴾، واتە: (شەو ڕۆژ کۆتاییان پێ نایەت هەتا جارێکی تر (لات و عزای) دەپەرسترێتەوە). دەڵێت منیش ووتم ﴿إن كنتُ لأظنُّ حين أنزل الله ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴾ أنَّ ذلك تامّاً﴾، واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا من وام دەزانی کە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (خوا خۆی پێغەمبەرەکەی ناردوە بەرێنمایی و ئاینی ڕاست، بۆ ئەوەی

---

[3] رواه مسلم في صحيحه، مشكاة المصابيح ٣/٥٠ رقم ٥٥١٦.

[1] صحيح مسلم، حديث رقم (٧٩١٥).

[2] صحيح مسلم، حديث رقم (٢٩٣٧).

بەسەر هەموو ئاینەکاندا سەری بخات هەرچەندە بێ باوەڕەکانیش پێیان ناخۆش بێت) وام دەزانی ئیتر ئەوە تەواوە).

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ﴿إنَّهُ سيكونُ من ذلك ما شاء اللهُ ثُمَّ يبعثُ اللهُ ريحاً طيِّبةً فتوَفّى كلَّ من في قلبهِ مثقالُ حبَّةِ خردلٍ من إيمانٍ فيبقى من لا خير فيهِ فيرجعونَ إلى دين آبائهم﴾[1]، واتە: (ئەوە وادەبێت تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە دەیەوێت، لە پاشان خوای گەورە بایەکی پاك و خۆش دەنێرێت، هەرکەسێك بەقەد مسقالە دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت ڕۆحی دەکێشێت، ئیتر تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خێریان تێدا نیە، ئەوانیش دەگەڕێنەوە بۆ ئاینی باووباپیرانیان).

بەڵێ لە دوای هەڵگرتنی ئەو بایەو مردنی هەموو ئیماندارانی سەرزەوی، ئیتر سەرزەوی تەنها بێباوەڕو خراپەکاری تێدا دەمێنێت و ئەوانیش دەست دەکەنەوە بە بت پەرستی و خراپەکاری، خوای گەورەش هەتا یەك کەس لەسەر زەوی مابێت بڵێت (یاالله) زەوی بۆ ڕادەگرێت، بەڵام لە دوای ئەوە زەوی بۆ بێباوەڕان ڕاناگرێت.

## ڕوخاندنی کەعبەی ماڵی خواو کاول بوونی مەدینەی شاری پێغەمبەر(ﷺ)

پاش ئەوەی کە هیچ ئیماندارێك لەسەر زەوی نامێنێت و هەموو دەمرن ئیتر کەعبەی ماڵی خوا لەلای بێباوەڕان و بت پەرستانی ڕێزی نابێت، هەر بۆیە کەعبە لەلایەن کابرایەکی ڕەش پێستی حەبەشیەوە دەڕوخێنرێت و تەخت دەکرێت.

(أبو هريرە) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿في آخر الزمان يظهر ذو السويقتين على الكعبة، قال: حسبتُ أنه قال: فيهدمها﴾[1]، واتە: (لە ئاخرزەماندا کەسێکی لاق بارێك دەست دەگرێت بەسەر کەعبەدا).(أبو هريرە) دەڵێت وای لێ تێگەشتم کە فەرمووی (دەیڕوخێنێت).

هەروەها (عبدالله ی کوڕی عەباس)یش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿كأني أنظر اليه أسود، أفحج ينقضها حجرا حجرا (يعني الكعبة)﴾[2]، واتە: (هەر دەڵێی وا لەبەر چاوم سەیری دەکەم، ڕەشێکی لاق خوار، بەرد بەرد دەڕوخێنێت (مەبەستی پێی کەعبە بوو)).

هەروەها (عبدالله ی کوڕی عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست کەدەیفەرموو: ﴿يخرب الكعبة ذو الوسقتين من الحبشة ويسلبها حليتها ويجردها من كسوتها ولكأني

---

[1] صحيح مسلم (٤/٢٢٣٠ رقم ٥٢) وأخرجه أيضاً أبو يعلى والحاكم وأبو عمرو الداني.

[1] مسند الأمام أحمد (٢٢٧/١٥) رقم (٨٠٨٠) شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

[2] صحيح البخاري ومسند الإمام أحمد.

أنظر اليه أصيلع أفيدع يضرب عليها بمسحاته ومعوله﴾[3]،واتە: (کەعبە لاق باریکێك لە حەبەشە دەیڕوخێنێت، ئەو شتانەی کە پێ ڕازاوەتەوە لێی دەکاتەوەو بەرگ و پۆشاکەکەی دادەماڵێت، هەردەڵێی وا لەبەر چاوم سەیری دەکەم، کەچەڵێکی جومگە خوارو دەرپەڕیو، بە پاچ و خاکەنازیەکەی لێی دەدات).

هەروەها (سەعیدی کوڕی سەمعان) دەڵێت گوێم لێ بوو (أبو هريرە) بۆ (ابو قتادە)ی دەگێڕایەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يبايع لرجل ما بين الركن والمقام ولن يستحلَّ البيت الاَّ أهلهُ فإذا أستحلّوهُ فلا يُسألُ عن هلكة العربِ ثمَّ تأتي الحبشةُ فيخرِّبونهُ خراباً لا يعمر بعده أبَداً وهمِ الذينَ يستخرجونهُ كَنزَهُ﴾[1]، واتە: (پیاوێك لەنێوان ڕوکن و مەقامدا بەیعەتی پێدەدرێت، ماڵی بەیتیش کەس حورمەتی ناشکێنێت خەڵکەکەی خۆی نەبێت، هەرکاتێکیش حورمەتیان شکاند ئیتر مەپرسە عەرەب چۆن لەناو دەچن، پاشان حەبەشە دێن، ڕوخانێك دەیڕوخێنن کە هەرگیز لەدوای ئەوە ئاوەدان ناکرێتەوە، هەر ئەوانیش زێڕ و کەنزەکەی ناوی دەردەهێنن).

بەهەمان شێوەش لە ئاخرزەماندا مەدینەی شاری پێغەمبەر(ﷺ) کاول دەبێت وەك لە پێشتر باسمان کرد لەسەردەمی ئیمامی مەهدی بۆ ماوەیەك خەڵکی شاری مەدینە شارەکە بەجێ دەهێڵن و چۆڵی دەکەن بەڵام لە ئاخرزەماندا بەتەواوی چۆڵی دەکەن و شارەکە کاول دەبێت.

جابر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت عومەری کوڕی خەتتاب پێی وتم گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە دەیفەرموو: ﴿ليسيرنَّ الراكب بجنبات المدينة ثم ليقولنَّ: لقد كان في هذا حاضر من المسلمين كثير﴾[2]، واتە: (وای لێ دێت ووڵاخ و سوار بەتەنیشت مەدینەدا تێدەپەڕێت، پاشان دەڵێت: کاتی خۆی ئالێرەدا موسڵمانان شارو ئاوەدانیەکی زۆریان هەبوو).

هەروەها (أبو هريرە)یش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ﴿يتركون المدينةَ على خير ماكانت لا يغشاها إلا العواف يريد عواف السباع والطير وآخر من يحشرُ راعيان من مزينةَ يريدان المدينةَ ينعقان بغنمهما فيجدانها وحشاً حتى إذا بلغا ثنيةَ الوداع خرَّا على وجوههما﴾[3]، واتە: (شاری مەدینە بەجێ دەهێڵن لە خۆشترین و باشترین حاڵیدا، تەنها گیاندار و

---

[3] مسند الأمام أحمد (١٢/١٤-١٥) رقم (٧٠٥٣) شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

[1] مسند الإمام أحمد (١٥/٣٥) شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح. وقال ابن كثير هذا اسناده جيد قوي، النهاية (١/١٥٦).

[2] مسند الإمام أحمد (١/١٢٤) رقم (١٢٤) شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

[3] صحيح البخاري (٥/٨٩-٩٠) مع الفتح.

باڵندە نەبێت تێی ناچێت، وەئاخر کەسیش کە حەشر دەکرێن و هەڵدێن دوو شوانن لە خێڵی (مزینە) بەرەو مەدینە دەچن، هاوار لەمەڕو ماڵاتەکەیان دەکەن، کە دەبینن شارەکە چۆڵە، هەتاکاتێك کە دەنگەنە (ثنیة الوداع) ئەوانیش بەدەمدا دەکەون).

بەم شێوەیە دوای نەمانی ئیماندار و موسڵمان لەسەر زەویدا هەردوو شارە پیرۆزەکەی موسڵمانان کاول و خاپوور دەبن و کەسیش نابێت دەڵێ پێیان تەنگ بێت یان خەمیان لێ بخوات.

## ڕوودانی سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر زەوی

لە ڕۆژەکانی کۆتایی زەویدا سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر ڕووی زەوی ڕوودەدات، کە ئەو سێ ڕۆچوونە زۆر جیاوازن لە ڕۆچوونە ئاساییانەی کە ناوبەناو لە شوێنی جیاوازی زەویدا بە هۆی بومەلەرزە و لافاو و گڕکانەوە ڕوودەدات، ئەویش لەوێدا کەئەم ڕۆچوونە هێندە گەورەن کە پێشتر نموونەیان نەبینراوەو پانتایی یەکی گەلێك فراوان لە ووشکایی سەر زەوی لەسەر نەخشە دسڕێتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەریەکە لەم سێ ڕۆچوونەی بەیەکێك لە نیشانە گەورەکانی قیامەت لە قەڵەم داوە، هەروەك (حذیفەی کوڕی اسید)ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن الساعة لن تقوم حتى تروا عشر آيات... (فذكر منها).. فهوَ ثلاثة خسوف: خسف بالمشرق وخسف بالمغرب وخسف بجزيرة العرب﴾[1]، واتە: (قیامەت هەڵناسێت هەتا دەنیشانە دەبینن...(لەو دە نیشانانەی کە فەرمووی): وە سێ ڕۆچوون، ڕۆچوونێك لەڕۆژهەڵات و ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاواو ڕۆچوونێکیش لە دورگەی عەرەب).

ئەمەو سەبارەت بەکاتی ڕوودانی ئەو ڕۆچوونانە یان هۆکارەکەی لە فەرموودە پیرۆزەکاندا باسیان لێ وە نەکراوە تەنها ئەوندە نەبێت کە لە دە نیشانە گەورەکەی قیامەت لەقەڵەم دراون، بەڵام پێمان وایە کە ئەو سێ ڕۆچوونە گەورەیە نیشانەی تێك چوونی شیرازەی زەوی و لێك ترازانی کیشوەرەکان دەبێت لەیەکتر، وەلە دوای ئەم نیشانەیە تەنها یەك نیشانەی تر دەمێنێت کەئەویش دەرچوونی ئاگرێکی گەورەیە لە یەمەن خەڵکی ڕاپێچ دەکات.

## ئاگرێك خەڵك ڕا پێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە

کۆتایی نیشانەکانی قیامەت دەرچوونی ئاگرێك دەبێت لە خاکی یەمەنەوە کە لە گەورەییدا پێشتر نموونەی نەبینراوە، لەمەو سیفەت و چۆنیەتی ئەو ئاگرەش کە لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) باسی لێوە کراوە.

---

[1] صحيح مسلم (١٨/٢٧-٢٨) مع شرح النووي.

هەر لەو فەرموودەیەدا کە (حذیفەی کوڕی اسید) ڕەزای خوای لێبێت گێڕاویەتیەوە دەربارەی دە نیشانە گەورەکەی قیامەت پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وآخر ذلك نارٌ تخرجُ من اليمن، تطرد الناس الى محشرهم﴾[1]، واتە: (وە کۆتایی ئەو نیشانانە ئاگرێکە لەیەمەنەوە دەردەچێت، خەڵك ڕاو دەنێت بۆ حەشارگە و شوێنێك کە تیایدا کۆدەبنەوە).

وەلە ڕیوایەتێکی تردا کە هەر (حذیفە) دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ونار تخرج من قعرة عداً ترحل الناس﴾[2]، واتە: (وە ئاگرێك کەلەبن قەڵای شاری (عدن) دەردەچێت خەڵکی کۆچ پێ دەکات).

وە لە فەرموودەیەکی تردا (انس) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە کاتێك (عبدالله ی کوڕی سەلام موسڵمان بوو پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە یەکەم نیشانەی قیامەت چیە؟ ئەویش فەرمووی: ﴿أما أول أشرط الساعة فنار تحشر الناس من المشرق الى المغرب﴾[3]، واتە: (یەکەم نیشانەی قیامەت ئاگرێکە خەڵکی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا ڕاپێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە).

وە (عبدالله ی کوڕی عومەر)یش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ستخرج النار من حضرموت أو من نحو بحر حضرموت قبل يوم القيامة تحشر الناس قال يا رسول الله فما تأمرنا قال عليكم بالشام﴾[4]، واتە: (ئاگرێك لە (حضرموت) لە دەریای (حضرموت) پێش ڕۆژی قیامەت دێتە دەر، خەڵکی ڕاپێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە) ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانی چیمان پێ دەکەیت؟ فەرمووی پەنابەرنە بەر وولاتی شام).

ئەمەو سەبارەت بە چۆنیەتی کۆکردنەوەو ڕاپێچ کردنی ئەو ئاگرەش بۆ خەڵکی ئەو زەمانە (عبدالله ی کوڕی عمر) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يبعث النار على أهل المشرق، فتحسرهم الى المغرب، تبيت معهم حيث باتوا، وتقيل معهم حيث قالوا، يكون لها ما اسقط منهم وتخلف، وتسوقهم سوق الجمل الكسير﴾[5]، واتە: (ئاگرێك دەنێردرێتە سەر خەڵکی

---

[1] صحيح مسلم (١٨/٢٨-٢٩) مع شرح النووي.

[2] صحيح مسلم (١٨/٢٧-٢٨) مع شرح النووي.

[3] صحيح البخاري (٦/٣٦٢-مع الفتح) ح (٣٣٢٩).

[4] مسند الإمام أحمد (٧/١٣٣)ح (٥١٤٦) قال أحمد شاكر: اسناده صحيح. وقال الألباني صحيح في صحيح الجامع الصغير (٣/٢٠٣)ح (٣٦٠٣).

[5] رواه الطبراني في الكبير والأوسط ورجاله ثقات، مجمع الزوائد (٨/١٢) رواه الحاكم في المستدرك (٤/٥٤٨) وقال (هذا حديث صحيح ولم يخرجها) ووافقه الذهبي.

ڕۆژهەڵات، کۆیان دەکاتەوە و ڕاپێچیان دەکات بەرەو ڕۆژئاوا، لەهەر کوێ شەویان بەسەرداهات لەگەڵیاندا دەبێت، وە لەهەر کوێ نیوەڕۆیان بەسەرداهات لەگەڵیان دەبێت، ئەوەی بکەوێت یان دوابکەوێت بۆ ئاگرەکە دەبێت و لەناوی دەبات، وەکو حوشتری بێ هێزو لاواز ڕاپێچیان دەکات).

وە (أبو هريرە)ش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿يحشر الناس على ثلاث طرائق الراغبين راهبين واثنان على بعير وثلاثة على بعير أربعة على بعير وعشرة على بعير ويحشر بقيتهم النار تقيل معهم حيث قالوا وتبيت معهم حيث باتوا وتصبح معهم حيث أصبحوا وتمسي معهم حيث أمسوا﴾[1]، واتە: (خەڵکی لەسەر سێ شێواز ڕاپێچ دەکرێن و کۆدەکرێنەوە: بەئارەزوی خۆیان و لەترساندا دوان لەسەر ووڵاخێك و سیان لەسەر ووڵاخێك و چوار لەسەر ووڵاخێك وە دە لەسەر ووڵاخێك، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە ئاگرەکە ڕاپێچیان دەکات کۆیان دەکاتەوە، لە هەر کوێ نیوەڕۆیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت و لە هەر کوێ شەویان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت، وەلەهەر کوێ بەیانیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت و لەهەرکوێ ئێوارەیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت).

هەروەها (حذيفةی کوڕی اسيد) لە (أبو ذر) ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە ووتویەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿أن الناس يحشرون ثلاثة أفواج فوج راكبين طاعمين كاسين وفوج تسحبهم الملائكة على وجوههم وتحشرهم النار وفوج يمشون ويسعون يلقي الله الآفة على الظهر فلا يبقى حتى إن الرجل لتكون له الحديقة يعطيها بذات القتب لا يقدر عليها﴾[2]، واتە: (خەڵکی بەسێ دەستەو تاقم ڕاپێچ دەکرێن و کۆدەکرێنەوە، دەستەیەك بەسواری و بەتێری و پۆشتەیی، وە دەستەیەك بەپێ دەڕۆن و هەوڵدەدەن، وەدەستەیەك فریشتەکان لەسەر دەموچاویان ڕایاندەکێشن و ڕاپێچیان دەکەن و بۆ ئاگرەکە). قسەکەرێك پرسیاری کرد ووتی: (ئەو دوانەیمان زانی، ئەی مەبەست لەوانە چیە کە بەپێ دەڕۆن و هەوڵ دەدەن) فەرمووی (خوای گەورە قڕ دەخاتەوە ووڵاخی بار هەڵگر تا وای لێدێت ووڵاخ نامێنێت، تەنانەت پیاویان تیا دەبێت کە باخچەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری هەیە، دەیدات بەپیرە حوشترێك کە کورتانی پێوە بێت، کە چی هێشتا پێی ناکرێت).

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بەماوەیەکی کەم لە پێش ڕۆژی قیامەتدا ئەو ئاگرە گەورەیە لە خاکی یەمەنەوە لە ناوچەی (عدن)و (حضرموت) دێتە دەرەوەو خەڵکێکی زۆر

---

[1] صحيح البخاري (١١/٣٧٧ مع الفتح) وصحيح مسلم (١٧/١٩٤-١٩٥- مع شرح النووي).

[2] رواه أحمد والنسائي والحاكم. وقال الحاكم(هذا حديث صحيح الأسناد الى الوليد بن جميع ولم يخرجاه)وقال الذهبي في تلخيص المستدرك (الوليد قد روى له مسلم متابعة وأحتج به النسائي). وسند النسائي رجاله ثقات.

لەناو دەبات بەتايبەتى ئەوانەى كەدوا دەكەون و زوو فريا ناكەون، وە ئەوانەش كە فريا دەكەون بەرەو رۆژئاوا هەڵدێن، وە وەك لە فەرموودەكەى (عبداللە ى كوڕى عومەر)دا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان دەكات كە ڕووبكەنە وڵاتى شام چونكە ئەوێ پارێزراو دەبێت لەو گڕكانە گەورەيە كە ئەمەش ئەوە دەگەيەنێت كە ئەو ئاگرە پانتايى يەكى زۆر گەورە لە سەر زەوى دەگێڕێتەوە.

ئەمەو هەندێك لە زاناكان وەك ئیمامى (الغزالي) و (الحليمي) پێيان وايە ئەو حەشرەى لەفەرموودەكاندا باسكراوە مەبەست پێى حەشرى ڕۆژى قيامەتە، بەڵام ئەم بۆچوونە ڕاست نيە، چونكە فەرموودەكان زۆر بە ڕوونى و ئاشكرا ئەو ڕاستيە ڕوون دەكەنەوە كە ئەو حەشر كردنە لەپێش ڕۆژى قيامەتدا دبێت و جياوازە لەگەڵ ئەو حەشرەى لە قيامەتدا ڕوودەدات بەبەڵگەى ئەوەى كەلە كاتى دەرچوونى ئاگرەكەو حەشر كردنى خەڵكەكەدا هەيانە خۆى زوو ڕزگاردەكات و بەسوارى وڵاخ و تێرى و بەپۆشتەيى ڕزگارى دەبێت و هەشيانە هەوڵى كڕينى وڵاخ دەدات، كە هەموو دەزانين ئەو شتانە لە قيامەتدا نيە، بەڵكو لە حەشرى ڕۆژى قيامەتدا خەڵكى هەمووى ڕووت و بێ پۆشاكن و كڕين و فرۆشتنيش لەو ڕۆژەدا نيە.

ئیمامى (النووي)يش لەو بارەيەوە دەفەرموێت: ﴿قال العلماء: وهذا الحشر في آخر الدنيا قبل القيامة، وقبيل النفخ في الصور، بدليل قوله(ﷺ) تحشر بقيتهم النار، تبيت معهم وتقيل معهم وتصبح وتمسي﴾[1]، واته: (زاناكان فەرموويانە: ئەم حەشرە لە كۆتايى دونيادا دەبێت پێش هاتنى قيامەت، وەلە پێش ئەوەى فوو بكرێت بە (صور)دا بەبەڵگەى فەرمايشتەكەى پێغەمبەر(ﷺ) كەدەفەرموێت: ئاگرەكە پاشماوەى خەڵكەكە حەشر دەكات بە شەوو نيوەڕۆو بەيانى و ئێوارە لەگەڵيان دەبێت).

بەڵێ ڕوودانى ئەم كارەساتەش كۆتايى بە نيشانەكانى قيامەت دێت و تەمەنى زەوى و ئاسمان و گشت بوونەوەر كۆتايى پێ دێت و تەنها ئەوەندە دەمێنێت كە خواى باڵادەست فەرمان بكات فوو بكرێت بە (صور)دا و قيامەتى گەورە هەستێت، وەهەر كات ئەو فەرمانە خواييە دەرچوو، وە فوو كرا بە (صور)دا ئيتر چى زيندەوەر لەم بوونەوەرەدا هەيە دەست و برد گيانيان دەردەچێت و دەمرن، هەروەك (أبو هريرە) ڕەزاى خواى لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە كەفەرموويەتى: ﴿ولتقومن الساعة وقد نشر الرجلان ثوبهما بينهما فلا يتبايعانه ولا يطويانه ولتقومن الساعة وقد انصرف الرجل بلبن لقحته فلا يطعمه ولتقومن الساعة وهو يليط حوضه فلا يسقى فيه ولتقومن

[1] شرح النووي لمسلم (١٧/١٩٤-١٩٥).

الساعة وقد رفع أحدكم أكلته الى فيه فلا يطعمها﴾[1]، واته: (بەڕاستی قیامەت هەڵدەستێت، دووپیاو مامەڵەی پۆشاکێك دەکەن لە نێوانیاندا فریا ناکەون مامەڵەکە تەواوبکەن و بیپێچنەوە، بەڕاستی قیامەت هەڵدەستێت و کابرا شیری مانگاکەی بەدەستەوەیە فریاناکەوێت بیخواتەوە، وەبەڕاستی قیامەت هەڵدەستێت و ئەو خەریکی حەوزەکەیەتی سوراغی دەدات فریا ناکەوێت ئاوی لێ بدات، وە بەڕاستیی قیامەت هەڵدەستێت پاروە نانەکەی بەرز کردۆتەوە بۆ دەمی فریا ناکەوێت بیخوات).

بەڵێ لەگەڵ فووکردن بە (صور)دا هەرچی زیندەوەر و ڕۆح لەبەر هەیە نەك تەنها لەسەر زەوی دا بەڵکو لە هەموو بونەوەردا لە چاوتروکانێکدا دەگەڕێنەوە بۆ جیهانی مردوەکان، وە هەموو ئەورووداوانەی کە لە دوای فوو کردن بە (صور) دا دێن و ڕوو دەدەن دەکرێت لە ژێر ناوی خودی (قیامەت) خۆیدا باسیان لێ وە بکرێت، چونکە نیشانەکانی قیامەت لێەردا کۆتایی یان پێ دێت و فووکردن بە (صور)دا ماناى هەستانى قیامەتە.

بەم جۆرە ئەو بونەوەرەی کە دروست کراوی خوای کاربەجێیە چۆن سەرەتای هەبوو دەبێت کۆتاییشی هەبێت، مانەوەو هەتا هەتاییش تەنها بۆ خوای تاك و تەنهایە ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ (٢٦) وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾

## آخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين
## و صلى الله و سلم على محمد المبعوث رحمة للعالمين و على اله و أصحابه الى يوم الدين.

---

[1] رواه البخاري ومسلم وابن ماجه.

# پێــــرســـت